


سایە بۆ چاپ و بڵاوکردنەوە

# هەزاران

## دۆستۆیفسکی

ناوی کتێب: هەژاران

نوسینی: دۆستۆیفسکی

بابەت: رۆمان

وەرگێرانی: حەمە کەریم عارف

دیزاین: باسم رەسام

چاپخانەی: تاران

نۆرەی چاپ:چاپی چوارەم ٢٠١٥

تیراژ: ١٠٠٠ دانە

نرخ: ٧٠٠٠ هەزار

لە بەرێوبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتیەکان ژمارەی سپاردنی(١٤٥٢) سالی ٢٠١٥ پێدراوە.

بۆ دەسکەوتنی بڵاوکراوەکانی ناوەندی سایە بەناکو کۆ..

ناونیشان: سلێمانی - شەقامی پیرەمێرد - بەرامبەر اعلاناتی شێرکۆ

Emil: nawandy.saya@yahoo.com ٠٧٥١٢٤٦٠٥٨٢

حەمە کەریم عارف

پیاوێك لە بارانی وشەی بەردەوام!

**شێرکۆ بێکەس**

ئەو وەختەی بە عشقەوە ئەنووسیت وئەبیتە هاودەمی زمانی بەخشین وداهێنان. ئەو کاتەی هەموو ژیانت ئەدەیتە دەست قەڵەم وئەبیت بە پەروانەی دەوری وشە وچرای کتێب ورستەیەکی جوان. تۆ ئیتر لەوە دەرئەچی بە تەنها بۆ خۆت بژیت وتۆ ئیتر تەمەنت ئەبێ بە تەمەنی گەڵاوگوڵی خۆشەویستی وژیانت بە ژیانی میللەتێك وتێکەڵ بە ئایندە ئەبی ولەگەڵ باراندا ئەباریت ولەگەڵ هەتاودا هەتاو!

حەمەکەریم عارف

پیاوێك لە شەونخونی و

لە ڕێژنەی وشەو

خۆشنەردنەوەی قەڵەم و

پەنجەرەیەك بۆ خەمی کەسك و

گزنگی بەیان.

حەمەکەریم عارف

ژیێ یەك بۆ خۆشەویستی ئەبەدی

ئەدەب وچاری مرۆڤایەتی و

گۆرانیی هەمیشە پاراوی

گەرووی ژیان!

هەشتا ئەستێرەی کتێب لەو تەمەنەدا

هەشتا جۆگەی روون لەو دارستانەدا.

هەشتا فڕین لەو ئاسمانە زیوینەدا.

هەشتا ماچی منیش لەم نووسینەدا!

ئەمشەو بە تەنها خۆم لەسەر مێزەکەم

ئەم مۆمی رێزلێنانەم بۆ ئەو عاشقە داگیرسان!

بە تەنها خۆم وچەند دێڕە شیعرێکی جاویدان.

بە تەنها خۆم وپەپوولەیەکی غەمگین و

چەند کاغەزێکی سپی چاوەڕوان.

بە تەنها خۆم کەوتمە هەڵدانەوەی

لاپەڕەی چاو بەشەونمی ئەو مێرگەو

خوێندنەوەی هەناسەکانی ئەو گۆمەو

گێڕانەوەی حیکایەتی باڵندەیەکی

دەنگ زامدار!

بە تەنها خۆم،نە حەمەکەریم خۆی زانی و

نە رۆژنامەیەك ونە گۆڤارێك و

نە شەقامێکی کەرکوك ونە مەقامێکی

عەلی مەردان،تەنها هەر خۆم ومێزەکەم

کەسی تر نا.

کەرکوکییەك

پڕ پڕ لە کوردستان و

لێوانلێو لە جیهان!

کەرکوکییەك

هەموو دنیا دێنێتە ناو ئەم پەیڤەوەو

پەیڤیش ئەبێ بە گوڵی سان.

لە دنیاوە

چەندین دەریاچەی ڕۆمانی

ڕژانە ناو ئەم وڵاتی زمانەوە.

چەندین نزاری چیرۆکی

هێنایە ناو ئەم رووبەری زمانەوە.

چەندین ئاوێنەی دیرۆکی

بە دەوونماندا هەڵواسی.

کەرکوکییەك

باخی نووسی و

کێڵگەی نووسی و ڕانەوەستا!

کەرکوکییەك..

خۆرەتاری ناو جیهانی بۆ وەرگێڕاین

مانگە شەوی بۆ وەرگێڕاین

عەشقی گەورەی ئەفراندنی بۆ وەرگێڕاین

ڤـــــەلبێر کـــــامۆ. ئەلکســـــاندەر فەدایـــــەف. هــــیرب مبـدۆ. ڤـاسمۆف. کـازانتزاکیس. چـیخۆف. گرینتەردیشـنەر. فنسـنت ڤـان گۆگ. مالرۆ. شەکسپیر. م. گۆرکی. هۆمیرۆس. چرنیشفسکی. چایکۆفسکی. ئید گـار ئـالان پـۆ. جـاك لەنـدەن. گۆگـۆل. سـبرۆس پرهـام. بلیخـانۆف. کـریس کۆچـرا. مەهـدی حسـێن. سـایت رەحمـان. ئەحمـەد مـەحموود. سـەمەدی

بیهرەنگـــی.عـــەزیز شـــەریف.نەجـــەف قـــولی پســـیان. ئەشـــرەفی دیهقـانی.مەسـعود ئەحمـەدزادە.گەوهـەر مـراد.یـەڵماز گونـای..چـەندین وچەندین کەژو دەریاچەو دەشت و رووباری تریش...

لە سی وپێنجساڵیدا هەشتا چراوگی

بە ژوورەکانی ئەم زمانەدا هەڵواسی.

لە سی وپێنج ساڵیدا..هەشتا رێگای تازەی

لەم نەخشەیەدا کردەوە

هەشتا تۆوی گوڵی شەست پەڕ

هەشتا پەیژە،هەشتا شەبەنگ و

هەشتا تابلۆ

لەم زمانەدا...ئەم گەرووی چریکانە دەگمەنن.

لەم رەنگانەدا..ئەم تۆنی دەنگانە دەگمەنن.

لەم هەورانەدا..ئەم بارینانە دەگمەنن.

لەم دەغلانەدا..ئەم گوڵە گەنمانە دەگمەنن.

من ئەمشەو تەنیا هەر خۆم وچەند شیعرێ

ئەم چرای رێزلێنانە لە سەر مێزەکەم دادەگیرسێنم.

بۆ کەرکوکییەك کە سەر رێژە لە وشەو

کە لێوانلێوە لە خۆرەتاو..سلاو ئەی بارانە

جوانەکەی زمانی کوردی.سلاو ئەی

کەرکوکی خۆشەویست! سلاو!

سلەیمانی ٢٠٠٩/٧/١٥

ئەدەب وهونەر/ژمارە(٦٤٣)/پێنجشەممە/٢٠٠/٧/٢٣

## پێشەکی

حەمەکەریم عارف

"١"

**دۆستۆفسکی** (١٨٢١-١٨٨١)بە بۆچوونی رەخنەگران و مێژوونووسانی ئەدەب،یەکێکە لە رۆماننووسە هەرە مەزنەکانی روسیای سەدەی نۆزدەیەم وزۆربەی بەرهەمەکانی تا رۆژگاری ئەمرۆش هەر بە تازەیی ماونەتەوەو پیر نەبوون.

واتە بەرهەمی **دۆستۆفسکی** بەشێکە لە کەلەپوری ئەدەبیاتی جیهانی وبۆ سەر زۆربەی زمانە زندووەکان پاچڤەکراون،وئەگەرچی کورد زۆر بە درەنگەوە ئاوڕیان لەم کەڵە نووسەرە داوەتەوە، بەڵام لەو ساڵانەی دواییدا هەندێ لە شاکارەکانی کراون بە کوردی کە جێگەی قەدرزانی ودەستخۆشییە. بەندەش وا لێرەدا یەکەمین نۆبەرەی رۆمانەکانی **دۆستۆفسکیم**،کورتە رۆمانی (هەژاران- ١٨٤٥)دەکەم بە دیاریی دەست وپێشکەش بە کتێبخانەی هەژاری کوردی دەکەم ولەوەش دڵنیام کە دیاری دەستی شوانە،ودیاری شوانیش یا شنگە یا ئاڵەکۆک.

دۆستۆفسکی ئەم رۆمانەی لە تەمەنی بیست وچوار بیست وپێنج ساڵیدا نووسیوەو شۆرەت و نێوبانگێکی خێرای پێدەرکردووەوە نیشانەیەکی یەجگار گەورەی بەهرەو سەلیقەی ئەدەبی ئەو هاتووەتە ژماردن..هەر لە هەمان ساڵدا رۆمانۆکی (سێبەر)شی بڵاوکردووەتەوە،ولەوێدا یەکێك لەو تیمەو نێوەرۆکانەی خستووەتە روو کە پاشان لە شاکارانی:(تاوان وسزا،

برایـــانی کارامـــازۆف)دا هونەریانـــەتر مامەڵـــەی لەتەکـــدا کردووە،واتـــە مەســـەلەی کێشـــەو هەڤـــدژی نێـــوان خێروشـــەڕی هونەرانـــدووە، کـــە ئـــەم بیرۆکەیـــە بـــاڵی بەســـە دۆسۆفســـکیدا کێشـــاوەو بـــووە بـــە تـــان وپـــۆ وکـــری (نسـیج) دەروونـــی و رۆحـــی قارەمانـــانی رۆمانـــەکانی.واتـــە دۆستۆفســـکی بـــاوەڕی تـــەواوی بـــەوە بـــوو کـــە مـــرۆڤ پێویســـتی بـــە پەشـــیمانی وتۆبـــەو گەڕانەوەیە،وقەناعەتی وابوو کە ئازاروعەزاب وکول وکۆڤان مایەی ڕزگـاری وئاسـوودەییە.ویـەلای زۆربـەی ڕەخنـەگران وباسـکارانەوە ئـەم بیرۆکەیـە بەسەر نووسـینەکانی **دۆتۆفسکی** و قارەمانـان وکاراکتـەرانی رۆمانـەکانیا زاڵەو بەمەش رەنگی چەمکی ئاینی رۆمانەکانی خۆی ڕشتووە.ئـەوەی لـە بەرهەمـەکانی ئـەم کەڵـە ئەدیبـەدا دەردەکـەوێ، بـە تایبـەتی لـە ڕۆمـانی (تاوان و سزا)دا ئەوەیە کە زۆر کارامە ولێهاتووانە وێنەی ژیانی دەروونـی تاوانبـاری گرتووە،جـەختێکی فـرەی لەســەر بەرجەســتەکردنی لایەنــە سایکۆلۆژیەکانی تاوان و تاوانبـاری کردووەتەوە،لایەنـە هەڤـدژەکانی نـاخ وخـودی مرۆڤـی، بـە جـۆرێ هونەراندووە،کـە شـارەزایی لـە مەسـەلە ســـایکۆلۆژیەکان مەرجـــە بـــۆ تێگەیشـــتنی کـــارە ئەدەبیـــەکانی دۆستۆفسکی.ولەم ڕووەوە زۆر کـەس ئـەم کەڵـە نووسـەرە لـە ڕیـزی زانـا گەورەکانی دەروونناسی دادەنەن.بۆیە **دۆستۆفســکی** تـەنیا بـە خـەڵکی سەدەی نۆزدەیەم نایەتـە ژمـاردن، بـەڵکو بـە زەبـری کـارە ئەدەبیـەکانی سنووری جوگرافیاو مێژوو،ئاقاری شوێنکاتی بەزاندووەو لەمڕۆشدا دەژی.

دۆستۆفسکی لە سەرەتای لاویدا پەیوەندی دەگەڵ کۆمەڵێك شۆڕشگێڕی سیاســی،خودان بیروبـاوەڕو کەڵکەڵـــەو خولیـای خیـاڵاوی تۆبـاوی دا پەیداکرد،کـە دەسـەلاتی تـزاری پێـی زانـین، گرتنـی.دۆستۆفسـکی درابـە

دادگــاو حــوكمی خەنەقانــدن درا،پاشــان بەخشــینی تــزاری بــۆ دەرچوو،ڕەوانەی تاراوگـەی سـیبریا کـرا،پێنج دانـە سـاڵی بـەدەم کـاری قورسەوە لەوێندەر قەتاند.لە ساڵی ١٨٥٩دا عـەفوكرا..بـەڵام ئـەو گیانی یاخیگەرییەی کـە تیـای بوو،هەرچـەندە لـە ژیانی ڕۆژانەیدا هەندێ کـەم بـووەوە، وەکـو شـەقڵ ومـۆرکی کاراکتـەرو قارەمانـانی ڕۆمانـەکانی هـەر مایـەوە، بۆیـە بـۆ خوێندنـەوەو تێگەییشـتنی مـەودای بەرهەمـەکانی ،ڕەچاوکردنی ئەم شەقڵی یاخیگەرییە پێویستە..

بەهـەرحاڵ ئـەم کەڵـە ڕۆماننووسـە مینـاکی نقومـوانێکی یـەجگار لەزەبر،خۆی بە قوڵایی ناخ ودەروونی بەشـەردا کـردووەو هـەموو نـاکۆکی وهەڵدژییەکانی ناخ و دەروونـی بەشـەری کەشـف کـردووەو دۆزیوەتـەوە. ئەوەتا نیتشە لە شوێنێکدا دەڵێـت:"**دۆستۆفسکی** تاقـە دەروونناسـە کـە شتێکی لێوە فێـر بـووم."یـان سـتیڤان تسـفایغ، ڕۆماننووسـی نەمسـاوی دەڵێـت: "دۆستۆفسـکی یەکـەم کەسـە بیرۆکەیـەکی لەمـەڕ ئـەو خەڵکانـە دابینـێ کـە ئێمـەین.."یـانی یەکـەم کەسـە هەوڵیـداوە خۆمـان بـە خۆمـان بناسێنێت..

***

هەڵبەتـە پرۆسـەی وەرگێـڕان، زیـاتر بایـەخ بـەو شـاکارانە دەدات کـە بەشـێکی هـەرە گرینگـی کەلـەپوری مرۆڤـانی پێکدەهێنن ویـە درێـژایی ڕۆژگار هەر تەڕوتازەن و ئاقارو کەوشەنی جوگرافیاو مێژوو دەبەزێنن ویـە ئاسانی پـیر نـابن و دەبـن بـە کەلـەپوری هـەموو سـەردەمەکان،وهەڵبەتە پێتڤیـە ئـەو شـاکارانە بەویـەڕی ئەمانەتـداری ووردی،بـەزمانێکی ڕوون ڕەوان، بەوپەڕی فەساحەت و بەلاغەتـەوە بێتـە وەرگێڕان،وانـە دەکرێـت

لە زمانە ئەسڵەکەوە پاچڤە بکرێت،پاچڤەیەکی ئەوتۆ کە بە تەواوی هاوتای دەقە ئەسڵییەکە بکاتەوەو لە کۆڕی ئەدەبیاتدا قامکانی بۆ ڕابکێشرێت وپشتی پێ ببەسترێت و پێویست بەوە نەکات کەسانی دی کاتی خۆ بە فیڕۆ بدەن و جارێکی دیکە پاچڤەی بکەنەوە،مەگەر ڕەوت وگۆڕان و رادەی پەرەسەندنی زمانی سەردەم ئەمە بخوازێت.

"٢"

**دۆستۆفسکی** بە یەکێك لە پێشەنگەکانی رۆمانی کلاسیکی روسی دەژمێردرێت. هەڵبەتە گومان لەوەدا نییە کە کاریگەریی ئەزموونی رۆمانەوانی و رۆماننوسی پوشکین و گۆگۆل بەسەرەوە بووە، هەروەها گەلێك لە باسکارانی ئەدەبی ئاماژەیان بۆ کاریگەریی رۆمانەکانی بالزاك و جۆرج ساند وڤیکتۆرهۆگۆ ودیکنز بەسەر رۆمانەکانی دۆستۆفسکییەوە کردووە.

**دۆستۆفسکی** لە چلەکانی سەدەی نۆزدەیەمەوە هاتووەتە مەیدانی ئەدەبیەوەو هەر لە یەکەم رۆمانیەوە (هەژاران– ١٨٤٥)هەوڵیداوە لە رێبازی گۆگۆل مامۆستای دوور بکەوێتەوەو پەیڕەوی میتۆدێکی تازەی هونەری بکات، بۆیە زیاتر باری دەروونی وسایکۆلۆجی قارەمانەکانی بەهەند وەرگرتووەو ویستویەتی لەو رێگەیەوە وێنەیەکی هونەریی واقیع و ژیانی باوی وەخت پیشان بدات..

**دۆستۆفسکی** لە سالی ١٨٤٤دا،وەکو ئەفسەرێکی ئەندازیار،سەرباری ئەوەی تەرزێکی زۆری بەسەرەوە بوو، دەستی لە کاری فەرمی حکومەتی کێشایەوە. لەو دەمەدا تووشی دەبێت بە تووشی گریگۆریۆڤیچی کۆنە برادەریەوە، کە وەکو نووسەرێکی ریالیستی سەرکەوتوو، ژیانی ئەدەبی

خۆی دەست پێکردبوو. جووتە هاوڕێ بە شەریکی خانوویەکیان بەکرێ گرت، **دۆستۆفسکی** لەو ماڵەدا دەستی دایە نووسینی یەکەمین ڕۆمانی خۆی (**هەژاران**).هەڵبەتە بێ ئەوەی بیڵێ هاوڕێکەی پێبزانێت.

شەو وڕۆژ،بەوپەڕی جۆش وخرۆشەوە کاری لەو بەرهەمەدا دەکرد،تا لە ئێوارەیەکی مانگی ئایاری ساڵی ١٨٤٥دا تەواوی دەکات.هەنگێ هاوڕێکەی گازکردو لە نهێنییەکەی خۆیی ئاگادار کرد،وکەوتە خوێندنەوەی ڕۆمانەکە بۆی.دۆستۆفسکی بە نەشئەیەکی ترسامێزەوە بۆی دەخوێندەوەو ئەویش(گریگۆریۆفیچ)بە دڵ و بەوپەڕی دڵبەندی و سەرسامی گوێی دەگرت،تا درەنگانێکی شەو ئەوجا لە خوێندنەوەی بوونەوە، گریگۆریۆفیچ دەستنووسەکەی لێسەندو بۆ سبەینێ بۆ نیکراسۆفی شاعیری نیشتمانپەروەری برد،گریگۆریۆفیچ بە درێژایی شەو ڕۆمانەکەی بۆ خوێندەوە، کە جووتە ئەدیب نزیکەی سەعات چواری بەرەبەیان لە خوێندنەوەی بوونەوە، لە خۆشیاندا خۆیان پێنەگیراو بەو تارەختە چوون لە دەرگای ماڵەکەی دۆستفسکییان داو لە خەویان هەستاند تا پیرۆزبایی لێبکەن.

دیارە ئەو ساتە جوانترین ساتی ژیانی دۆستۆفسکی بوو،وهەرگیز ئەو ساتە خۆشەی لە بیر نەچووەوە.دوای سێ ڕۆژان دۆستۆفسکی چوو بۆ لای ڕەخنەگری بە نێوبانگ بیلینسکی،کە دەستنووسی ڕۆمانی گۆرینی لە نیکراسۆف وەرگرتبوو،هەرکە بلینیسکی ئەم نووسەرە لاوەی بینی، بە گەرمی پێی گوت:

"کوڕۆ تۆ دەزانی چیت کردووە؟!"هەڵبەتە بلینسکی ئەم ڕۆمانەی بە یەکەمین هەوڵی نووسینی ڕۆمانی کۆمەڵایەتی دەزانی،کە تەنیا خەڵکی

هونەرمەند، هونەرمەندی ڕەسەن و بەهرەمەند باری دەبەن و دەرەقەتی دێن..ئەم ڕۆمانە (هەژاران) کە بووە مایەی شۆرەت و نێوبانگی دۆستۆفسکی و بەمە ناوی کەوتە سەرزاران،لەسەر بناغەی نامەکارییەك ڕۆنراوە کە لە بەینی کارمەندێکی بەتەمەنی حکومەت و کیژۆڵەیەکدا ڕوو دەدا کە لە ژوورێکی بەرانبەر ژوورەکەی ئەودا کرێچیە.یانی چیرۆکی کارمەندێکی ئیستنساخچی هەژاری بە ساڵاچووە کە نائومێدانە لە هەوڵ و تەقەلای بەدەست هێنانی حەیاو حورمەتێکدایەو ئەشقی ڕاستەقینەی خۆی سەبارەت بە کیژۆڵەیەکی هەتیوی هەژاری بێنەوا، لە ژێر پەردەی مەحەبەت و خۆشەویستی باوکانەدا دەشارێتەوە..کابرای کارمەند هەموو کاتی خۆی لە ژوورە چکۆلەکەی خۆیدا بە نووسینەوەی بەڵگەنامانی ئیداری بەسەر دەبات. لە میانەی ئەم نامەکارییەوە، خوێنەر لە ژیانی ئەم دوو کەسە ئاگادار دەبێت، لە ژیانی رابردوو ئیستایان کە پڕن لە ڕووداوو وبۆیەرێن بێ ماناوتوڕەهات ونووسەر زۆر ئاسایی وسادە دەری بریون وگوزارشتی لێکردوون..ڕاستە کۆمەڵێك خاڵی وەك هەژاری و داماوی و بێنەوایی وهەستێن هاوبەش کۆی کردوونەتەوە بەڵام سەرەنجام هیچ بەختەوەری و شادییەکی لێناکەوێتەوەو بۆ یەکتر دۆزەخن..

**دۆستۆفسکی** گەلەك ڕۆمان و چیرۆکی لە پاش بەجێماوە لەوانە: (هەژاران-١٨٤٥،بێزراوان-١٨٦١،تاوان وسزا-١٨٦٦،گێلە-١٨٦٩،ئەهریمەنان-١٨٧٢،هەرزەکان-١٨٧٥،برایانی کارامازۆف-١٨٨٠)

ژیانی هەژارانی شارنشین،لە کارە ڕۆمانەوانیەکانی دۆستۆفسکیدا یەجگار زاڵە و ئەم تیمەیە بووە بە نێوەرۆك و مایەو ماك وهەوێنی ژمارەیەکی زۆر لە ڕۆمانەکانی کە یەکێکیان ئەم ڕۆمانەیە (هەژاران)جا دۆستۆفسکی

نەهاتووە تەنیا ئەو تابلۆو دیمەن و وێنانەمان پێشکەش بکات کە هـەژاری وناکۆکیـە کۆمەڵایەتیـەکانی کۆمەڵگـەی هـەژار پیشـان دەدەن،بـەڵکو بایـەخێکی پـتری بـە وێنـەگرتنی جیهـانی ڕۆحـی ودەروونـی وئـەخلاقی هەژاران داوە کـە هەڵبەنـدو هاوپەیوەنـدی بـوونی مادیانـە. واتـە گرفـت و کێشەی کۆمەڵایەتی هەژاری لە ڕۆمانـەکانی دۆستۆفسـکی دا، لـە میانـەی کێشە ئەخلاقی و سـایکۆلۆژیەکانەوە بەرجەسـتە دەبێـت. دیـارە جیهـانی نـاوەوەی هـەژارانی دۆستۆفسـکی، جیهـانێکی یـەجگار ئـاڵۆزو سـخ و دژوارە،کۆکەرەوەی هەڵدژەکانە..بەکورتی دۆستۆفسکی جۆرە ڕۆمـانێکی تازەی داهێنا، کـە پاشـان نێـوی ڕۆمـانی تراجیـدی لێنرا،ئەمـە زێـدەباری ئـەوەی کـە یـەکێك بـوو لـە پێشـەنگانی ڕۆمـانی سـایکۆلۆژی وڕۆمـانی فرەدەنگ،ودۆستۆفسکی لە کارەکانیا کۆمەڵێك خەسڵەتی هزری وهونەری خـۆی هەبوو،کـەزیاتر لــە هــەردوو ڕۆمــانی (تــاوان وســزا)و(برایــانی کارامازۆف)دا بەرجەستەو دیارن.

"٣"

فیۆدۆر میخائیلۆفیچ،**دۆستۆفسکی**(١٨٢١–١٨٨٠)ڕۆماننووسێکی مـەزنی ڕوسـیە، لـە مۆسـکۆ لـە نەخۆشـخانەیەکدا کـە بـابی لەوێنـدەر پزیشـکی دەکرد،لە دایکبووە.هەرکە چاوی بەدنیادا هەڵهێنا ڕووبە ڕووی ژینگەیەکی ناخۆشی،پڕ لە بۆنی داودەرمان و هەژاری بووەوە.بابی، کابرایەکی توندە تەبیعەتی،بەدمەجێزی،خۆپەرسـتی،ڕژدی پیسـکەو پرلـەکی بـوو.هێنـدە تـوڕەونڕۆ بـوو کـە بەشـەق و زللـەو دەمرێـژی جنێـوان مـاڵ ومنداڵەکـەی بەرێوە دەبرد. فیۆدۆر کە منداڵێکی هەستیارو ترپە بوو، زۆری ڕق لە بابی بوو،وتەنانەت لـە خەریشـدا لـە هاتوهـاواری بـابی دەترسـا،بۆیە لـە نـاخی

دڵەوە ئـارەزووی مردنـی بابـە سـتەمکارەکەی دەکرد،بـەڵام دایکـی کـە ئافرەتێکی میهرەبان ونەرم ونیان بوو،زوو مردو فیۆدۆر بە تەنیا مایەوە.

فیـۆدۆر پـاش مردنـی دایکی،لـە لایـەن بابیـەوە کـە لـە نائومێدیـدا پـەنای وەبـەر مەشـروبات بردبـوو و توانـای سەرپـەرشـتی منداڵەکـەی نـەبوو،بۆ قوتابخانـەی ئەنـدازەی سـوپایی سانپترسـبۆرگ نێـردرا، لەوێنـدەر، لـە ژینگەی وشك و ناخۆشـی فێرگەدا،کـە سیسـتەمێکی سـوپایی بەسـەرا زاڵ بوو، دەرفەتی قۆزتەوەو کەوتە خوێندنەوەی کتێبانی دڵخوازی خـۆی، بـە دزییـەوە کتێبـانی روسـی وفەرەنسـی دەخوێنـدەوەو زەوق وسـەلیقەو بەهرەی نووسەریی خۆی پەروەردە کرد.

لە تەمەنی هەژدە ساڵیدا، کەبیستی بـابی بـە دەسـتی مسـکێن و کۆیلـە باخیەکانی خۆی کوژراوە، تووشی شۆك بـوو،وزۆر پەشـیمان بـوو لـەوەی کە هەمیشە مەرگی بابی بـە ئـاوات خواسـتبوو.لـەو سـاڵەدا بـۆ یەکـەمجار نەخۆشی فێی لێدەرکەوت.دوای تەواوکردنی خوێندن لە بەشی ئەنـدازەدا، لەیـەکێك لـە دایەرەکانـدا دامەزرا،لـە سانپترسـبۆرگدا مـاڵێکی پـەرپوتی بـەکرێ گرت،وئیـدی بـە دەسـتکورتی و شـەرمەزاری درێـژەی بـە ژیـان دا.زۆری پێنەچوو لە کاری ئیداری وەڕەز بوو،و دەستی لـە کارکێشـایەوە تا هەموو کاتی خۆی بۆ ئەدەبیات تەرخان بکات.سـەرەتا بـۆ دابینکردنـی بژێوی و ژیـانی خـۆ کەوتـە کـاری پاچـڤە و (ئوجینیـە گرانـدە)ی بـالزاك و (دون کارلۆس) شیلەری وەرگێڕا.لە ساڵی ١٨٤٥-١٨٤٦ یەکەمین رۆمـانی خـۆی (هـەژاران)ی نووسـی ودای بـە نیکراسـۆفی شـاعیر کـە لـە گۆڤـارو رۆژنامەدا بۆی بلاو بکاتەوە..دوای دوو رۆژ،لە سەعات چاری بەرەبەیانـدا، کە تازە بـۆ مـاڵ گـەڕابووەوەو چووبووە نـاو جێگـە، زەنگـی دەرگاکـەی

لێدرا،کە دەرگای کردەوە نیکراسۆفی لەبەر دەرگا بینی، لەپڕ باوەشی پێدا کردو هاواری کرد:"زۆر عالە!"و بەڵێنی دایە کە پیشانی بیلینسکی رەخنەگری سەختگیری بەناوبانگی بدات.بیلینسکی–ش هەمان بۆچوونی نیکراسۆفی دووپات کردەوەو بە دۆستۆفسکی گوت:"لاوۆ!تۆ دەزانی چیت نووسیوە؟"

**دۆستۆفسکی** کە ناوی خۆی بیستەوەو لەسەرکەوتنی خۆی دڵنیا بوو، ئیدی بە پەلە پەل چەندین چیرۆکی بلاوکردەوە کە سەرکەوتنێکی ئەوتۆیان بە دەست نەهێناو رەخنەگران، بە لاسایی کەرەوەی(گۆگۆل)یان ناوبرد و تەنانەت بیلینسکی–ش لە بۆچوونەکەی خۆی نیمچە پەشیمانێك بووەوە.. دۆستۆفسکی لە داخی شکستە پەیتا پەیتاکانی خۆی پەیوەندی بە گرۆپێکی لاوانی شۆڕشگێری ئازادەوە کرد،کە یەکێك لە ئامانج و مەرامەکانیان، هەڵوەشاندنەوەی یاسای کۆیلایەتی بوو،ولە کۆڕو کۆبوونەوەو گەنگەشەو موحازەرەکانیاندا بەشداری کرد. لە ١٨٤٩/٤/٢٢دا،کە لە کۆبوونەوەیەکی دوورو درێژو تاقەتبەری ئەنجومەنی گروپی نێوبراو،بۆ ماڵ گەڕابووەوە،لە زەنگی دەرگاکەی دەدرێت،بەلام ئەمجارەیان لە جیاتی نیکراسۆف،پۆلیسی لەبەردەرگادا بینی کە بە تاوانی بەشداری لە چالاکیەن دژەتزاری گرتیان ولە زیندانیان پەستاوت.دیارە کە دۆستۆفسکی کە خۆی بە تاوانبار نەدەزانی و هەرگیز وێنای نەدەکرد،بەشداری لە گەنگەشە وباسی سیاسیدا،وەکو تاوانێك ئەو دەگەیەنێتە پای مێزی دادگایی،هەموو کاتێ بەتەمای ئازادبوون بوو تا لە ٢٢/دیسامبەردا کە لە سەعات شەشی بەیانیدا دەگەڵ هەندێ ئەندامانی دیکەی گروپی شۆڕشگێری ناڤبریدا، لە

لایەن پاسەوانانی دڵرەقەوە بەرەو مەیدانی بەفرو بەستەڵەك گرتوو برا،بۆ ئەو شوێنە برا كە خەڵكێكی فرە چاوەڕوانی هاتنی ئەوان بوون.
دادسێن قرێری دادگای،كە قەراری ئیعدام بوو، بۆ خوێندنەوە،دەستەی یەكەم تیرباران كران، كە نۆرە هاتە سەر گرۆپی دووەم،كە دۆستۆفسكی یەكێك بوو لەوان، ئاجودانێك لە دوورەوە دەستەسرێكی سپی هەڵكردو جێبەجێكردنی حوكمی ئیعدامەكەی راگرت.بەمجۆرە حوكمی ئیعدامەكەی كرا بە چوارساڵ زیندانی لەگەڵ كاری قورس لە تاراوگەی سیبریا..ئەنجام لە ٢٤/دیسامبەرولە شەوی لەدایكبوونی مەسیحدا، پێ بەكۆت وزنجیر، بۆ تاراوگە رەوانە كرا،لە زیندانی سیبریادا، دەگەڵ دزو بكوژو پیاوخراپاندا، لە ژوورێكی پیس و قێزەوندا جێگیر بوو.وەكو ئەوان جلكی یەكشێوەی زیندانی لەبەركرد‌و بوو بە هاوسفرەیان و ملی بۆ كاری ئیجباری تاقەتپڕوكێن دا..
**دۆستۆفسكی** كە هەر لە منداڵیەوە كەسێكی لەشبەبارو دەغەزار بوو، لە زینداندا فێی لێدەهات و دەكەوت، بەلام هەموو ئەم دەردو رەنج ونەخۆشی و مەینەتیانە،بۆ ئەو بە ئەزموونێكی دەوڵەمەند دەژمێردرا.لە زیندانی سیبریادا لە نزیكەوە میللەتی روسی ناسی و زیاتر خوای ناسی،چونكە ئینجیل تاقە كتێب بوو كە لە زینداندا قەدەغە نەبوو ورێگە دەدرا بخوێنرێتەوە.
پاش ئەوەی ماوەی مەحكومیەتەكەی تەواو كرد،بە گوێرەی قەراری دادگای بالا چەند ساڵێكیش وەكو سەرباز لە سیبریادا خزمەتی كرد،ولە تەنیایی و بێ پەناییدا تووشی بێوەژنێكی دەغەزاری سیلاوی بوو بە ناری ماریا دیمتریوڤنا كە لە مێردی یەكەمی منداڵێكی هەبوو و هیچ

دەرامەتێکی نەبوو.دۆستۆفسکی بێئەوەی هیچ سۆزێکی ئەشق و ڤیانی لە دڵدا بێت، لە رووی بەزەییەوە بێوەژنی گۆرینی خواست.پاش مردنی نیکۆلای یەکەم دۆستۆفسکی چەندین جار داوای بەخشینی لە ئەلکساندەری دووەمی جێنشینی نیکۆلای یەکەم کرد.ئەوەبوو ئەنجام لە ساڵی ١٨٥٩دا بەخشراو رێگەدرا کە لەگەڵ هاوسەرەکەیدا بۆ سانپترسبۆرگ بزڤرێتەوە.

دە دانە ساڵ بوو لەم شارە دوور کەوتبووەوە، ناوی بە تەواوەتی لەبیرکرابوو،سەرلەنوێ تێهەڵچووەوە. تا ماوەیەك نووسینەکانی بە ساردی پێشوازی دەکران.بەڵام کە لە ساڵی ١٨٦١دا(یادگارەکانی خانەی مردوان)ی بڵاوکردەوە، ناو وشۆرەتەکەی جارانی بە زیادەوە پەیداکردەوە. ئەم رۆمانە کە بە ڕاناوی یەکەم کەسی تاك دەگێڕدرێتەوە، زیاتر گێڕانەوەی ژیان وبەسەرهاتی نووسەرو ئەو دیمەن و بویەرانەیە کە لە زینداندا دیتوونی، ئەو واقیعە تاڵ و مەینەتبارانەی لە رێگەی ئەم بەرهەمەوە بەرجەستەکرابوو،خەڵکی روسیای بە جارێ هەژاندوهاڕوژاند وهێنایە گریان و تەنانەت تزاریشی هێنایە گریان.

ئەم بەرهەمە لە رووی شێوازوتەکنیکی ئەدەبییەوە،فۆرم و قاڵبێکی تایبەتی هەیە،بریتیە لە کۆمەڵێك چیرۆکی جیاواز کە بەیەك داوە دەزوو هۆنراونەتەوەو لە قاڵبی رۆمانێکی نایابدا بەرجەستەکراوە.(یادگارەکانی خانەی مردوان) لە پاش(هەژاران)وەرچەرخانێکی گەورەی لە ژیانی نووسەرایەتی دۆستۆفسکی چێکرد،ونوقڵانەو مژدەی شاکارەکانی ئایندەی ئەوی بۆ خوێنەران پێ بوو.

ئــەوەبوو لــە ســاڵی ١٨٦٤دا چــیرۆکی (یاداشــتە نهێنییــەکان)ی بڵاوکردەوە.ئەم بەرهەمە لە ژیـانی نووسـەردا سـەرکەوتنێکی ئـەوتۆی بـە دەست نەهێنا.بەلاّم لە سەدەی بیستەمدا،رەخنەگران لـە خانـەی شـاکارە ئەدەبییەکانی نووسـەریان دانـا.کاراکتـەرانی ئـەم چـیرۆکە لـەو کارمەنـدە دەوڵەتیانەن کە لە ژێرباری ستەمی حکومەتی نیکۆلای یەکەمدا دەناڵێنن.
**دۆستۆفسکی** لەم بەرهەمەدا نـەهاتووە وێنـەی داب ونـەریت وخووخـدەی کۆمەڵگە بگرێت و وەکو چیخۆف پیشـانگایەکی سـیما جۆراوجۆرەکـانیش ناخاتە بەرچاو، بـەڵکو قارەمانـانی چـیرۆکەکە هـەر یەکـەیان، بـە جۆرێـك گۆشەیەك لە کەسایەتی نووسەر نیشان دەدەن وهەندێ چرەسـاتی ژیـانی دەروونی وسایکۆلۆژی ئەو دەنوێنن و ئاشکرا دەکەن..لەم قۆناغەدا چـەند رووداوو کارەسـاتێکی نـاخۆش ژیـانی دۆستۆفسـکیان تاڵکرد،هــەوەڵجار ژنەکــەی و پاشــان بــرا ئازیزەکـەی،میخائیل،مردن و ئــەویش پیاوانــەو مەردانە مەسئولیەتی قەرزەکانی میخائیلی گرتـە ئەسـتۆی خـۆی..قـەرزی لەم دەکرد تا قەرزی ئەویتری پێبداتەوە.بەجۆرێ خـووی دابـووە نووسـین و سەری کردبووە نووسین، کە چیوای نـەمابوو بمرێـت.وێـڕای ئەوەش،لـە هــەرەتی رەشــبینی و نائومێدیــدا، بەوپــەڕی ورەبــەرزی مامــەڵی دەگــەڵ نەگبەتی و مەینەتیەکانی خۆیدا دەکردو بە ئەزموونێکی پێویستی دەزانـی بۆ کاری نووسین و نووسەرایەتی.
**دۆستۆفســکی** لـە تەمــەنی چـل وشـەش سـاڵیدا کیـژێکی بیسـت و یـەك ساڵەی خواست کە سکرتێرو خێرانووسی بەرهەمەکانی خۆی بوو.لە سـاڵی ١٨٦٥دا رۆمانی(تاوان وسزا)ی بڵاوکردەوە.ئەم کارە بـە یەکـەم بەرهـەمی گـەورەی دۆسـتۆفسـکی دەژمێردرێـت ونـەك هـەر لـە روسـیادا،بەڵکو لـە

هەندەرانیشـدا شـۆرەت و نێوبـانگێکی فـرەی پەیـداکردو دۆستۆفسـکی گەیانـدە ریـزی پێشـەوەی رۆماننووسـانی دنیـاو تـا ئـەمرۆش یەکێکە لـە رۆمانە بە نێوبانگ و فرەخوێنەرەکان.قارەمانی رۆمانەکە لەبەر هـەژاری و دەستکورتی ناچارە زانکۆ تەرك بکات.لەبەر نەداری و دەسکورتی و بـە گـوێرەی تیۆریـە کۆمەلأیەتیـەکانی خـۆی دەسـت دەداتـە کوشـتنی پیرەژنێکـی سـوورتخۆرو بـە رێکـەوت خوشـکی پیرەژنـی نـاڤبریش دەکوژێت.رۆمانەکە لەسەر بنەمای کۆمەڵە فاکتەرێکی جۆراوجۆر رۆنـراوە، کە مایەو سەرچاوەی تاوانن.ئەم گەنجە(قارەمـانی رۆمانەکـە)دوو خولیـاو کەڵکەڵە بە بەردەوامی هانی دەدەن،یەکەم دەتوانێ بە پـارەی پیرەژنـە سوورتخۆرەکە، کە لە راسـتیدا لـەو خەڵکـە مەینـەتیارو کڵۆلأنـە دزراوە کـە ناچار بـوون قـەرزی لێوەربگرن،کـارێکی بـاش بکرێـت و دووەم دەتـوانێ بەم پارەیـە بـەهرەو توانـا ناوازەکـان کـە دەکەونـە سـەرووی هـەر جـۆرە پەیمان و قەراردانێکی کۆمەلأیەتیەوە،بخرێتە گەڕو سەرسکەی خۆی.

(تاوان وسزا) رۆمانی وێرانی ونابووتی ژیانە،بەلأم لە نـاوەوە، لەوشـوێنەدا کە وادێتە بەرچاو هەموو ترووسکەیەکی ئومێد ونومێـدەواری کوژاوەتـەوە، لەپڕو سەر لە نوێ ترووسـکەیەکی ئومێـد هەڵـدەبێت و ئـەو بەشـەرەی کـە بووە بە حەیوان، دەگەڕێنێتەوە سەر تەبع و تەبیعەتـە فریشـتە ئاسـاکەی جـارانی خـۆی. لـە سـاڵی ١٨٦٦دا رۆمـانی (قوماریـان)ی بلأوکـردەوە. نووسەر لەم بەرهەمەدا ئەزموونی تاڵی خـۆی لـە یـەکێك لـە نشـیمەنەکانی هەتـدەران وکەڵکەڵـەو خولیـای قومـاری خـۆی دەهوونـەرێنێ و نیشـان دەدات.پرۆکرفیف،لـەم رۆمانـەوە ئۆپێرایـەکی بـە هـەمان ناونیشـان ئامادەکردووە. فرۆشی ئەم رۆمانانە زۆر بـاش بوو،بـەلأم بەشـی دانـەوەی

هەموو قەرزەکانی نەدەکرد.ئیدی دۆستۆفسکی لە ئەنجامدا لە ترسی خودان قەرزان ناچار بوو دەگەڵ ژنەکەیدا لە روسیا هەڵبێت، لەم شار دەچوون بۆ ئەو شار، لە ئاڵمانەوە بۆ جنێف،ولە جنێفەوە بۆ فلۆرانس..ئیدی ژووری هەرزان بابیان بەکرێ دەگرت، خواردنی هەرزان وکەمیان دەخوارد.

قەرزو سفتەو سلفەیان وەردەگرت،خشڵە هەرزان بەهاو تەنانەت جلەکانیشیان بە بارمتە دادەنا.هەرکە لە لایەن وەشانکارێکەوە پارەیەکی دەگەییە دەست،قەناعەتی بە ژنەکەی دەکرد وپەنای وەبەر قومار دەبرد.ئەم گەمەیە لە نۆرین و روانگەی دۆستۆفسکییەوە دواکار بوو بۆ وەدەستهێنانی ئازادی و رزگاری لە خودی خۆی.هەموو شتێکی دۆستۆفسکی لە سکەی خۆی دەرچووبوو،شیرازەی پچرابوو، لە گرێژەنە دەرچوو بوو، کە نائومێدییەکانی،سۆز،شادی،لاوازی، رکونی و سەرکەوتنەکانی و هەرچییەکی هەبوو دەیدۆڕاند،دەکەوتە نووسین،لەبەر رۆشنایی شەماڵکان بەرپەڕانی رەش دەکردەوە تا درێژە بە ژیانی پەرپووتیان بدات.

یەکەمین منداڵیان دوای چەند رۆژێك لە لەایکبوونی مرد،ئەمە هێندەی دی **دۆستۆفسکی** خەمبارکردو کاتێ کە منداڵی دووەمیان بوو، مەسرەفیان زیادی کردو ئەو وەکو جاران خۆی بە نووسین دەسپارد.

لە ساڵی ١٨٦٨دا رۆمانی(ئەبلە-گێلەپیاو)ی نووسی:شازادەیەك، کە دوا پاشمارەی مڵباتێکی گرینگی لە نێوچووە،لە سەفەری سویسرا کە ماوەیەکی زۆر بەهۆی نەخۆشی دەروونییەوە لەوێندەر ئاکنجی بووە،بۆ وڵات دەگەڕێتەوە. ئەم شازادەیە تووشی خەمۆکی دروونی بووەو لە

راستیا دووچاری جۆرە کەودەنی وگێلۆکیەك بووەو توانای هەر ویست و بڕیارێکی لەبەر بڕیوەو متمانەیەکی بێ سنووری دەرهەق بە خەڵکی لەلا پەیدابووە.

ئەم پیاوە بەدبەختە وێڕای ئەوەی هەمیشە ئامادەیە کە خۆی لە پێناوی یارمەتیدانی خەڵکیدا بەخت بکات، بەلام هەرگیز بەم ئاواتەی ناگات،چونکە توانـاو بـوێری بابایـەکی فریـارەس و رزگارکـەری نیـەو ناتوانێت کێشماکێشـی خـەڵکانی دی کـە زادەی نـاکۆکی و ناتەباییـە چارەسـەریکات،و بـەمجۆرە هـەرگیز ناگاتـە سـاغڵەمی دەروونـی و ئاسوودەیی رۆحی..(گێلە پیاو) لە ریزی شاکارەکانی دۆستۆفسکی دایەو بە شێوەیەکی یەجگار سەیر دەچێتە دڵی خوێنەرەوەو خوێنەر گیرۆدەی خۆی دەکات،بێئەوەی چارەسەر بۆ هیچ مەسەلەیەك دابنێت.ئەم رۆمانە لەسەرەتاوە لە روسیادا دەنگدانەوەیەکی ئەوتۆی نەبوو، بۆیە دۆستۆفسکی لێبڕا ئەمجارە رۆمانێکی جەماوەری پڕخوێنەری عەوامپەسند بنووسێت،ئەوەبوو کورتە رۆمانی (هەمیشە مێرد)ی لە ساڵی ١٨٧٠دا بلاوکردەوە، لەم رۆمانەدا نووسەر خۆی لەو دۆزو مەسەلە فەلسەفی وکۆمەلایەتیانە دوورگرتووە،کە لە تایبەتمەندییەکانی رۆمانە بەنێوبانگەکانی ئەون.

ئارەمانی ئەم رۆمانۆکە کەسێکی چل ساڵانە، لە ساتێکدا گوناهەکانی سەردەمی لاوی خۆی بیر دەکەوێتەوە، بەمەش زۆر نارەحەت و نیگەران دەبێت. ئەم رۆمانۆکە باشترین بەرهەمی تەنزئامێزو ساتیری **دۆستۆفسکی** یە،کە یەجگار ماوسەنگ و لە قاڵبێکی نەوسامێزی جوان وئاساییدا داڕێژراوەو نیشاندراوە. لە ساڵی ١٨٧٠دا رۆمانی(جن

زەدەکان)ی بلاوکردەوە.ئەم رۆمانەی لەو قۆناغەدا نووسیوە کە لە هەندەران بوو، بابەتەکەی بریتیە لە فیت و پیلانێکی سیاسی، خەڵکی شارێك بە گیانێکی شۆرشگێرانەوە دەهاروژێنێت و رادەبن کە هەموو یاسا ئەخلاقی و مەزەبیەکانی خۆیان بگۆرن.دۆستۆفسکی لەم بەرهەمەدا بیروباوەرو بۆچوونی هەموو ئەو خەڵکانە رەتدەکاتەوە کە کەوتبوونە ژێرکاریگەریی بە ئەورووپایی کردنی روسیاوە.
ناونیشانی رۆمانەکەش هەمان مانا دەگەیەنێت و میللەتێك نیشاندەدات کە خولیاو جادووی کەلتورو شارستانیەتی بێگانە لە کەللەی داون.دۆستۆفسکی بەو پارەیەی کە وەشانکاری کتێبی گۆرین بۆی نارد،گشت قەرزەکانی خۆی دایەوەو هیلاك و شەکەت و ماندوو،بەلام خۆشەویست و بەنێوبانگ بۆ سانپترسبۆرگ گەرایەوە.ئەو رۆمانانەی کە دۆستۆفسکی لە هەندەران نووسیبوونی،لە نێو بەرهەمی نووسەرانی تری روسیدا،ریزی پێشەوەیان گرت،ولەبەرچاوی عەوامی خەڵکیدا پایەوپێگەی رابەرو موشیدیان بە دۆستۆفسکی بەخشی.دۆستۆفسکی کە قاڵبووی بۆتەی دەردو ئازارو مەینەتی تاقەتپروکێن بوو، توانی ئازارەکانی خەڵکی، واقیعبینانە نیشان بدات.کە لە جەماوەری خوێنەری خۆی دڵنیا بوو ئیدی کەوتە نووسینی (رۆژانە یاداشتی نووسەرێك).ئەم کتێبە کۆمەڵێك نووسینی پەراگەندەی هەمەجۆر بوو کە لە سالانی(١٨٧٣-١٨٨١)بلاوی کردەوە، یانی کۆمەڵە وتارێك بوو دەربارەی کێشەکانی رۆژ، وەکو بارودۆخی سیاسی وجیهانی و مەسەلەی کۆیلایەتی کە نووسەر کردبووی بە خەمی نەتەوەیی ومەزەبی وئەخلاقی خۆی.

دۆستۆفسکی لەم یاداشتانەدا هەڵوێستی کەسێکی نیشتمانیپەروەری ئارتەدۆکسی مەسیحی لە هەنبەر مەسەلەکانی سەردەمی خۆی وەردەگرێت،وباوەڕی وایە مەزەبی روسی هێندە لەبارە کە شایستەیی ئەوەی هەیە کە رۆژێ لە رۆژان ببێ بە رابەری ئەورووپاو تەنانەت هەموو جیهانیش. کۆمەڵێك دۆزو مەسەلێن دیکەش لەم یاداشتانەدا خراونەتە روو وەکو لایەنگری لە مافی ژن،ریفۆرمی دادوەری،مەسەلەی جولەکەو...لەم یاداشتانەدا چەند کورتە چیرۆکێکی نووسەریش بەدی دەکرێن.وەکو:بوبوك،ونازەنین.بوبوك چیرۆکێکی فەلسەفی خەمناکەوگفتوگۆیەکی نێوان مردوانی گۆڕستان نیشان دەدات و ئەمە چیرۆکی کابرایەکە کە لە هەنبەر جەستەی ساردوسڕی ژنە گەنجەکەیدا کە خۆکوژی کردووەو کابرا لە هەوڵی ئەوەدایە پەی بە هۆو ئەنگێزەو مانای ئەو کارەساتە بەرێت. ئەم پیاوە یەکێکە لە قارەمانە هەرە تایبەتیەکانی دۆستۆفسی کە بەردەوام لە نێوان چاکی وخراپیدا لە نەوەسانداییە.(برایانی کارامازۆف)کە لە سالی ١١٨٧٩ بلاوبووەوە، بە شاکاری **دۆستۆفسکی** وبەیەکێك لە بەرهەمە ئەدەبیە ئەورووپاییە هەرە مەنگ وقوڵەکانی نیوی دووەمی سەدەی نۆزدەیەم دەژمێردرێت.لەم رۆمانەدا ئەو دوو هێلەی کە بەسەر رۆحی دۆستۆفسکیدا زاڵن،نیشاندراون.لەلایەکەوە باوەڕە بە پرەنسیپی هێزی چاکە کە لە ناخ و نیهادی بەشەردا پەنهانەو لە شێوەی ئیمانی مەزەبی وبەرپرسیارێتی هاوبەشی تیرەی بەشەردا خۆی دەنوێنێ، لە لایەکی ترەوە هێزی خراپەیە کە بەردەوام ئەو بەرەو گێژاوێکی سامناك رادەماڵێت.

ئەم دوو هێزە بە جۆرێ ئاوێتەی یەکترن کە جیاکردنەوەو هاوێرکردنیان لێکدی یەجگار ئەستەمە.خوێنەر لەم بەرهەمەدا خۆی لە دنیایەکی چڕوچوغردو قەوغای ئەوتۆدا دەبینێت کە هەردوو دنیای خەون وخەیاڵ، وواقیعی ژیان وەکو تان وپۆ بە یەکترا چوون. بەم رۆمانە شۆرەتو نێوبانگی دۆستۆفسکی گەییە لوتکە و خەریك بوو گۆی هونەرونێوبانگی لە تولستۆی و تۆرگینیف–ش دەبردەوە. دۆستۆفسکی لە ١٨٨٠/٦/٨دا لە بۆنەی سەدەمین ساڵیادی لە دایکبوونی پوشکیندا، لە مۆسکۆ، وتارێکی هێندە بە جۆش و خرۆشی پێشکەش کرد کە خەڵکەکە بەجۆرێ گوڵبارانیان کرد لەزگ بوو نوقمی گوڵان بێت و هەندێ کەس دەستیان ماچکرد وخوێندکارێکی زانکۆ لەبەر پێیدا کەوت و بورایەوە. لەم وتارەدا کە بۆ خۆی شاکارێك بوو، جگە لەوەی مەزناتی و شکۆی هونەریی پوشکین گەیەنرابووە لوتکەی خۆی، دۆستۆفسکی، بابەتی دڵخوازی خۆیشی، کە ئاشتکردنەوەی کەلتورو هونەری رۆژاواو روسیا بوو، خستبووە روو. دۆستۆفسکی لەوە بە دواوە بەو پەڕی بەختەوەری و خۆشی لە ماڵە هێمن و ئارامەکەی خۆیدا دەگەڵ هاوسەرە ئازیزەکەیدا بە ئاسودەیی دەژیا، بەڵام ئەم خۆشی و شادیە زۆری نەخایاند ولە ١٨٨١/١/٢٨دا دۆستۆفسکی لە پڕێکاو بە هۆی خوێنڕێژییەکی کوشندە کۆچی دوایی کرد.

هەموو خەڵکی رۆسیا، بە گشت چین وتوێژە کۆمەڵایەتیە جیاوازەکانەوە لە پرسەکەیدا بەشداریان کردو بە رێورەسمێکی یەجگار پڕشکۆ، جەنازەکەیان بەرێکرد و دوا ماڵاواییان لێکرد. گەلێك لە نوسەران وتاریان لەسەر گۆڕەکەی داو وەکو شەهیدێك باسیانکرد.وکاتێ بە خاك سپێردراو

ئامادەبووانی سەرقەبران بلاوەیان لێکرد،گۆڕستانەکە گەڕایەوە باوەشی خامۆشی وبێدەنگی،ئەو کاتە ژیانی تازەی دۆستۆفسکی دەستی پێکرد،هەڵبەتە نەك بە جەستەو لەسەر زەوی، بەڵکو لە بەرهەمە جاویدان ونەمرەکانیدا، لەو دیوی زەمەن و لە سەرووی شوێنەوە، لە دڵی ئەو خوێنەرانەیدا کە بەرەو قوڵایی دەروون،وبەرەو قوڵایی بوون پەلکێشیان دەکات..

هەڵبەتە **دۆستۆفسکی** تەنیا چیرۆکنووس نەبوو،بەڵکو یەکەم کەس بوو کە دەروونناسی مۆدێرنی هێنایە ناو چیرۆك ودوو لایەنی ئاگایی ونائاگایی بوونی بەشەریی هونەرمەندانە نواندووەو بەرجەستە کردووە.

بە توانایەکی ئەوتۆوە رۆح و ئەندێشەی بەشەری لە قاڵبی چیرۆکدا پیشانداوە، کە هەموو قارەمانەکانی وەکو ئاشنا ودۆست دێنە بەرچاو. رووداوو ڕیوپەڕێن چیرۆکەکانی دۆستۆفسکی هەر هەموویان لە شاردا،لە ماڵە پەڕپووت و هەژارنشینەکاندا، لە ژوورە پیس و نەگبەتبارەکاندا،واتە لەو شوێنانەدا روو دەدەن کە تایبەتن بە ژیانی جەماوەری رەش و رووت ومەینەتبار و زۆرلێکراو و غەدرلێکراوەوە، بۆیە هیچ سەیر نییە کە جەماوەری رەش و رووت دۆستۆفسکی بە پارێزەری خۆ بزانن و بەو جۆرە دڵبەستەی بەرهەمەکانی بن. دۆستۆفسکی یەکێکە لە چیرۆکنووسە هەرە دیارەکانی دنیای ئەدەبیاتی سەدەی نۆزدەیەمی سەرانسەری جیهان و کاریگەرییەکی فرەی بەسەر بەرهەمی زۆر کەڵە نووسەریشەوە هەبووە..

جا خوێنەری هێژا، بەندە لەو روانگەیەوە کە لە لایەکەوە بایەخدان بە کەلەپوری ئەدەبیاتی جیهان بە پێویست وفەردەزانم، ولە لایەکی ترەوە

ئاشناکردنی خوێنەری خۆماڵی بە شاکارە ئەدەبییەکانی جیهان بە ئەرکی سەر شانی ئەهلی قەڵەم دەزانم-ئەگەر بەندە هەوبم!!-شانم دایە بەر پاچڤەی ئەم ڕۆمانەی(هەژارن) دۆستۆفسکی کە یەکەم بەرهەم و نۆبەرەیەتی،وئەم وەرگێڕانەم لە دوو سەرچاوەی فارسی و عەرەبییەوە کردووە، واتە وەرگێڕانێکی بەراوردکاریانەی تەواوە، هەردوو سەرچاوەکەم پەرەگراف بە پەرەگراف لەبەر یەك گرتووە،لە هەرشوێنێکدا کامیان دەگەڵ ڕەوتی گشتی دەقەکەدا گونجاوتر هاتبێتە بەر مەزەندەو تێگەییشتنی بەندە،ئەویانم کردووە بە بناخە.

بەهەرحاڵ کارەکەی من کارێکی بەراوردکاریانەیە. بۆیە پەرەگرافی وام هەیە هەر دەستەواژەو رستەیەکی لە یەکێك لەو دوو سەرچاوەیەوە وەرگێڕدراوە.. هەڵبەتە ئەو جووتە سەرچاوەیە ئەگەر لە هێڵە گشتییەکاندا تێکبکەنەوە، ئەوا لە وردەکاری و پاژاندا جیاوازی زۆریان هەیە.کە ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ جیاوازی ئەو سەرچاوانەی کارەکەیان لێوە وەرگێڕدراوە لە لایەك و بۆ جیاوازی شێوازو داڕشتن و دەوڵەمەندی و هەژاری فەرهەنگی زمانەوانی هەریەکێ لە وەرگێڕە بەڕێزەکان و تەبیعەت وتایبەتمەندی ئەو زمانانەی بۆیان وەرگێڕاوە.بەهەرحاڵ من مەبەستم نەبووە خوێنەری کورد فێری عەرەبی یان فارسی بکەم،بۆیە خۆم لە وەرگێڕانی وشە بە وشە دوور گرتووەو ئەم کارەم بەو ئاوایە کردووە،ئیدی کارێکە و کردوومە، منەت بەسەر کەسدا ناکەم،بەتەمای ستایش و ئافەرین و دەستخۆشیش نیم، بەڵام بە هومێدم بە ئەهەق سەرزەنشت نەکرێم و بەر تانەوتەشەرانی منداڵانە نەدرێم!..ئەمانەش سەرچاوەکانی ئەم پاچڤە بەراوردکاریەی بەندەیە:

*–دوستوفسکی:الاعمال الادبیه الکامله–١٨ مجلدا،ترجمها عن الفرنسیه:د.سامی الدروبی/گ٢/دار ابن رشد ١٩٨٥،المجلد الاول
*– فیدور داستایفسکی/بیچارگان/ترجمه از متن انگلیسی باعنوانpoorfolik and other stories/خشایار دیهیمی/نشر نی/تهران ١٣٨٨

*تێبینی: بۆ نووسین و ئامادەکرنی ئەم پێشەکیە سوودم لەم سەرچاوانە وەرگرتووە:*

*–ئاودارانی ئەدەب،ئا:حەمەکەریم عارف،چ١،هەولێر٢٠٠٩ دەزگای موکریانی
*– نویسندگان روس،بە سرپرستی خشایار دیهیمی، نشر نی/تهران ١٣٧٩
*– الروایه الروسیه فی القرن التاسع عشر،د.مکارم الغمری/عالم المعرفه/نیسان/١٩٨١
*– دوستوفسکی: الاعمال الادبیه الکامله:ترجمه عن الفرنسیه د.سامی الدروبی.المجلد الاول:حیاه دوستوفسکی/ص١٣–٤٩
*– ئیلیادە/هۆمیرۆس/پێشەکی و وەرگێڕانی حەمەکەریم عارف،چ١/٢٠٠٩/دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم.
*– مێژووی ئەدەبیاتی روسی،سەعید نەفیسی،و: حەمەکەریم عارف،چ١/٢٠١٠ /خانەی وەرگێڕان
*– مێژووی ئەدەبیاتی جیهان،بەرگی دووەم،و: حەمەکەریم عارف،چ١/ ٢٠٠٨/هەولێر.دەزگای موکریانی.

*دۆستی گرانقەدر، فرفارا ئالکسیوفنای ئازیزم،* *٤/٨*

دوێنێ شاد بووم، بێ ئەندازەو لە تەسەور بەدەر شادو **دڵخۆش بووم!**
چونکە تۆی کیژۆڵەی لاسارو گوێ نەبیست، بۆ یەکەمجار، بە گوێت کردم، ئەو کارەت کرد کە من ویستبووم. ئێوارێ، نزیکەی سەعات هەشت، لە خەوێ رابووم (بە خۆت دەزانی من کە لەسەر کار دەگەڕێمەوە چەندم حەز لێیە سەعاتێ دووان پشوو بدەمو سەرخەوێ بشکێنم).
شەمالکێکم پەیدا کرد، دەستەیەك کاغەزم هێنا، بەدەم دادانی نووکی قەڵەمەکەمەوە، لە پڕو بە ڕێکەوت سەرم هەڵبڕی، پیاو راست بڵێ دڵم داخورپا !
تومەز تۆ ئاقیبەت زانی بووت ئەم دڵە بێچارەی من چی دەوێ ! سەیرم کرد چمکێکی پەردەی پەنجەرەکەت هەڵداوەتەوەو بە گوڵدانەکەتەوە بەستووە، دەقاودەق بەو شێوەیەی کە لە دیداری جاری پێشوومدا پێم گوتبووی، یەکسەر چارەو سیمای وردیلەو جوانت، لەو دیو پەنجەرەکەوە بۆ ساتێك هاتە بەرچاوم کە لە ژوورە چکۆلەکەتەوە، دەتڕوانیە خوارێو تەمەشای منت دەکرد، و دەتگوت بیر لەمن دەکەیەوە. زۆر بەداخەوەم فریشتە چکۆلەکەم، کۆترە باریکەکەم، کە نەمتوانی چارەی چکۆلەی ئازیزو مەحبوبت بە باشی بدینم!
**ئازیزەکەم**، منیش رۆژێ لە رۆژان چاوانم تیژ بوون، بەڵام پیری کاڵتە نازانێ، پیریو هەزار عەیب، ئازیزە چکۆلەکەم! بەڕاستی پیری ناخۆشە، بۆ نموونە من حاڵی حازر، ئا لەم ساتەشدا چاوم هەمیشە ئاو دەکات،

پیاو ئەوەندەی بەسە سەر لە ئێوارە کەمێك کار بکات، شتێك بنووسێت، ئیدی بۆ سبەی بەیانی چاوەکانی بە جۆرێ سوور هەڵدەگەڕێن و فرمێسکیان لێدێت، شەرم دەکات خۆی پیشانی خەڵکی بدات. بەلام ئەی فریشتە **قشـــتیلانەکەم**، من بزە شیرینەکەم بینیت، ناسکە بزە پڕ سۆزەکەم بە خەیاڵ بینیت، هەمان هەستی ئەو ڕۆژەم لاچێبوو کە ماچم کردیت ئەی ڤارینکا، ئەو ڕۆژەت لە بیرە، فریشتە قشتیلانەکەم؟ دەزانی ئازیزەکەم، کۆترەکەم، وام هاتە خەیاڵ کە لەو سەرەوە پەنجەم لێ رادەوەشێنی!

ئەمەت کرد ئەی کچۆڵەی لاسارو عەیاری **من**؟ هەر هەموو ئەمانەم بە تێرو تەسەلی لە نامەی داهاتووتدا بۆ بنووسە، یەك شتی مەپەڕێنە، ئێ پێم بڵێ بە ڕای تۆ ئەم تەگبیری پەردەی پەنجەرەیە چتۆ بوو، ڤارینکا؟ بیرۆکەیەکی زۆر جوان بوو. وا نیە ڤارینکا؟ کە کار بکەم، یان پاڵ بکەوم، یان هەڵبستم، دەزانم کە تۆ لەو سەرەوە بیر لە من دەکەیەوە، منت لە یادە، تۆش ساغیت، کەیفت قنجە. کە پەردەکە دابدەیتەوە یانی دەڵێیت: "شەو باش ماکار ئەلکسییوفیچ، کاتی خەوە!"

یا ئەگەر پەردەکە هەڵدەیتەوە یانی "بەیانی باش، ماکار ئەلکسییرفیچ، باش خەوتی؟" یان "ئەمڕۆ حاڵت چۆنە ماکار ئەلکسییوفیچ؟ ئەگەر لە حاڵی من دەپرسیت، شوکر بۆ خوا، باش و خۆشحاڵم!" دەبینی، قشتیلەکەم، چ تەگبیر وفەندێکی باشە؟ تەنانەت پێویست بەوە نیە ئیدی نامەم بۆ بنێری! بیرۆکەیەکی زیرەکانەیە، نا؟ بیرۆکەیەکی تازەیە، بیرۆکەی من بوو. من لەم جۆرە شتانەدا زیرەکم، وا نیە ڤرڤارا ئالکسیفونا؟

ڤرڤارا ئالکسیڤونای ئازیزم، دەتوانم ئەوەت پێ بێژم کە دوێ شەو، بە پێچەوانەی تەمای خۆمەوە، زۆر باش نووستم، بۆیە زۆر رازیم، پیاو کە بۆ خانوویەکی تازە دەگوازێتەوە، جێگۆڕ دەبێ‌و باش ناخەوێت، یانی هەمیشە کێشەیەکی هەیە، هەست بە ئاسوودەیی ناکات!

لێ من بەیانی میناکی هەلۆیەکی چوست‌و چالاك رابووم – شادو خۆشحاڵ! **ئازیزەکەم** بەڕاستی بەلەزەت بوو! بەیانیەکی فرە جوان بوو! پەنجەرەی ماڵەکەمان کرابووەوە، هەتاو دەدرەوشایەوە، باڵندەو تەیروتو دەیانخوێند، بۆنی بەهار دنیای پڕ کردبوو، هەموو تەبیعەت ژیا بووەوە– هەموو شتەکانی دیکەش وا بوون، چاویان لە تەبیعەت دەکرد، هەموو شتێك بەهاری بوو. تەنانەت خەونی خۆشم بینی، و هەموو خەونەکانم بە تۆوە بوو، ڤارینکا گیان، تۆم بەو باڵندەیەی ئاسمان شوبهاند کە بۆ شادی بەشەران خولقاوەو زینەت و جوانی تەبیعەتە.

**ڤارینکا** گیان، لە پڕ ئەوەم بە خەیاڵدا هات ئێمەی بەشەر کە لە گێژەنگی ژیانی سەر زەمینەدا بەو هەموو خەم و خەیاڵ‌و زەحمەتەوە دەژین، دەبێ خۆزیا بە شادمانی بێگەردو بێ خەم و خەیاڵی باڵندانی ئاسمان بەرین– ئیدی زۆرتر لەم جۆرە بیرو خەیاڵانە، یانی بەو دەقەوە کەوتمە زندە خەونان، خەون‌و خەیاڵ‌و بەراوردکاری دوورو درێژو دوور لە زەین، ڤارینکا، من لێرەدا کتێبێکم لایە کە هەمان ئەم شتانەی تیایە–و هەموو ئەم شتانەی بەوپەڕی وردی باس کردووە. من کە ئەمە بۆ تۆ دەنووسم، قشتیلەکەم، چونکە من خۆیشم هەزارو یەك جۆرە خەون‌و خەیاڵم هەیە. چونکە ئێستا بەهارە: بیروبیرەوەری خۆش‌و بەلەزەت بە مێشکی بنیادەمدا دێتە دەبێ پیاو ناسکە خەون‌و خەیاڵانی هەبێ،

هەموو شتێك لە چاوی بنیادەمدا جوانو سوورو خۆشڕەنگ دەنوێنێ، لەبەر ئەوە هەموو ئەم شتانەت بۆ دەنووسم، هەڵبەتە دەبێ ئەوەش بڵێم کە هەر هەموویم لە هەمان کتێبەوە وەرگرتووە. نووسەرەکەی هەمان ئەو خەونو خۆزیاو ئارەزووانە بە شیعر دەردەبڕێتو دەڵێت:

خۆزیا ئێستا تەیرێ دەبووم، خۆزیا هەڵۆیەك دەبووم؟ ئیدی گەلێك لەم قسانەو هی تریش لەم کتێبەدا هەن، بەڵام با جارێ بمێنن، کارم پێیان نیە. ئێ ئێستا پێم بڵێ تۆ ئەمڕۆ بەیانی لە کوێ بووی، ڤرڤارا ئالکسیڤونا؟ من هێشتا وەڕێ نەکەوتبووم کە بۆ دایەرە بڕۆم، تۆ وەکو باڵدارێکی بەهار، لە ژوورەکەت وەدەرکەوتبووی‌و چکۆلەو باڵ سووك لە حەوشەدا دەهاتی‌و دەچووی. چەند بە دیتنت خۆشحاڵ بووم! ئاخ ڤارینکا، **ڤارینکا** تۆ نابێ غەمگین بیت، بگریت، روندکان خەمی تۆ کەوی ناکەن، من ئەمە دەزانم قشتیلەکەم، من ئەمە بە تەجروبە دەزانم.

تۆ ئێستا ئاسوودەیت، و تەندروستیت باش بووە. ئا، ئەرێ حاڵی (ڤیدورا)ی دەستە خوشکت چۆنە؟ کە ژنێکی میهرەبانو ژنانەیە! ڤارینکا بۆم بنووسە، و بۆم بگێڕەوە کە ئەنووکە چۆن لەگەڵیا دەژی، لە هەموو شتێك رازیت؟

راستە (ڤیدورا) هەندێجار کەمێك شرپندەو بە خوتەو بۆڵە بۆڵە، بەڵام تۆ گوێی مەدەیە ڤارینکا. لێیمەگرە، خوا راوەستاوی بکات! ژنێکی میهرەبانە، پێشتریش باسی ئەو (تیریزا)یەم کە لێرەدا خزمەتمان دەکات، بۆ نووسیویت- ئەویش ژنێکی میهرەبانو جێی باوەڕو متمانەیە. من هەر نیگەرانی نامەکانمان بووم، نەمدەزانی چۆنیان بگەیەنمە تۆ؟ و پاشان، بەختمان یار بوو، وخودا (تیریزا)ی بۆ ناردین. ژنێکی میهرەبانو

نازەنینە. بەلام خودانی خانووەکەمان، ژنێکی بێ ڕەحمو بەزەییە، تیریزا زۆر دەچەوسێنێتەوە، کاری زۆری پێدەکا، بە جۆرێ ڕەفتاری دەگەڵ دەکات وەك ئەوەی بەرە کۆنێکی ڕاخراوی بەر دەرگا بێت.

ژوورەکەی من، نازانی چ کونە مشکێکە، فرفارا ئەلکسیڤونا! ئێ ئیتر ژووری کرێیە! من پێشتر وەکو دەروێشێکی ڕاستەقینە دەژیام، خۆ دێتە بیرت- ئارامو بێدەنگ، بە ڕادەیەك ئەگەر دەرزیەك کەوتبا عاردی گوێت لە دەنگی دەبوو. ئێرە بە پێچەوانەوە، یەکپارچە دەنگە دەنگ، هەراو زەنا، قرەقرو قەرقەشەیە!..

من هێشتا باسی ئەم خانووەم بۆ نەکردویت، نازانی ئێرە چۆنە، تۆ ڕاڕەوێکی درێژ بێنە بەرچاوی خۆت. تا بڵێی تاریك و نوتەك، تا بڵێی پیس و پۆخڵە. بە دەستەڕاستدا دیوارێکی ڕووت و قووتە، بە دەستە چەپدا هەر دەرگاو دەرگاو دەرگایە، ڕێك وەکو هۆدەێن ژمارەداری ئوتێل بە ریزی یەکەوەن. ئیدی ئەم ژوورانە بۆ کرێن و لە پشت هەر دەرگایەکەوە ژوورێکی بچووك هەیە، خەڵکی دوو دوو، وسێ سێ لەم ژوورانەدا دەژین.

کەواتە نابێت چاوەڕوانی پاك و تەمیزی بی- عەینی کەشتیەکەی نوحە! بەلام پیاو هەق بڵێ خەڵکانی ناو ئەم ژوورانە، خەڵکی باشن، هەموویان خوێنەوارن، ڕۆشنبیرن. یەکێکیان فەرمانبەرە (لە دایەرەیەکی ئەدەبیدا کار دەکات).

پیاوێکی فرە ڕۆشنبیرە: باسی هۆمەرو برامبیوس، و نووسەرانی تری خۆیان دەکات، باسی هەموو شتێك دەکات- پیاوێکی زۆر زیرەکە! دوو ئەفسەریشی لێیە دایمەی خوا خەریکی قومارپیازین. هەروەها ملازمێکی

دەریایشی لێیە، و کابرایەکی ئینگلیزیشی لێیە دەرس دەڵێتەوە. سەبرکە قشتیلەکەم، بزانە چەندت سەرگەرم دەکەم، لە نامەی داهاتووم دا، وەسفێکی تەنزئامێزی هەموویانت بۆ دەکەم، یانی بە دوورو درێژی بۆت دەنووسم کە چتۆ بەشەرێکن.

خاوەنی خانووەکە پیرەژنێکی کورتە باڵای، پیسی بێ سەروبەری نەگبەتە- رۆژ تا ئێواریێ بە جووتێ نەعلو جلی خەوەوە دێتو دەچێتو لە بەیانیەوە تا ئێواریێ بەسەر (تیریزادا) دەبۆڵێنێ. من لە موبەقەکەدا دەژیم، مەبەستم... ئا،...

با بۆتی باس بکەم! رێك لە پاڵ موبەقەکەدا، ژوورێکی بچووك هەیە (پیاو هەق بڵێ موبەقەکەمان خاوێنە، رووناك، وە یەجگار رێكو پێكو بە تەرتیبە)، ژوورێکی بچووك، کونجێکی چکۆلە.. یانی ئەگەر بەم شێوەیە باسی بکەم باشترە، موبەقەکە هۆڵێکی گەورەیە، سێ دانە پەنجەرەی هەیە،و من لە بەشێکی جیایدام کە شانبەشانی دیوارەکەی بەرانبەرە، بە جۆرێ وەك بڵێی ژوورێکی جیایە، ژوورێکی زیادە، ژوورێکی گەورەو خۆشە، پەنجەرەو هەموو شتێکی هەیە- هەموو هۆیەکی ئاسوودەییو ئیسراحەت: ئیدی ئەمە کونجی منە.

جا **قشتیلەکەم** ئەمەت پێ سەیر نەبێ، خەیاڵ نەکەی هیچ شتێکت لێدەشارمەوە، لەوەش زیاتری تیایە کە پێم گوتیت، لە دڵی خۆتا نەڵێی: "بۆچی لە موبەقدا دادەنیشم؟!"- بەڵێ، زۆر راستە من لە موبەقدا، لە پشت لەمپەرێکەوە دەژیم، بەڵام ئەمە گرینگ نیە، من بە جیا لە هەموو ئەوانی دی دەژیم، بە تەنیا، ژیانێکی ئارامو بێدەنگ بەسەر دەبەم.

تەختە خەوێکو مێزێکو دۆلابێکو جووتێ کورسیم داناوە، وێنەیەکی حەزرەتی مەسیحیشم بە دیوارەکەوە هەڵواسیوە. راستە دەشیا شوێنی چاکتر -تەنانەت زۆر چاکتر- پەیدا بکرێ. بەڵام شەرت ئاسوودەیی و ئیسراحەتە. و من هەموو ئەم کارانەم لە رای ئاسوودەیی و ئیسراحەتی خۆمدا کردووە، وا خەیاڵ نەکەی چ مەبەستێکی ترم هەبووە، پەنجەرە **چکۆلەکەی** تۆ رێک بەرانبەر پەنجەرەکەی منە، حەوشەکە، کە حەوشێکی باریکە، وەختێ تۆ رەت دەبی دیارە- و ئەمە بۆ کابرایەکی بەدبەختی میناکی من شادیەکی گەورەیە،و کرێکەشی هەرزانترە. خراپترین ژوور لەمماڵەی ئێمەدا، بە شیڤ و فراڤینەوە، مانگانە سی‌و پێنج رۆبلی کاغەزی دەکەوێ. ئەمە بۆ من زۆرە، لە عۆیەی نایەم!

بەڵام کرێی شوێنەکەی من تەنیا حەوت رۆبڵە، ئەگەر پێنج رۆبڵی زیویشی بۆ شیڤ و فراڤین بخەمە سەر: بە هەمووی دەکاتە بیست و چوار رۆبڵ و نیوی کاغەزی، پێشتر سی رۆبڵم دەدا،و لە چاو ئێرەدا لە زۆر شتم کەم بوو، تەنانەت نەمدەتوانی بە بەردەوامی چای بخۆمەوە، بەڵام ئێستا دەتوانم ئەوەندە پاشەکەوت بکەم کە چاو شەکریش بکڕم، دەزانی ئازیزەکەم ئەگەر لێرە چای نەخۆمەوە لە روو دادەمێنم.

ئەو کرێ نشینانەی ئێرە هەموو وەزعیان باشە، ئەگەر پیاو لەناو ئەوانەدا چای نەخواتەوە خەجاڵەت دەبێت.یانی من لەبەر ئەوان چای دەخۆمەوە **ڤارینکا** گیان، هەر بۆ پاراستنی رواڵەت و ئابروو، دەنا من خۆم گوێی نادەمێ، بابایەکی چا خۆر نیم، با ئەوەشت پێ بڵێم: پیاو دەبێ پارەیەکی لە گیرفاندا هەبێت، بۆ وردە مەسرەفان، ئیدی بۆ پێڵاو بێ بۆ جل‌و بەرگ بێ- ئیدی پیاو چی بۆ دەمێنێتەوە؟

دەبیَ هەر هەموو ئەم پارانە بە مووچەکەم دابین بکەم، من گلەیی ناکەمو شوکرم، خۆشحالّم و مووچەکەم بەش دەکات، سالانی سالّە بەشی کردووم، خۆ ناو بە ناو زیادەو پاداشتێکیش دەدەن.

ئیَ، جاریَ خودا حافیز ئەی **فریشتە** قشتیلەکەم. جووتیَ گوڵەخەنەو چلێك گوڵە شەمامنیم بۆ کڕیویت، بۆیەم کڕیون– گران نەبوون. زۆر حەز لە گوڵە ئەسپەرەك دەکەی؟ ئەسپەرەکیشیان هەیە، ئەگەر دەتەویَ بۆم بنووسە با بۆتی بکڕم، بەڵیَ، بە دوورو درێژی بۆمی بنووسە. بەلام ئازیزەکەم، خۆت ناڕەحەت مەکەو خەمی منت نەبیَ کە ژوورەکەم واهیە، دووپاتی دەکەمەوە: کە لەبەر ئاسوودەیی و ئیسراحەتی خۆم ئەم کارەم کرد. تەنیا ئاسوودەیی خستمیە سەر ئەم کەلکەلەیە. هەر چۆنێك بیَ ئازیزەکەم، بەمجۆرە شتێك پاشەکەوت دەکەم، پارەیەك دەخەمە لاوە، ئێستا تۆزە پارەیەکم خڕ کردووەتەوە. وا نەزانی ئەوەندە بێدەسەلاتو داماوم، بە باڵی مێشوولەیەك بکەوم. نا، ئازیزەکەم، من بنیادەمێکی بە ورەو بە باشارم، ئەو توانایەم تیایە کە شایستەی بنیادەمێکی بە ورەو ئارام و ئاسوودە ویژدان بیَ، بە دوعا ئەی فریشتە **قشتیلەکەم**! ئەمجارە نزیکەی دوو لاپەڕەی تەواوم بۆ نووسیویت، ئێستا کاتی ئەوە هاتووە بڕۆم بۆ سەر کار. دەبوا زووتر بڕۆم بۆ سەر کارەکەم، قامکە ناسکە جوانە ئازیزەکانت رادەمووسم، تا ماوم ئازیزەکەم، هەر خزمەتکارو بچووكو دۆستی وەفاداری تۆم.

*ماکار دیفوشکین*

پەراوێز:

تەنیا تکایەکم لێت هەیە: تا دەتوانی بە دوورو درێژی وەڵامەکەم بۆ بنووسەوە، ئەی فریشتەکەم. دەگەڵ ئەم نامەیەدا نیو کیلۆ شیرینیت بۆ دەنێرم، نۆشی گیانی بکەو تو ئەو خوایە خەمی منت نەبێ، یا هیچ بیرێکی خراپ سەبارەت بە من مەکەوە. ئێ جارێ خودا حافیز، قشتیلەکەم.

*ئازیزەکەم، رێزدار ماکار ئەلکسییوڤیچ* *٨/٤*

دەزانی ناچارت کردووم دەگەڵت بەشەڕ بێم! بەزاتی خوا، ماکار **ئەلکسییوفیچی** میهرەبان، زۆرم لەبەر گرانە دیاریەکانت قەبووڵ بکەم. دەزانم ئەم دیاریانە چەند گران لەسەرت دەکەون، دەزانم چەند زۆر لە خۆت دەکەی‌و چۆن خۆت لە زۆر شتی پێویستی ژیان مەحروم‌و بێ بەش دەکەی تا ئەم دیاریانە بۆ من بنێریت.

تا ئێستا چەندم پێ گوتووی کە پێویستم بە هیچ شتێك نیە، بە هیچ شتێك، ومن توانای ئەوەم نیە چاکەت بدەمەوە، تۆڵەی ئەم هەموو میهرەبانیانەی بە سەرمیا دەبارێنی بۆ بکەمەوە، ئاخر چی لەم هەموو گوڵانە بکەم؟ مەبەستم ئەمەیە کە باشە گوڵەخەنەکان هەر نەیسەو بەجێی خۆی، ئاخر شەمانی بۆ؟ (شەمانی: گوڵێکە زۆر رەنگی هەیە. وەرگێڕ)؟ هەر ئەوەندەم خۆشە وشەیەکم لە دەم دەرپەڕێ، بۆ نموونە دەربارەی ئەم شەمانیە، و تۆ خێرا دەڕۆیت‌و شەمانی دەکڕیت، و من دڵنیام شەمانی گرانە، وانیە؟

**ئەم** گوڵانە چەند جوانن، دەڵێی چەلیپای بچووکن‌و تێك ئالاون، ئەم شەمانیە جوانەت لە کوێ پەیدا کردووە؟ گوڵدانی شەمانیەکەم لە ناوەندی پەنجەرەکە، لە دیارترین‌و بەرزترین شوێندا داناوە، و تەختێك لە ناو ژوورەکە دادەنێم‌و گوڵەکانی دیکەی لەسەر ریز دەکەم: سەبرێك بکە تا منیش دەوڵەمەند دەبم! فیدۆرا **شێتی** ئەم گوڵانە بووە، دەڵێی ژوورەکەمان بە راستی بووە بە بەهەشت —پاك‌و خاوێن‌و رووناکە! بەڵام گوێ بگرە— بۆچی شیرینی‌ومرەباشت بۆ ناردووم؟ ئەوی راستی بێ لە

نامەکەتاندا ئەوە حاڵی بووم کە حاڵت زۆر باش نیە– ئەم هەموو قسەیە دەربارەی بەهەشتو بەهارو بۆنو بەرامەی دنیا، و خوێندنی تەیرو باڵندان، چیە، لە دڵی خۆمداو بەدەم خوێندنەوەی نامەکەتەوە گوتم ئەمە شیعرە، وا نیە؟ بەڵێ، دەزانیت: نامەکەتان تەنیا لە شیعری کەمە، ماکار ئەلکسییوفیچ! ئیدی هەموو شتێکی تیایە: هەستێن ناسک، خەونو خەیاڵی پڕ هومێد! بەڵام دەربارەی پەردەی پەنجەرەکەم– هیچ کاتێک بیرم لێنەکردووەتەوە، رەنگە کاتێ کە گوڵدانەکانم جوڵاندووە، بە خۆی لا کەوتبێ، من هەڵم نەداوەتەوە!

ئاەـ ماکار **ئەلکسییوفیچ**! چەند بڵێی، و چی دەربارەی چۆنیەتی سەرفکردنی دەرامەتەکەت بڵێی تا من فریو بدەی، تا بۆمی بسەلمێنی کە دەرامەتەکەت تەنیا بۆ خۆت خەرج دەکەی، ناتوانی فریوم بدەیو ناتوانی هیچ شتێك لە من بشاریتەوە. زۆر ئاشکرایە کە تۆ لە بەر خاتری من خۆت لە شتە پێویستەکانی ژیان مەحرومو بێ بەش دەکەیت. بۆ نموونە بۆچی لە ماڵێکی وادا دەژی؟ بە چ ئەقڵێ ئەو ژوورەت بە کرێ گرت؟ مەبەستم ئەمەیە کە خەڵکەکەی دی ناڕەحەتت دەکەن، ئەزیەتت دەدەن، شوێنەکەت تەنگو ناڕەحەتە. **تۆ** حەزت لە تەنیاییو گۆشەگیریە، بەڵام ئێرە خانێکە بۆ خۆی، هەر خوا دەزانێ دەوروبەرت چیە!

**تۆ** بە گوێرەی ئەو مووچەیەی وەری دەگریت، دەکاریت باشترو ئاسوودەتر بژیت. (فیدۆرا) دەڵێت شوێنەکەی جارانت زۆر لەمە باشتر بوو. ئایا بە ڕاستی هەموو ژیانت بەو جۆرە بردووەتە سەر، بە تەنیا، سەخت و قورس، بێ هیچ شادیەك، بەبێ وشەیەکی خۆشی دۆستێك، لە

تاقە ژوورێکی پۆشتەو پەرداخ دا کرێ نشینی غەریبان بی؟ ئاه، دۆستی ئازیزم، چەندت بۆ بەداخم! هەر هیچ نەبێ، بەلای کەمەوە ئاگات لە تەندروستی خۆت بێ، **ماکار** ئەلکسییوفیچ! تۆ دەڵێی چاوەکانت کز بوون — کەواتە چیتر لەبەر شەمالکان مەنووسە، هەر مەنووسە، نووسین بەچی دەچێت؟ دڵنیام سەرانی تۆ ئیتر تۆ دەناسن و دەزانن چەند دڵسۆزی ئەنجامدانی کارو ئەرکی خۆتی.

جارێکی دیکەش تکات لێدەکەم: ئەم هەموو پارەیە بۆ من خەرج مەکە، دەزانم خۆشت **دەوێم**، بەلام تۆ وەزعی داراییت باش نیە.. ئا، من ئەم بەیانیە شادوخۆشحاڵ لە خەو رابووم. زۆر بە گوڕو دڵخۆش بووم، کاتێ هەستام فیدۆرا دەمێ بوو خەریکی کار بوو، و ئێستا کارێکی بۆ منیش دۆزیوەتەوە. زۆر خۆشحاڵم، من هەروا بەسەر پێوە وەدەرکەوتم و هەندێك خەیاتەم کڕی و هەنووکە دانیشتووم و کار دەکەم، سەرانسەری سەر لە بەیانی شادو **خۆشحاڵ** بووم! بەلام ئێستا جارێکی دی بیرو بیرەوەری تاریك و غەمین مێشکیان داگرتووم، دڵم قورس وتەنگە.

چیم بەسەر دێت، چارەنووسم چیە؟ لە هەموو ئەمەش خراتر ئەمەیە کە زۆر نیگەرانم، هیچ ئایندەیەك لەبەردەم خۆدا نابینم، تەنانەت ناتوانم بە مەزەندەش بزانم چیم بەسەر دێت، ناوێرم ئاوڕ لە رابردووش بدەمەوە، رابردووم مێندە پڕ لە بەدبەختی و کڵۆڵیە کە هەر یادەکەی دڵم ئەنجن ئەنجن دەکات.

دنیا خەریکە تاریك دەبێت، دەبێ بچمەوە سەر کارەکەم. زۆر شت هەبوون کە دەمتوانی بۆتی بنووسم، لێ کاتم نیە، چونکە دەبێ لە

ماوەیەکی دیاریکراودا کارەکەم تەواو بکەمو تەحویلی خاوەنی بدەم. دەبێ لەزێ بکەم.

هەڵبەتە راستە کە نامە شتێکی باشە، و باری رۆتینی ژیانم لەسەر شان سووك دەکات. بەلام بۆچی بە خۆت نایەیتە دیدەنیم؟

بۆچی نایەی **ماکسار** ئەلکسییوفیچ؟ خۆ ئێستا ماڵەکەت زۆر نزیکەو هەڵبەتە هەندێجار دەستیشت بەتاڵ دەبێت. ئیدی وەرە، وەرە دیدەنیم! تیریزای لەمەر تۆم بینی. زۆر نەخۆش دیارە، بەزەییم پێدا هاتەوەو بیست کۆپیکم دایە. ئا، باش بوو بیرم کەوتەوە: پێویستە بە دوورو درێژی دەربارەی وردەکاری ژیانی رۆژانەی خۆتو ژینگەو ئەوانەی دەوروبەرتم بۆ بنووسیت. چ جۆرە خەڵکانێکت لە دەوروبەرە، دەگەڵیاندا هەڵدەکەی، کۆکی؟ حەز دەکەم هەموو ئەمانە بزانم. چاوەڕوانم ئەم کارە بکەیو بۆم بنووسیت. ئەمڕۆکە بە ئانقەست چمکێکی پەردەکە هەڵدەدەمەوە، تکایە کەمێ زووتر بخەوە، دوێ شەو سەیرم کرد مۆمەکەت تا نیوەشەو هەر دەسووتا. ئێ، خوا حافیز. ئەمڕۆ جگە لە ئەزاب، بێزای، و خەم هەستم بە چیتر نەکرد. ئەمڕۆش رۆژێك بوو وەکو رۆژەکانی دی! خودا حافیز

دڵسۆزت

ڤرڤارا دوبروسیلوڤا

**

*خانمی ئازیز، فرفارا ئالکسیوڤنا..* *٤/٨*

راست دەکەی **ئازیزەکــەم**، بـەڵێ دۆسـتە ئازیزەکـەم، بـەڵێ، ئەمەشیان ڕۆژێکـی شـووم بـوو، خرایــە ســەر ڕۆژانــی ژیــانی پــڕ کــوێرەوەری‌و چارەنووسی کڵۆڵم!

بـەڵێ گاڵتەیـەکی جوانــت پێکـردوم، بــە مــن، مــنی پیرەمێــرد، فرفــارا **ئالکسیوڤنا**! بەڵام خەتای من بوو، هەڵەی مـن. ئـاخر بـەم سـەری پیرییـە کە تەنیا دوو سێ داوم بە سەرەوە ماوە، چم داوە لـە وڕاوەی ئاشـقانە، و ئینشابازی‌و...

دەبـێ ئـەوەش بڵـێم، ئازیزەکـەم، کـە بنیـادەم هەنـدێجار بوونـەوەرێکی سەیرە، زۆر سـەیرە. خودایـا، خودایا! چ شـەیتانێك وا لـە مـرۆڤ دەکـات هەنـدێجار قسـان بکـات! ئـەم قسـەیە بـە چ دەچـێت؟ چـی لێـدەڕوێ، چ قـ ـازانجێك بەمرۆڤ دەگەیەنێ؟

هیچ، پیاو هیچی لێدەست ناکەوێ، ئەنجامی ئەم کارە هێندە دزێوە هـەر **هەپرسە**، خودا خۆی لە شەڕی ئەم قسانەمان بپـارێزێ! نـا، قشـتیلەکەم، من توڕە نیم؛ بەڵام یادی ئەو شتە خەیاڵیانـەی کـە نووسـیمن، ئـەو قسـە گەوجانانــەی کــە بــۆ تــۆم نووســین ئــازارم دەدات، ئەمڕۆکـە زۆر شــادو بەکەیف، دڵ پڕ لە گەرمی‌و نووروو ڕونـاکی چـووم بـۆ سـەر کارەکـەم. بـێ هیچ هۆیەك هەستم دەکرد لە ڕۆژانی جەژندام، کە شادو خوڕەم بووم!

بە شەوق‌و زەوقەوە لەسەر کارەکەم دانیشتم‌و چوست و چالاك کەوتمـە هەڵدانەوەی فایل‌و کاغەزان. بەڵام فایدەی بەچی؟

هیچ. کاتێ دوای کەمێك نیگایەکی دەورووبەرم کرد، سەیرم کرد هەموو شتێك لەم نووسینگەیەدا وەکو جارانە —تاریك‌و **خەمینە**. هەمان پەڵە مەرەکەب، هەمان مێزو هەمان چەکمەجەو کاغەزانی جاران. ئەدی من؟ هەمان بنیادەم، دەقاو دەق پیاوەکەی جاران بووم— کەواتە بۆچی بەمجۆرە سواری ئەسپی باڵدار بوو بووم؟ هۆی ئەم هەموو شتە چ بوو؟ هەر لەبەر ئەوە بوو کە هەتاوەکەی خۆش بوو، و ئاسمان سایەقەو سامانێ بوو؟ تۆ بڵێی لەبەر ئەمە بووبێ؟ ئاخر من چۆن توانیم باسی بەهارو بۆنی بەهار بکەم؟ کام بۆنی بەهار، هەر خوا خۆی دەزانێ چ پیسییەك لە ژێر پەنجەرەکانی **ئێمەدا** کەوتبوو! دیارە هەر هەموو ئەمە زادەی خەیالاتی من بووە.

ئاخر هەندێجار رێدەکەوێ جڵەوی خەیاڵو هەست لە دەستی پیاو بەر دەبێت‌و خۆی دەداتە دەم کزمەڵێك قۆڕیاتەوەو دەکەوێتە تورەهات نووسی. هۆیەکەشی مەگەر تەنیا ئەو جۆش‌و خرۆشە گەوجانەیە بێ کە دەکەوێتە دڵی پیاو.

ئیدی پێم عاردی ئەدەگرت، بە تۆبزی لاقەکانم بکێش دەکردن تا خۆم بگەیەنمەوە **ماڵێ**، ژانە سەرم بوو، لە پڕو لە خۆڕا سەرم دایە ژان، مەیمون زۆر جوان بوو ئاوڵەشی دەوردا، هەمان حیکایەتە کۆنەکە بوو (پێدەچوو پشتم دابێتە با).

هەوای بەهارەکە بە جۆرێ لە کەللەی دابووم، گەوج گەوج بە تۆزی بالاپۆشێکی تەنکەوە چوو بوومە دەرێ.

سەبارەت بە حەقیقەتی هەستەکانم، بە هەڵەدا چووی ئازیزەکەم! هەڵچوونەکانت بە هەڵە لێکداوەتەوە. ئەوەی منی بزواند هەستێکی

باوکانه بوو، ڤرڤارا **ئالکسیوڤنا**، تەنیا هەستێکی باوکانەی رووت بوو، هیچی تر نەبوو. چونکه تۆ هەتیوێکی کڵۆڵی‌و من جێگەی باوکم گرتوویتەوە، من لێرەدا بەوپەڕی راشکاوی‌و له کانگای دڵەوە دەتدوێنم، وەکو خزمێکی نزیك ئەم قسانه دەکەم، راسته من خزمایەتیەکی دوورم دەگەڵ تۆدا هەیە، راسته من به بن عام ئامۆزای تۆم، بەڵام هەر چۆنێك بێ هەر خزمی تۆم، جا من لەم کاتەدا خۆم به خزم‌و پشتیوانی نزیکی تۆ دەزانم، به تایبەتی که جگه له غەدرو خیانەت هیچی ترت لەو کەسانه نەبینی که دەبوایه لەم کڵۆڵیەتدا بەهاناتەوە بێن‌و پشتیوانیت لێبکەن..

بەڵام دەربارەی شیعر، دەبێ ئەوە بڵێم، **قشـتیلەکەم**، بۆ کەسێکی لە تەمەنی منا، دروست نیه شیعر بڵێت... شیعر ورِاوەو چەنەبازیه! تەنانەت منداڵە مەکتەبلیش لە مەکتەبدا شیعر بڵێن لێیان دەدەن.. بەڵێ، شتەکە وامیه قشتیلەکەم.

**ڤرڤارا** ئالکسیوڤنا، بۆچی لە ئارامی ماڵەکەم‌و ئاسوودەیی‌و هێمنی ژیانم‌و ئەم جۆرە شتانە دەپرسیت؟ ئازیزەکەم، من کەسێکی خۆش گلەیی نیم، و هیچ داوایەکم نیه، هیچ کاتێك وەزع‌و حاڵم لە ئێستا باشتر نەبورە، دەبێ بەم پیریە چ تەماح‌و داوایەکم هەبێ، بە تەمای چ بم؟ خواردنە هەمە، جل‌و بەرگە هەمە، پێڵاوە هەمە، خەڵکی وەکو من لەوەی پتر چیان گەرەکە؟ خۆ من میر نیم!

بابیشم ئەشرافزادە نەبورە، دەبوایە بە نیوەی ئەم مووچەیەی من رەشە خێزانێك بە خێو بکات. من لە ئازو نیعمەتدا پەروەردە نەبووم! بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا پیاو راست بڵێ، هەموو شتێك لە ماڵە کۆنەکەمدا، زۆر لێرە باشتر بوو.

شـوێنێکی کـەمێ باشـترم هـەبوو **قشـــتیلەکەم**، هەڵبەتـە ئـەم ژوورەی ئێستاشم هیچ جێی گلەیی نیە، و تەنانەت لە هەندێ رووەوە خۆشتریشـە، و راستت دەوێ، تەنەوعێکی زیاتری هەیە، من هیچ گلەییەکم نیـە —بـەلام لەگەڵ ئەوەشدا بیری شوێنە کۆنەکەم دەکـەم، ئێمـەی پـیر— یـا ئەوانـەی کە پێ دەنەنە ناو ساڵەوە، بە جۆرێ خوو بە شـتە کۆنەکانـەوە دەگـرین، وەك ئـەوەی بەشـێك بـن لـە خـودی خۆمـان. ژوورەکـەی جـارانم، وەکـو دەزانیت بچووك بوو، دیوارەکانی...

دیوارەکانی، **پیاو** نازانێ چ بڵێ. دیواران لە هـەموو شـوێنێ هـەر دیـوارن، دیوارەکانی گرنگ نەبوون، بەلام یادی شتەکانی رابردوو خەمبارو دڵتـەنگم دەکا... زۆر سەیرو غەریبە —هەست بە پەریشـانی دەکـەم، لـێ سـەرباری ئەمەش بیرەوەرییەکان تا رادەیەك خۆشـن، تەنانـەت شـتە خراپـەکانیش، ئـەو شـتانەی هەنـدێجار ئازاریـان دەدام، لەیادگـەو بـیرەوەری منـدا، خـۆ دەتەکێننو لایەنـە تاریـکو خراپـەکانیان پـاك دەبنـەوەو روونو روونـاك و پرشنگدار بە خەیاڵمدا گوزەر دەکەن.

ئێمە ژیانێکی خۆشو هێمنمان هـەبوو، **ڤارینکا**، مـنو خـودان خانووەکـە، ئەو پیرەژنە میهرەبانەی کە مرد، کە ئـەو پیرەژنەم بیر دەکەوێتـەوە خـەم دامدەگرێت! ژنێکی میرەبانو ژنانـە بـوو، کرێیـەکی زۆری لێنەدەسـەندم. هەمیشە قولاپ بە دەست، بە کۆنە داوان، خەریکی چنینی چەرچەفی سـەر تەختان بوو، قولاپەکانی هێند درێژ بـوون بـە عـەمراتت شـتی وات نـەدی بوو، جگە لەمە هیچ کارێکی دیکەی نەدەکرد.

پارەی روناکیو ئەوتمان بە شەریکی دەدا، بۆیە لەسـەر یـەك مێـز کارمـان دەکرد. نەوەیەکی چکۆلەشـی لەگـەڵیا دەژیا، لـە بیرمـە کچۆڵەیەکی ئێد

بچووك بوو، دەبێ ئێستا لە تەمەنی سیازدە سڵیدا بێت. نازانی چ ئاگری قودرەتێك بوو، و بۆ تاقە ساتێ دانەدەسەکنی، هەمیشە دەی هێنایینە **پێکەنین**، بەو جۆرە بە سێ قۆڵی پێکڤە دەژیاین، شەوگاری درێژی زستان لە دەوری مێزەخڕەکە دادەنیشتین، پیاڵە چایەکمان دەخواردەوە،و پاشان مژولی کاری خۆ دەبووینەوە، پیرەژن کە هەندێجار دەستی لە چنین هەڵدەگرت، بۆ ئەوەی نەوەکەی بخافڵێنێ‌و زۆر لاساریو بزێوی نەکات، نەقڵ‌و حیکایەتی بۆ دەگێڕایەوە. جا چتۆ چیرۆك‌و حیکایەتگەلێك!

نەك هەر منالان، بەڵکو خەڵکی گەورەی ئاقڵ‌و ماقولیش بە تاسەو لەزەتەوە گوێیان لەم چیرۆکانە دەگرت. خودایا! بیرم دێت کە پاپیەکەم پێدەکردو بە لەزەتێکی وەهاوە گوێم دەگرت کە بیرم دەچووەوە خەریکی چ کارێك بووم.

و منداڵەکە، کیژە لاسارەکەمان، لە فکران رادەچوو، گوپە سوور هەڵگەڕاوەکانی لە نێو هەردوو لەپی دەنان، و زارە جوانەکەی دادەچەقاند، و ئەگەر چیرۆکەکە تۆزقاڵێك **ترسناك** بوایە، تا دەیتوانی خۆی توندتر بە پیرەژنەکەوە دەچەسپاند. مەگەر خوا بزانێ چەندمان لەزەت لەو دیمەنەی دەبینی، و تەنانەت هەندێجار ئاگامان لەوە نەدەما کە مۆمەکە سووتاوەو تەواو بووەو بگرە هەندێجار گوێمان لە گڤەو هوڕی باو زریانی دەرەوە نەدەبوو، ژیانمان لەوێندەر خۆش بوو، ڤارینکا، نزیکەی بیست سڵێکمان پێکڤە رابوارد. ئا زۆرم چەنەبازی کرد!

ئەم قسانە رەنگە بۆ تۆ خۆش نەبن، بۆ منیش لەو بیرەوەریە خۆشانە نین کە یادیان بکەمەوە. بە تایبەتی لەم بولێڵی ئێوارەیەدا..

تیریزا سەرگەرمی کارێکە، دێو دەچێت، **منیش** سەرم دێشێت و پشتیشم ژان دەکات. ئەمە جگە لەوەی ئەو بیرەوەریانەی کە بە مێشکمدا دێن، ئەوانیش غەریبن، دڵێی ئەوانیش نەخۆشن. من ئەمڕۆ خەمبارم ڤارینکا گیان!. ئەم قسانە چیە بۆت نووسیووم؟ چۆن دەتوانم بێمە دیدەنیت؟

ئاخر خەڵکی چ دەڵێن فریشتە چکۆلەکەم؟ مەبەستم ئەوەیە کە دەبێ بە نێو حەوشەکەدا بێم و خەڵکی دەمبینن و دەکەونە پرسیار —قسەمان دوو دەخەن، لە پاش ملەمان دەڵێن و ماناو لە هەموو شتێك دەدۆزنەوە.

نا، فریشتە **چکۆلەکەم**، باشتر وایە سبەینێ لە کڵێسەدا، لە کاتی نوێژی ئێوارەدا بت بینم، ئەمە ماقوڵترەو بۆ هەردووکمان سەلامەت ترە، قشتیلەکەم، لێم مەگرە کە ئەم نامە بێ سەروبەرەم بۆ نووسیوی، کە جاری دووەم خوێندمەوە هەستم کرد شپرێوە، بێ سەرو بەرە.

بەڵام ڤارینکا گیان من بابایەکم پیر، کوڵکە خوێنەوار!

بە مندالی خوێندنێکی باشم نەکردووە، خۆ بەم پیریەش گەر دەست بە خوێندن بکەم، هیچ ناچێتە مێشکمەوە، ڤارینکا گیان من دەزانم کە لە هونەری نووسیندا وەستا نیم، و بێ ئەوەی پێویست بکات خەڵکانی دی بە تەوس و توانجەوە ئەمەم پێ بڵێن، دەزانم کە دێمە سەر ئەوەی شتێکی جوان بنووسم، لە کۆمەڵێك نووڕەهات زیاترم بۆ نایەت..ئەمڕۆکە لە پەنجەرەکەوە بینیمیت، دیتم کە پەردەکەت دادایەوە. خوا حافیز، خوا حافیز، خوا پشت و پشتیوانت بێ! خودا حافیز **ڤرڤاوا** ئالکسیوڤنا.

*دۆستی دڵسۆزت*

*ماکار دیڤوشکین*

**پەراوێز:**

**ئازیزەکەم من تەوس‌و توانج لە کەس نادەم. من پیاوێکی فرە پیرم، ڤرڤارا ئالکسیوڤنا. لەوە پیرترم بتوانم بە خۆڕایی لە عەلەیی کەس بڵێم! خۆ ئەگەر شتی وا بکەم خەڵکی گاڵتەم پێدەکەن، روس گوتەنی "ئەوەی چاڵ بۆ خەڵکی هەڵکەنێ خۆی تێی دەکەوێ.."**

***ئازیزم ماکار ئالکسیوڤیچ*** ***٤/٩***

باشە ئەی دۆستو وەلی نیعمەتی من ماکار ئالکسیوڤیچ، شەرم نیە بەو جۆرە خۆت تورە کردووەو بە خوتو خۆڕایی زویر بوویت؟ یان بۆاستی رەنجاوی، من هەستم بریندار کردوویت؟

بەداخەوەم هەندێجار خەمساریو هەقمەقی **دەکەم**، بەلام پێم وانەبوو قسەکانم بە تەوسو توانجان وەربگریت، باوەڕ بکە من هەرگیز ڕێ بە خۆ نادەمو پڕ کێشی ئەوە ناکەم کە گاڵتە بە تەمەنو کەسایەتی تۆ بکەم. هەر هەموو ئەمە دەگەڕێتەوە بۆ ئەقلّ سووکی منو بۆ ئەو بێزاریو بێتاقەتیەی بەرۆکی گرتووم، بە خۆت دەزانی بێزاری چ کەرێتیو کەتنێك بە بنیادەم دەکات؟ پێم وابوو تۆش لە نامەکەتدا شۆخیو سوعبەتت کردووە. بەلام کە دیتم لێم زویرو دلگیر بووی زۆر پەستو خەمین بووم.

نا، دۆستی میهرەبانو وەلی نیعمەتی من، نەهەقی دەکەی گەر گومانی ئەوە بکەیت کە من کەسێکی سپلەو **پێنەزانم**. من لە ناخی خۆمدا زۆر چاك دەزانم چۆن لە کانگای دلّمدا هەموو ئەو کارانەی تۆ لە پێناوی مندا کردووتن، وەکو گەنجێك هەڵگرم، تۆ بەو کارانەت منت لە شەڕی خەڵکانی شەڕانیو دڕ پاراست، لە نەفرەتو غەدرو ئاسیوی ئەوانت رزگار کردم، هەمیشە دوعای خێرت بۆ دەکەم، و ئەگەر دوعاکەم گەییە ئاسمانو لەبەر دەرگای پەروەردگار گیرا بوو، شادو بەختەوەر بیت.

ئەمڕۆ حالّم خراپە، **نەخۆشم**، تام لێیەو ناو بە تاو لەرزیشم لێدێت، فیدۆرا بەجگار خەمی منیەتی. هیچ هەق نیە سلّ لە سەردانی من بکەیەوە، نە

شەرمەو نە هیچ ماکار ئالکسیوڤیچ. ئەمە چ پەیوەندییەکی بە خەڵکانی ترەوە هەیە؟ ئێمە دۆستینو تەواو...

خودا **حافیز** ماکار ئالکسیوڤیچ. من جارێ هیچی ترم نیە تا بۆتی بنووسم، و راستت دەوێ توانای نووسینم نیە:

چونکە زۆر نەخۆشو ماندووم، دووبارە تکات لێدەکەم لێم زویر مەبە، تووڕە مەبە، لێم مەگرە، و دڵنیای دڵنیابە کە هەمان رێزو حورمەتی هەمیشەیم بۆتان هەیەو شانازی بەمەوە دەکەم.

*کارەکەری ئەمەکدارو*

*دڵسۆزت*

*ڤرڤارا دۆبرۆسیلوڤا*

**

*خانمی ئازیز، فرفارا ئالکسیوفنا* *٤/١٢*

ئاه، خانمه **چکۆلەکەم**، چت بەسەر هاتووە؟ هەموو جارێ دەمترسێنی، لە هەموو نامەیەکم دا تکات لێدەکەم کە ئاگات لە خۆت بێ، جلی گەرم لەبەر بکە، رۆژانی سارد مەچۆ دەرێ، و لە هەموو شتێکدا ئاگات لە خۆ بێ، بەلاَم تۆ ئەی فریشتە چکۆلەکەم، بە قسەم ناکەی! ئاه، ئەی کۆترەکەم، تۆ وەکو منداڵی بچووك وایت! مەبەستم ئەمەیە کە بەدەنت ناسكو بێ جورمە، لە لاسکە گەنم دەچیت، من ئەمە باش دەزانم، بە سووکە بایەکی سارد نەخۆش دەکەوی. بۆیە دەبێ وریا بی، ئاگات لە خۆت بێ، و ریسك نەکەیو دۆستانت نقومی خەمو پەژارە نەکەیت.

**فشتیلەکەم** پێت وتووم حەزت لێیە وردەکاریەکانی ژیانی رۆژانەی خۆمو دەوروبەرەکەم بزانیت، بەو پەڕی خۆشیو بەسەر ئەم داوایەت جێبەجێ دەکەم ئازیزەکەم. دەبێ لە نووکەوەو بە ریز دەست پێدەکەم!

هەوەڵجار بێینە سەر دەروازەی ماڵەکە: زۆر لە بارو گونجاوە، قاڵدرمەکانی پێشەوە زۆر جوانە، پاکو خاوێنە، روناکە، پانە، هەمووی لە ئاسنو تەختەیە. بەلاَم قاڵدرمەکانی پشتەوە هەر باسیان مەکە:

خواروخێچ، شکاوو کوڵەوار، شێدارو پیس، پلەکانی نیوە شکاوەو دیوارەکانی بە رادەیەك چەورە، کە دەست بە محەجەرەکانەوە بگری دەستت پێوەی دەنووسێت. **هەر** سەحنێکی پڕە لە شڕە کۆمەدی، کورسیە شکاو، تۆلاَب، جلە کۆنەی هەڵواسراو، و پەنجەرەی چوارچێوە شکاو، تەنەکەو تەشتی پەراگەندەی پڕ لە خاشاكو بەرماوەو زبڵ، تۆکڵە

مێلکە، و هەناوو ئێسکو پێستی ماسی، جا بۆگەن... بە کورتیەکەی، بۆنی بۆگەنی هێرت دەکات.

پێشتر باسی ریزو تەرتیبی ژوورەکانم بۆ کردبوویت، ئەلهەقی تەرتیبی ژوورەکان باشە –بەلام نازانم بۆچی هەندێك قەبزن؟

**مەبەستم** ئەمە نیە کە بۆنیان ناخۆشە– نا، دەتوانی بڵێی کەمێك بۆگنخن، بۆن ترشاویان لێدێت. هەوەڵجار کە وەژوور دەکەوی هەست بە بۆنێکی ناخۆش دەکەی، بەلام گرینگ نیە، هەر کە یەك دوو دەقیقەیەك مایتەوە ئیدی ئەم هەستە دەڕەوێتەوە، ئیدی بە خۆتیش ئەو بۆنە ناخۆشە دەگریت – جلەکانت، دەستەکانت، هەموو شتێك ئەو بۆنە دەگرێت..

ئیدی خووی پێوە دەگریت، ئالودەی دەبیت. بولبولەکانیش وەکو هەر شتێکی دی **لە** ماڵەکەماندا یەك لە دوای یەك دەمرن.

کابرای ئەفسەری دەریاوانی ماوەیەك لەمە پێش بولبولی پێنجەمی کڕی– لێ ئەو تەیرانە ناتوانن لەم هەوایەی ئێمەدا بژین، ئەمە راستیەکەیە، مویەقەکەمان، مویەقێکی گەورەیە، روناکو باشە. **راستە** کە بەیانیان پڕ دەبێت لە دوکەڵ، یانی ئەو کاتانەی کە کرێ نشینەکان ماسی یان گۆشت سوور دەکەنەوەو پێست و چەرمو چەوریەکانیان لێرەو لەوێ دەڕێژن، بەلام شەوان بەهەشتێکە لەو گۆڕە. مویەقەکەمان تەنافێکی تیا رایەڵ کراوە کە هەمیشە کۆنە دەرپێیەکی پێوە هەڵواسراوە، و چونکە ژوورەکەی من بە تەنیشت مویەقەکەوەیە،و راستیەکەی رێك بە مویەنەکەوە نووساوە، بۆنی ئەم دەرپێیە کەمێك ئەزیەتم دەدات، بەلام

گرینگ نیە: بنیادەم بەرەبەرەو بە تێ پەربوونی **رۆژگار** لەگەڵیا رادێت، لەگەڵ هەموو شتێکدا رادێت.

**ڤارینکا**، لەم ماڵەی ئێمەدا هەر لە بەیانی زووەوە هەراو زەنا دەست پێدەکات:

خەڵکی لە خەو رادەبن، دەڕۆن، لە دەرگا دەدەنو هەراو زەنایەك دەنەنەوە ئەوسەری دیار نەبێت.

هەموو ئەوانەی کە ناچارن بچنە سەر کاروکاسبیان دەکەونە پەلەپەل. خەڵکانی تریش هەڵدەستن، هەر هەمووان لەم ساتەدا دەکەونە چا خواردنەوە. زۆربەی سەماوەرەکان هی خاوەن خانووەکەن، ژمارەی سەماوەرەکان کەمە، بۆیە بەنۆرە چایی دەخۆینەوە.

وای بە حاڵی ئەو کەسەی نۆرە بڕی دەکاتو کوپەکەی دەباتە پێشێ! شەپەلاخ بە شەپەلاخ دڵێ بەولاوە. من یەکەم رۆژ ئەمەم لێقەوما، چونکە پەیڕەوی ئەم سیستەمەم نەکرد... بەلانەکی بۆچی باسی ئەمە بنووسم؟

هەر لەوێدا هەموو دراوسێکانم ناسین، یەکەم کەس ئەفسەرەکەم ناسی، بنیادەمێکی کراوەو خۆشەو هەموو چیرۆکو واریقاتی ژیانی خۆی بۆ گێڕامەوە: باسی باوکی، دایکی، خۆشکەکەی کە مێردی بە خەمڵچیەك-ی خەڵکی تولا کردبوو بۆ گێڕامەوەو باسی شاری کرونشتات-ی بۆ کردم.

بەڵێنی دامێ کە لە هەموو شتێکدا پشتو پەنام بێتو بمگرێتە ژێر پەرو باڵی خۆی. یەکسەر دەعوەتی کردم کە بچم بۆ ژوورەکەیو چایەکەم لەگەڵ ئەودا **بخۆمەوە**. چووم بۆ لای.

هەمان ئەو ژوورە بوو کە لەمماڵەدا کرابوو بە مەڵبەندی قوماروو وەرەقبازی، چاپەکیان دامێو ئەوانەی لەوێندەر بوون، زۆریان لێدەکردم کە قوماریان دەگەڵ بکەم.

نازانم **گاڵتەیان** پێدەکردم یان نا، بەلام دەزانم کە هەر هەموو شەوەکەیان بە یاری بەسەر بردبوو، وکە منیش چووم هێشتا هەر یاریان دەکرد، هەوەڵجار تەنیا تەباشیرو وەرەقی یاریم بینی، ژوورەکە بە رادەیەك پڕ لە دووکەڵی جگەرە بوو کە چاوەکانم کەوتنە کزانەوە، کاتێ کە رەفزم کرد یاریان دەگەڵ بکەم، یەکسەر پێیان گوتم کە فەلسەفەڕێسی دەکەم، ئیدی دوای ئەوە شتاقیان هیچیان پێ نەوتم، و ئەلهەقی ئەمە خۆشحاڵی کردم. چیتر ناچمە دیدەنیان، چونکە ئیش و کاریان تەنیا قومار کردنە، لە قومار زیاتر هیچی تریان لە بیر نیە !

ئەو فەرمانبەرە دەوڵەتیەش کە گوتم لە بەشێکی ئەدەبی فەرمانگەیەکدا کار دەکات، شەوانە لە ژوورەکەی خۆیدا کۆڕو مەجلیسی هەیە،ئەمانە خەڵکانی باش و بە ئەدەبن، خەڵکانی بێ وەی و بە نەزاکەتن، هەموو شتێکیان بنەمای رۆشنبیریی هەیە.

جا **ڤارینکا**، دەبێ بە شێرەیەکی رەوتەنیو لام سەرلایی ئەوەش بڵێم کە خاوەنی خانووەکەمان ژنێکی شرودڕە، پیرەژنێکی جادووبازە، بە خۆت تیریزاشت دیتووە، کە دەی بینی بەزەییت بە حاڵی شەپرێویدا دێتەوە.

هێندە باریك وبنبمە لە تۆ وایە مریشکێکی نەخۆشی پەڕوەریوە، تەنیا دوو خزمەتچی لە ماڵەکەدا هەن: تیریزاو فالدونی، فالدونی پیاوەو خزمەتکاری پیرەژنەکەی خودان خانووەکەیە. رەنگە ناوێکی تری هەبێ، من نایزانم، بەلام مەمبشە بەم ناوە وەلام دەداتەوە، هەموو خەڵکی

ماڵەکە هەمیشە بەم ناوەوە بانگی دەکەن. پیاوێکی سورهولی موو سوور، قەدو باڵایەکی نوشتاوەی ناقۆڵا، لووت فس، زیر تەبیعەت، و نەفرەت ئەنگێز، **هەمیشە** لەگەڵ تیریزدا شەڕە جوێنیانەو جاری وایە کار دەگاتە شەڕە مستو لەقەش. بە شێوەیەکی گشتی ژیانی ئێرەم باش نیە...

بەلام سەبارەت بە شەو هەرگیز رێك ناکەوێ یەکسەرو کپو کپو ئارام خەوم لێ بکەوێ.

بریا هەر هەمووان لە یەك کاتدا دەیانکرد بە شەوو دەچوونە جێگاوەو دەخەوتن —بەلام هیچ کاتێك شتی وا نیە. ئیدی هەراو زەنا بۆ ساتێکیش لەم ماڵە نابڕێت.

**هەمیشە** کۆمەڵێك هەن کە تا درەنگانێکی شەو لە جێیەك دادەنیشن‌و قومار دەکەن، هەندێجار شتی وا روو دەدات کە شەرم دەکەم بۆ تۆی بگێڕمەوە. بەلام ئێستا لەگەڵ هەموو ئەمانەدا راهاتووم، ئەلهەقی پێم سەیرە خەڵکانی خێزاندار چۆن دەتوانن لەم رۆمەڵغەزایەدا بژین.

خێزانێکی تەواو کە هەر هەموو هەژارو داماون لە تاقە ژوورێکدا کە لە خاوەن ماڵەکەیان بە کرێ گرتووە دەژین. تەنیا ئەم ژوورە نزیکی ژوورەکانی تر نیە، لەوپەڕی داڵانەکەدایەو کەوتووەتە سووچێکی تەریکەوە.

خەڵکانێکی **فەقیرن!** کەس ورتەیەکیان لێ نابیستێ. لە تاقە ژوورێکدا دەژین کە بە پەردان بەین کراوە. پیاوەکەیان فەرمانبەرێکی لە کار دەرکراوە، حەوت ساڵ لەوە پێش لەبەر خەتاو کەمتەرخەمیەکی بچووك لە کار دەرکراوە، ناوی گورشبکۆڤە، پیاوێکی وردیلەی کورتە باڵای سەر

بۆزە، جلەکانی هێندە شرشو چڵکنە، بە دیتنی دڵت تەنگ دەبێت، وەزعو حاڵیان لە منیش خراترە! پیاوێکی شڕۆڵەی نابووتە کە لە نەخۆش دەچێت (هەندێجار لە دالانەکەدا تووشی دەبم)، ئەژنۆکانی، دەستەکانی سەری دەلەرزن، پێدەچێت نەخۆشیەکی تایبەتی هەبێ، مەگەر خوا بزانێ چیەتی، یەجگار شەرمنە، زاتی نیە رووبەڕووی کەس ببێتەوە، وبە دزیەوە دێتو دەڕوات، من دەزانم کە خۆیشم شەرمنو ترسنۆکم، بەلام ئەو لە منیش خراترە. خێزانەکەی بریتییە لە ژنێکو سێ منداڵ، گەورەکەیان کوڕێکە دەقاو دەق لە بابی دەچێت، وەکو ئەو باریکو بنێس و نابووتە. ژنەکەی پێدەچێت رۆژێ لە رۆژان جوانکیلە بووبێ، ئێستاش پێوەی دیارە، وەك دەڵێن مزگەوت رووخاوە، لێ میحرابی ماوە. ئەم ژنە داماوە هێندە شڕپۆشو شڕۆڵەبە پیاو بەزەیی پێیدا دێتەوە. وەکو بیستوومە پارەیەکیان لە خاوەن ماڵەکە قەرز کردووە، وئەویش زۆریان دەگەڵدا توندە، رەفتاروبەرخوردی لەگەڵیاندا نا دۆستانەیە. وەکو بیستوومە گورشیکوف هەندێ گیروگرفتی هەن کە بوونەتە مایەی بێکاری ئەو...

مەسەلەکە شکاتو شکاتکاریو پەیگیری دادڤانیە، پێدەچێت تەحقیقی کارگێڕی لەسەر بێ، ئیدی من نازانم. بەلام دەتوانم بێ چەندو چوون ئەمە بڵێم کە هەژارن —خودایا چەند هەژارن!

ژوورەکەیان هەمیشە کپوکپە، ئەوەندە کپو بێدەنگە لە تۆ وایە کەسی تێدا ناژی. تەنانەت منالەکانیش دەنگیان لێوە نایەت، گوێت لە دەنگیان نابێت. هەرگیز نابینی ئەم منالانە هەراو زەناو راکەراك بکەن، وئەوەش نیشانەیەکی خراپە.

به رێکەوت ئێوارەیەك به بەر دەرگای ژوورەکەیاندا رەت بووم. ماڵەکەمان بە پێچەوانەی هەموو کاتێکەوە کپو بێدەنگ بوو، گوێم لە ئاهوناڵە، گریانێکی کپ بوو، ئەوجا بوو بە هەنسكو چیە، ئەمجار بووەوە بە گریان. دەتگوت هەموویان لە ژوورەوە دەگرین، بەڵام بە دەنگێکی نزمو بەزەیی ئەنگێزی ئەوتۆ کە جەرگو دڵم لە سوێدا بوو بە بریان، ویە درێژایی شەوەکە دیمەنو وێنەی ئەو کڵۆڵانە بەرۆکی خەیاڵی بەر نەدامو نەمتوانی وەکو پێویست بخەوم.ئیدی بە دوعا دۆستە ئازیزەکەم، قشتیلەکەم ڤارینکا! بەپێی توانا ژیانی خۆم بۆ باس کردوویت. بە درێژایی رۆژەکە جگە لە تۆ بیرم لە هیچ نەکردووەتەوە.

دڵم بۆ وەزعی تۆ ژان دەکات **ئازیزەکەم**.حەیاتەکەم من دەزانم کە پلتۆیەکی گەرمت نیە لەبەری بکەی. ئاخ لە دەستی بەهاری پوترسبۆرگ!داخ لە دەستی باسریشکی پوترسبۆرگ! ئەمانە من دەکوژن **ڤارینکا**! ئەم کەش و هەوایە، ئەم تۆفو وەیشومەیە تەحەمول ناکرێ، خواوەند لە شەڕی ئەم کەشو هەوایەمان بپارێزێ! حەیاتەکەم، روحەکەم، ئازیزەکەم سەبارەت بە نامەکانم لێم مەگرە کە قەڵەمو ئینشایەکی لاوازو شپرزەو پەرێشانم هەیە. ڤارینکا گیان، شێوازی نووسینم زۆر خراپە، شێوازی نووسینم هەر نیە. خۆزگە تۆزێك فێرە نووسین دەبووم! من هەرچیەکم بە زەینا بێ دەیخەمە سەر کاغەز... و هیچ مەرامێکم نیە تەنیا ئەوە نەبێ کەمێك خەمی تۆ بڕەوێنمەوە.

ئاخ ئەگەر کەمێك خوێنەواریم هەبوایە، هەموو شتێك فەرقی دەکرد. لێ لە کوێ دەمتوانی بخوێنم؟... لەوە هەژارتر بووم کە بتوانم بخوێنم.

*دۆستی هەمیشەیی و نەمەکدارت.. ماکار دیڤوشکین*

*بەڕێزم ئاغای ماکار ئالکسیوڤیچ*

*٤/٢٥*

**ئەمڕۆ** (شاشا)ی دۆتمامم بینی! کە ڕێکەوتێکی ترسناك و ناخۆش بوو! داماوە ئەویش بەرەو پوکانەوەو مردن دەچێت! لە چەند لایەکەوەم زانیوە کە (ئانافیودوروڤنا) هێشتا لێم دەپرسێت و تاقیبم دەکات. پێم وایە بە نیاز نیە دەست لە عەزاب و چەوسانەوەی من هەڵبگرێت. گوایە دەڵێت ئامادەیە بمبورێت، رابردوو وهەموو شتێك لە بیر بکات و بە خۆی بێت بۆ دیدەنیم.

دەڵێت کە تۆ بە هیچ جۆرێ خزمی من نیت، ئەو خزمی نزیکتری منە، و تۆ هەقت نیە دەست لە کاروباری خانەوادەیی ئێمە وەربدەیت و شەرمەزاری و شورەییە بۆ من کە بەخێروکۆمەکی تۆ دەژیم...

پێم دەڵێت کە من چاکەی ئەوم لە بیر کردووە، و دەڵێت ئەو من و **دایکمی** کە خەریك بووە لە برسانا بمرین لە فەوتان و مردن رزگار کردووە، بە درێژایی دوو ساڵ و نیو داڵدەی داوین و نانی داوین و خۆی لە پێناری ئێمەدا ماندوو کردووەو سەرپەرشتی کردووین، و هەروەها چاوپۆشی لەو پارەیەش کردووە کە قەرزاری بووین. و تاقە قسەیەکی خێری دەرهەق بە دایکم نەگوتووە!

ئاخ ئەگەر دایکە **گۆڵەکەم** دەیزانی ئەمانە چییان پێکردوم!... (ئانا فیودوروڤنا دەڵێت من لەبەر گەوجیەتی خۆم لەئەم لە بەختی خۆم داوەو پێشوازیم لەو بەختەوەریە نەکردووە کە بە پیرمەوە هاتووە، و ئەو

ڕێگەیەکی دروستی پێ نیشانداوم،و هیچ تەخسیرێکی لە ڕووداوەکانی دواتر نەبووە، ومن بە خۆم نەمتوانیوە یان نەمویستووە شەرەفی خۆم بپارێزمو بەرگری لێبکەم.

خودایا ئەدی کێ تەخسیرکارە، کێ تاوانبار بووە؟ دەڵێت بیکوف هیچ خەتایەکی نیە، لەسەر هەقە، هیچ پیاوێك ناچێت لەگەڵ یەکەم ژنێکا کە....

زەماوەند بکات. جا بۆچی ئەمانەت بۆ بنووسم؟ زۆر ئەستەمە بنیادەم گوێی لەم تۆمەتو بوختانانە بێ، ماکار ئالکسیوڤیچ!

من نازانم **ئێستا** چ بەڵایەکم بەسەردا دێت.

لە ترسا ئازام دەلەرزێ، دەگریمو دەلۆرێنم. ئەم نامەیەم بە دوو دانە سەعات بۆ تۆ نووسیوە. وام هزردەکرد کە ئەم ژنە بە لای کەمەوە ئیعتراف بەو هەڵەو خەتایانە دەکات کە دەرهەق بە من کردوونی، کەچی لە جیاتی ئەوە چۆن رەفتار دەکات! جا توبی ئەو خوایە نیگەران مەبە، خۆت عەزاب مەدە **هاوڕێکەم**، ئەی تاقە هاوڕێی دڵسۆزم! فیدورا عادەتیەتی شت گەورە دەکاتەوە:

من نەخۆش نیم، دوێنێ کە بۆ ڕێوڕەسمی یادی مەرگی دایکم چووم بۆ ڤولکوڤۆ، کەمێك سەرمام بوو و تووشی پەسیوو بووم. بەڕاست بۆ لەگەڵما نەهاتی؟ خۆ پێم گوتبووی حەز دەکەم لەگەڵما بێی. ئاخ دایکە، دایکە کلۆڵەکەم، خۆزیا دەتتوانی لە گۆڕەکەت بێیتە دەرێ و دەتبینی چییان لێکردووم!...

ف. د.

***ئازیزەکەم ڤارینکا!*** ***٥/٢٠***

وا چەند **هێشووە** ترێیەکت بۆ دەنێرم.

دەڵێن خواردنی ترێ بۆ کەسێك تازە لە نەخۆشی هەستا بێتەوە باشە، دکتۆران بۆ شکاندنی تینویەتی بۆ نەخۆشانی دەنووسن، جا تۆ تەنیا بۆ شکاندنی تینویەتی بیخۆ، قشتیلەکەم ئەو رۆژە گوتت حەزت لە گوڵە باخە، بۆیە وا چەند چڵێکت بۆ دەنێرم. ئازیزەکەم حەز لە خواردن دەکەی، ئیشتیات هەیە؟

ئەمە زۆر زەروریە. بە هەر حاڵ سوپاس بۆ خوا کە نەخۆشیەکەت تەواو بوو، وخەمو پەژارەمان بەرەو تەواو بوونی یەکجارەکی دەچێت. هەقە هەر شوکرانەبژێری بەر دەرگاری **خوا** بین!

سەبارەت بە کتێبەکان، تا ئێستا هیچیانم بۆ پەیدا نەکراوە. دەڵێن لەم ماڵەی ئێمەدا کتێبێکی باش هەیەو بە شێوازێکی بەرزو جوان نووسراوە، گوایە کتێبێکی زۆر خۆشە، من خۆم نەم خوێندووەتەوە، بەڵام لێرە هەموو هەر تاریفی دەکەن، قەولیان داوە کە بۆمی بنێرن.

بەڵام دەی خوێنیتەوە؟ چونکە تۆ لەم جۆرە شتانەدا بە ئاسانی نایەیتە رەدا، یانی رازیکردنی زەوقو سەلیقەی تۆ ئاسان نیە. من دەزانم **قشتیلەکەم** تۆ کتێبی شیعرت دەوێن، ئاهو ناڵەی ئاشقانو غەزەلت گەرەکە– زۆر چاکە، بەدڵی تۆ دەکەم، کتێبی شیعرت بۆ پەیدا دەکەم، هەرچیت گەرەك بێ بۆتی پەیدا دەکەم، لە شوێنێك دا دەفتەرێکم بینی پڕە لە چامەو مۆزان.

سەبارەت بە خۆم، تەندروستیم باشە، تکایە نیگەرانی من مەبە، خەمی منت نەبێت.باوەڕ بە فیدورا مەکە، هەرچیەکی سەبارەت بەمن بۆ گێڕاویتەوە راست نیە، پێی بڵێ درۆت کرد، بوختانی بۆ دەکەی...من هەرگیز بە بیرما نەهاتووە پاڵتۆ تازەکەم بفرۆشم، ئاخر تۆ خۆت حوکم بدە، بۆچی دەبێ کاری وا بکەم؟

وەکو دەڵێن بەو **زووانە** بڕی چل رۆبڵ پاداشتم دەدەنێ، ئیدی بۆ دەبێ بچم پاڵتۆکەم بفرۆشم؟ گوێ بەم قسانە مەدە، نیگەران مەبە قشتیلەکەم، فیدورا جێی باوەڕ نیە، زۆر رەش بینە، هەموو شتێك بە رەشبینی دەبینێ.کاروبارمان زۆر باش دەبێت کۆترەکەم! هەر بەو مەرجەی تۆ زوو چاك ببیتەوە، دەبێ بە زووترین کات چاك ببیتەوە، گوێت لێمە **فریشتەکەم**، نابێ ئەم پیرەمێردە خەفەتبار بکەی.

کێ پێی گوتوویت من لاواز بووم؟ درۆیە،ئەمە بوختانە،تەندروستیم زۆر چاکە،وئەوەندە قەڵەوبووم شەرم لە خۆم دەکەم، هەر کاتێ برسیم بێ تێرو پڕ دەخۆم، زۆر شادو بە کەیفم، لە هیچم کەم نیە، تاقە شتێ کە پێم لازم بێ ئەوەیە کە تۆ چاك بیتەوە! جارێ خودا حافیز فریشتە چکۆلەکەم، یەك بە یەکی قامکە چکۆلەکانت ماچ دەکەم.

*دۆستی هەمیشەیی و دڵسۆزت*

*ماکار دیوفشکین*

پەراوێز:

ئام، **ئازیزەکەم** ئەمە چییە دووبارە بۆت نووسیومەتەوە؟.... ئەوە شێتییە ئازیزەکەم؟ چۆن بیر لەمە دەکەیتەوە؟ ئاخر چۆن دەتوانم بە بەردەوامی بێمە دیدەنیت فریشتەکەم، چۆن؟ لە خۆت دەپرسم. لەوەیە بتوانم شەو بە تاریکی، تا کەس نەمبینێ بێمە دیدەنیت، بەلام لەم وەرزەدا کوا شەو، دنیا کەمتر تاریک دەبێت.. دەزانی فریشتە **چکۆلەکەم** بە درێژایی ئەو کاتەی نەخۆش بووی هەر بە دیارتەوە بووم و بەجێم نەهێشتووی، بەتایبەتی ئەو کاتەی بێهۆش بووی، تا ئێستاش نازانم چۆن توانیم ئەم کارە بکەم. پاشان وام بە باش زانی نەیەمە دیدەنیت، چونکە خەڵکی کەوتبوونە مقۆمقۆو قسەو باسان. تەنانەت لە پاشملەشمان هەندێ قسان **دەکەن**. من باوەڕم بە تێریزا هەیە، چونکە کەسێکی سرقایم و نهێنی پارێزە. بەلام من خۆم خۆت دەکەم بە حەکەم فریشتەکەم، ئەگەر ڕۆژێ بێت و هەموو شتێك دەربارەی پەیوەندی ئێمە بزانن چ روو دەدات؟ چ بیرێك دەکەنەوەو چ دەڵێن؟ کەواتە ورەت بەرز بێ ئازیزەکەم، خۆت ڕاگرە تا دووبارە چاك دەبیتەوە، هەنگێ تەگبیرێك دەکەین و لە دەرێی ماڵەکە یەکدی دەبینین.

**

*ئازیزترین ئازیزم، ماکار ئالکسیوڤیچ،* ٦/١

**زۆرم** حەز دەکرد لە چاکەی ئەو هەموو زەحمەتەی کە لە پێناوی مندا کێشاوتەو، لە جیاتی ئەو هەموو میهرو مەحەبەت و خۆشەویستییەی دەرهەق بە من هەتە کارێکی باشی بە دڵی تۆ بکەم، تا سەرەنجام بڕیارم داو لە ساتێکی بێکاریدا، کۆمەدیەکەم گەڕام و دەفتەری بیرەوەریەکانم دۆزییەوە کە وا بۆ تۆی دەنێرم. ئەمە دەفتەری بیرەوەری سەردەمانێکی خۆشی ژیانی منە.

زۆر جار پرسیاری ژیانی رابردووت، پرسیاری **دایکم**، و پاکرۆفسکی، پرسیاری ئەو زەمانەی کە لە مالّی ئانا فیودورۆڤنا بووم، کردووە، پرسیاری گیروگرفت و کلۆلیەکانی ئەو دواییانەت کردووم، و زۆر بە تاسەوە بووی بۆ خوێندنەوەی ئەم دەفتەری بیرەوەریانە، کە مەگەر هەر خوا بزانێ بۆچی بیرم لەوە کردووەتەوە هەندێ ساتی پچڕ پچڕی ژیانمی تیا تۆمار بکەم، کە دڵنیام بەم دەفتەرچەیە زۆر شادو خۆشحالّ دەبیت و تینویەتیت دەشکێنێ.

**بەلاّم** سەبارەت بەخۆم، خوێندنەوەی زۆری خەمبار کردم، لە تۆ وایە لەو زەمانەوە کە دوا دێڕی ئەم دەفتەرچەیەم نووسیوە تا ئێستا دوو ئەوەندە لە عەمرم رۆیشتووە. ئەو شتانەی لەم دەفتەرەدا تۆمار کراون، لە کاتی جیاوازدا نووسراون، خودا حافیز ماکار ئالکسیوڤنا! ئێستا هەست بە خەمبارییەکی توندو بێزاریەکی ترسناک دەکەم، و بێخەری کالّەم پێدەکات، بە راستی ئەهامەتێکی تاقەتبەرە!

ف. د

**

((١))

**چوارده** سالان بووم که بابم مرد. قۆناغی مندالّیەتیم خۆشترین قۆناغی ژیانم بووه. قۆناغی مندالّیەتیم لێره نەبووه، له شوێنێکی زۆر دوور، له دێهات، له باوەشی سروشت دا دەستی پێکردووه. بابم چاودێری موڵکێکی گەورەی میر (ب) بوو له دەڤەری (ت)، ئێمه له دێیەك له دێیەکانی میردا دەژیاین، ژیانمان لەو دێیەدا **هێدی** و هێمن و خۆش بوو...

من ئەو کاتانه **کچۆلەیەکی** بزێوی لاسار بووم، هەموو کارێکم ئەوه بوو به نێو مەزراو جەنگەڵ و باخەکاندا بسوڕێمەوه. کەس هەقی بەسەرەوه نەبووم.

بابم دایمەی خوا سەرقاڵی کاروکاسبی بوو، ودایکم کاروباری ماڵی له عۆیه بوو. کەس تەعلیمی دانەدەدام، بۆ خۆ ئازادی ئازاد بووم، زۆریش بەوه خۆشحاڵ بووم. هەندێجار زێدەکەوت له بەیانی زووەوه له ماڵ وەدەردەکەوتم و بەرەو ئەستێڵ، یان لێرەواروداڕستان، یان مەزراکان، یان دروێنەوانەکان غارم دەدا، و هیچ گوێم لەوه نەبوو که هەتاوی گەرم دەمسوتێنێ، وترسی ئەوەشم نەبوو که له گوندی دوور بکەومەوه، ڕێگه ون دەکەم، یان دڕکەزی بەلاق و لەتەرما بچەقێ یان جلەکانم بدڕێت. هەڵبەته که بۆ ماڵ دەگەڕامەوه سەرزەنشتیان دەکردم، بەلام گوێم نەدەدایه.

پێم وایه ئەگەر پێویستی کردبا هەر هەموو **تەمەنم** لەو گوندەدا ڕابوێرم و هەرگیز نوو پێم لە ڕێندەر نەچووبا دەرێ و هەر لەوێ مابامەوه بۆڕاستی

شادو بەختەوەر دەبووم، بەڵام ڕێکەوت وابوو کە دەبوایە هەر بە منداڵی ئەو مێرگوزارە جوانەی ژێدم بەجێ بێڵم. دوازدە ساڵان بووم کە بۆ پوترسبۆرگ بارمان کرد. ئێستاش کە بیرم دەکەوێتەوە بە چ خەمو پەژارەیەکەوە خۆمان بۆ سەفەر ئامادە کرد، سوێم دەچێتە دڵەوە!

مەگەر هەر **خوا** بزانێ بەدەم ماڵاواییەوە لە هەموو ئەو شتانەی لە دڵما شیرین بوون، چەند گریام، ئێستاش بیرمە چاو بە گریان خۆم بە گەردنی بابم دا هەڵواسیو تکام لێدەکرد با ماوەیەکی تریش لە گوندی وەمێنین، بابە لێم تووڕە بوو، دایکە دەستی بە گریان کرد، وتێی **گەیانـدم** کە چارمان ناچارەو دەبێ بار بکەینو ئیشو کارەکەی بابە وادەخوازێ. میرە پیرەکە (ب) مرد بوو، میراتگرو هەقداران، ئەو گرێبەستەی نێوان بابەو میریان هەڵوەشاندبوورەوە. تۆزێکمان پارەو پول هەبوو کە بە دەستی هەندێ خەڵکی سانپوترسبۆرگەوە بوو، بابە لای دانا بوون. جا بەو ئومێدەی کە لە گیروگرفتی دارایی بخەلەسین، بابە لێبڕابوو کە باشتر وایە بۆ ئەوێندەر، بۆ پایتەخت بار بکەین. هەموو ئەمانەم لە دایکمەوە زانی، ئیدی لە کەناری ڕوباری نڤا، لە پوترسبۆرگ دا گیرساینەوەو تا مردنی بابم هەر لەوێندەر ماینەوە.

هەرچیم دەکردو دەکۆشا دەگەڵ ژیانی تازەماندا ڕانەدەهاتم، زۆرم بەلاوە زەحمەت بوو!

**پایز** بوو کە بۆ پوترسبۆرگ بارمان کرد، ئەو ڕۆژەی کە گوندەکەمان بەجێهێشت ڕۆژێکی زۆر خۆش بوو، دنیا گەرمو هەتاو بوو، کاری دروێنە بەرەو کۆتایی دەچوو، گیشەی گەورەی گەنم لە خەرمانجاراندا کەڵەکە کرابوو، و پۆلی مەلان بە قاوقیژ بە ئاسماندا دەسوڕانەوە، هەموو شتێك

خۆش‌و گەش بوو، شادی لێ هەڵدەقولا، لێ هەركە هاتینە پوترسبۆرگ ڕووبەڕووی باران‌و تۆف‌و سەرمای پایزو تەم‌ومژو، سیان‌و قوڕو لیتە بووین، ڕووبەڕووی خەڵكانێكی تازە بووینەوە بە هەڵەداوان شەقام‌و جادەكانیان دەبڕی، هەموو گرژو پەست، خەمین‌و توڕە! هەر چۆنێ بوو گیرساینەوە، ئێستاش لە بیرمە هەموومان ناڕەحەت‌وشپرزە لە یەكبینە دەهاتین‌و دەچووین، هەوڵمان دەدا شوێنە تازەكەمان ڕێك بخەین.

بابە لە **ماڵەوە** نەبوو، دایكەش نەیدەپەرژا سەری خۆی بخورێنێ، ومن بە تەواوەتی فەرامۆش كرابووم. بەیانی شەوی یەكەمی ماڵە تازەكەمان بە خەمینی لە خەو رابووم. پەنجەرەكانمان دەیانڕوانیە حەسارێكی زەرد.

شەقامەكە هەمیشە پڕ لە سیان‌و قوڕو لیتە بوو، خەڵكانێكی زۆر كەمی پێوە بوو، وهەمیشە خۆیان لە جل‌و بەرگی گەرمەوە پێچا بوو، چونكە دنیا زۆر سارد بوو. بێزاری‌و بێتاقەتی باڵی بەسەر ماڵەكەماندا كێشا بوو، وگاڵەیان پێدەكردین.

هیچ كەسوكارو خزم‌و ناسیاوێكی نزیكمان نەبوو، باوكە بەینی دەگەڵ (ئانافیودورڤنا)دا باش نەبوو. (بڕێ قەرزی لەسەر باوكە بوو). زۆرجار خەڵكانێك بە كارێكەوە سەریان دەدایـن، **بـەلام** ئەمانە دایمەی خوا لە حاڵی گێنگەشەو مامەڵەو تەرقەشەدا بوون. بابە لە دوای هەر دیدارێكیان، پەست‌و توڕە دەبوو، وبە سەعاتان بە ژوورەكەدا دەهات‌ودەچوو، ڕووی گرژ دەكرد، برۆكانی وێك دێنایەوە، قوڕو قەپی دەكردو زاری لە زاری كەس نەدەگەڕا. لەو كاتانەدا، دایكەش پركێشی نەدەكرد قسەی دەگەڵ بكات‌و زاری كلیل دەدا. منیش كتێبێكم بە دەستەوە دەگرت‌و لە

سووچێکا کزکۆڵەم دەکردو خۆم دەکرد بە مشکی تۆپیوو بچووکترین جوڵەم نەدەکرد تا سەرنجی کەس رانەکێشم.

دوای سێ هەیڤان لە هاتنمان بۆ پوترسبۆرگ ناردیانمە قوتابخانەیەکی **کیژانی** شەوانەڕۆژی. لە سەرەتادا کە کەوتبوومە ناو ئەو غەریبانە هەستم بە ناخۆشیو نامۆییەکی زۆر دەکرد!

هەموو شتێك لەبەر چاوم ساردوسڕو دژمنانە بوو، دادەکانو مامۆستاکان بەردوام هەر هاواریان دەکرد، قوتابیەکان تەشەریان لێدەدامو پێم پێدەکەنین، منیش لەو بەینەدا کێویو لە خۆم غەریبێ. کە شوێنێکی وشكو ناخۆش بوو!

هەموو شتێك لێرەدا تەرتیبو وەختی خۆی هەبوو، خواردن هاویەشو دەستەجەمی بوو، مامۆستاکان وشكو ناخۆش. لە سەرەتاوە هەموو ئەم شتانەم یەجگار لە گیان ناخۆش بوو، مایەی عەزابی روحم بوون. وام لێهات نەمدەتوانی بخەوم. شەو تا بەیانی **دەگریام**،جا شەوانی دووروودرێژو ساردو سڕو تاقەتبەر هەر نەدەبڕانەوە.

ئێواران، کاتێ کچۆڵەکان بە دەنگی بەرز وانەکانیان دەور دەکردەوە یان ئەزبەریان دەکرد، من بە دیار دەرسی زمانی فەرەنسیەوە دادەنیشتم و زاتم نەدەکرد بچووکترین جوڵە بکەمو بیرم بۆ جێیەکی دی دەفڕی، بیرم دەچووەوە بۆ ماڵە چکۆڵەکەمان، بۆ لای بابە، بۆ لای دایکە، بۆ لای پیرەدایەنەکەمو بۆ لای ئەو ئەقڵو حیکایەتە جوانانەی ئەو دەیگێڕانەوە... ئاە، کە هەستم بە خەمباری دەکرد!

جاری واهەبوو ماوەیەکی زۆر بەوپەڕی خۆشەویستی بیرم لە تورەهات ترین شتی ماڵەوە دەکردەوەو زۆر لام شیرین دەبوو. خەونم بە ماڵەوە دەبینی، بیرم دەکردەوە: چەند خۆش دەبوو ئێستا لە ماڵەوە بوایەم!

لە ژووره چکۆڵەکەماندا، لە پاڵی پیره سەماوەر، دەگەڵ کەسوکارەکەمدا دانیشتبام! دایکم ماچ باران کردباو توند توند باوەشم پێیدا کردبا...

ئیدی بەو جۆرە دەچوومە ژێری‌و ئەوجا لە غەریبی دا بەکوڕی دەگریام‌و فرمێسکەکانم دەخواردەوەو نەمدەهێشت دەنگی گریان‌و هەنسکم دەربچێت. ئەو وشانەی فێریشی بوو بووم لە بیرم دەچوونەوە... قەت نەمدەتوانی دەرسی ڕۆژی ئایندە ئامادە بکەم، شەو خەوم بە مامۆستا، دادەکان، و کچۆڵەکانەوە دەبینی، بە درێژایی شەو لە خەوما دەرس‌و وانەکانم دەور دەکردەوە، کەچی بەیانی هیچیم لە بیر نەدەما. سزا دەدرام، لەسەر ئەژنۆیان رایاندەگرتم، تەنیا یەك ژەمە خواردنیان دەدامێ. چەند کچۆڵەیەکی مەلول‌و داماو بووم.

**کچۆڵەکان** (قوتابیەکان) لە سەرەتاوە گاڵتەیان پێدەکردم، کە دەورم دەکردەوە هەوڵیاندەدا بە هەڵەمدا بەرن، کە بە ریز بۆ نان خواردن یان چا خواردنەوە دەڕۆیشتین نوقورچیان لێدەگرتم، بێ ئەوەی هیچ گوناح‌و خەتایەك بکەم لەلای خانم بەڕێوەبەر بۆیان تێدەچاندم‌و شکاتیان لێدەکردم. لەلایەکی ترەوە هەستم بە چ بەهەشتێك دەکرد کاتێ کە شەوی شەموان دایەنەکەم بە دوورما دەهات تا بۆ ماڵم بەرێتەوە! کە باوەشم پێدا دەکرد خەریك بوو لە خۆشیا خەفە ببم...

چەند پیرەژنێکی باش بوو!

جلـەكانی لەبـەر دەكـردم، پێڵاوەكـانی لـە پـێ دەكـردم، جـوان دەی پێچـامەوە تـا سـەرمام نـەبێت، كـە دەكەوتینـە ڕێ لەگـەڵ منـدا دەری نەدەبرد، نەدەتوانی بەپێی مندا بگات، مـن لـە یەكبینـە چـەنەم لێدەداو قسەم بۆ دەكرد، و هەموو شتەكانم یـەك بـە یـەك بـۆ دەگێڕایـەوە. شـادو خۆشحاڵ لەگڵیا دەگەییشتمەوە مـاڵ، و بـە جـۆرێ باوەشـم بـە یـەك بـە یەكی كەسوكارەم دا دەكردو ماچم دەكردن لە تۆ وایە دە دانە ساڵ لێیان دوور بووم. ئیدی قسەو پرسیارو حیكایەت، دەستی پێدەكرد، سـڵاوم لـە هەموویان دەكـرد، تاقـا **پێدەكەنیم**، بـە ژوورەكـەدا رام دەكـرد، هەڵبـەزو دابەزم دەكرد.

بـابم دەربـارەی وانـەكانمو مامۆسـتاكانم پرسـیاری جـددی لێـدەكردم، دەربـارەی ئـەوەی كـە ئـاخۆ لـە زمـانی فەڕەنسـی دا پێشـكەوتووم یـان نا،دەربارەی ڕێزمانی زمانی فەرەنسی (دانانی لۆمۆند)... هـەموومان لـەو جـۆرە ئێوارانـەدا خۆشـحاڵو شـادومان بـووین. ئێسـتاش كـە ئـەو بیرەوەریانەم بیردەكەونەوە، هەست بە خۆشی دەكەم.

ئەوپەڕی هەوڵم دەدا لە دەرسەكانمدا دەریچم تا باوكە **خۆشـحاڵ** بێت. دەمبینی، هـەر چـەندە زۆر دەسـتكورت بـوو، درێغـی لـە مەسـرەفی منـدا نەدەكرد، دوا پولی گیرفانی خەرجی من دەكرد. ڕۆژ بە ڕۆژ گرژترو مـۆنتر دەبوو، بێتاقەتو تـوڕەتر دەبـوو، تەبیعـەتو مجێـزی بـە تـەواوەتی تێك چوو، كاروكاسبیەكی باشی نەبوو، قەرزی زیاتری لەسەر كەڵەكە دەبوو.

دایكە دەترسا بگری، نەیدەوێرا فزە بكات نەبادا باوكە توڕە بكات، ئیدی زۆری نـەبرد نەخۆشـی پێـوە دەركـەوت، ڕۆژ بـە ڕۆژ لاوازتـر دەبـوو ڕەنگ خـراپ دەكـزكی،و بـە ئاشـكرا دیـار بـوو چ دەردێكبیـەتی. جـا كـە لـە

قوتابخانەی شەوانەرۆژیم دەهاتمەوە تا سەردانی کەسوکارم بکەم، روو بە رووی ئـەم سیما غەمگینانـە دەبوومـەوە، دایکم ئارامو بـە ئەسپایی بۆ خۆی دەگریا، و بابم تورەو ترۆ بوو.

ئیدی سەرزەنشتو گازاندە دەستی پێدەکرد. بـابم دەی بۆلاند کـە مـن نەبووم بە مایەی دڵخۆشیو تەسەلای ئەو، دەیگوت ئەوان، دایەو بابە، لـە بەرخاتری ئەو، هەر بۆ ئەوەی بخوێنیو فێر بیّ، خۆیـان لـە بچووکترین شت بێبەش کردووە، کەچی من فێری ئـەوە نـەبووم بـە فەرەنسـی قسـان بکەم!

بە کورتیەکەی خەتای هەموو شکستو نەگبەتیەکانی خۆی بە ملی منو دایکەدا دەدا. نازانم چۆن دەیتوانی ئەو هەموو عەزابەی دایکم بدات؟ کـە هەندێجار دەمڕوانییە سیمای دایکم دڵم بۆی دەهاتە ژانو سویّ: گوناکانی سیس بوو بوون، چاوەکانی بـە قـولا چـوو بـوون، ودەموچـاوی رەنگـی سیلداری لیّ نیشتبوو.

بابە منی لە هەمووان زیاتر سەرزەنشت دەکردو بـە خـەتاباری دەزانـیم. هەرەڵجار لە شتی بچووکەوە دەستی پێدەکردو پاشـان خـوا دەیزانـی بـە چی کۆتایی دەهاتو دەبڕایەوە، هەندێجار نەمدەزانی چ شتێك ئەوەنـدەی نوڕە دەکرد، خەتاباریم چی بوو؟ دەیگوت من ناتوانم بە فەرەنسـی قسـە بکەم.

فەرەنســـی فێـــر نـــابم، کەڵلـــە پـــوچو گـــەوجم، خـــانم، بەرێوەبـــەری قوتابخانەکەمان گەوجە و گویّ بـە تـەریێت و پـەروەردەمان نـادات، ئـەو، واتە بابە لە کار دەگەرێتو کاری دەست ناکەویّ، و کتێبی رێزمان (دانانی لومۆند) بە کەڵك نایەت، و کتێبەکەی زابولسکی زۆر لەو باشترە،و وئـەوان

(ماڵباتەکە) بە خۆڕایی ئەو هەموو مەسرەفەیان لە خوێندنی من کرد بوو، و من کیژێکی بێ هەستم، و دڵم لە بەرد رەقترە... بەڕاستیش من ئەوپەڕی هەوڵم دەدا لە دەرسەکانمدا باش بم و زمانەکە فێر ببم، کەچی باوکە هەر منی بە سەرچاوەی هەموو کڵۆڵی و بەدبەختییەکانی خێزانەکە دەزانی!

هەموو خەتاکانی دەخستە ملی من! بەڵام ئەمانە بەو مانایە نەبوون کە بابم منی خۆش نەدەویست: هەم دایکەو هەم منی زۆر خۆش دەویست، لە پێناوی ئێمەدا دەژیا.

بەڵام ئیدی ئەو بەڵایەی بەسەر هاتبوو!

نیگەرانی و خەم و پەژارەو شکست باوکەی داماویان لە رادەبەدەر عەزاب دەدا، بەرە بەرە تووشی بەدگومانی و واز وازی بوو، زوو تووڕە دەبوو، زۆر جا دەگەییە ئەوپەڕی نائومێدی.

وای لێهات سەلامەتی و تەندروستی خۆیشی پشت گوێ دەخست، رۆژێك سەرمای بوو، ولە پڕ نەخۆش کەوت و لە جێدا کەوت، نەخۆشیەکەی درێژەی نەکێشا، هێندە لە پڕو لە ناکاودا مرد کە تا چەندین رۆژ لە سرێنیاندا گێژو کاس **ئاگامان** لە خۆ نەبوو، دایکە بە جۆرێ تاسا بوو، ترسی ئەوەم لێهاتبوو ئەقڵی تێك چوو بێت.

هەر کە باوکە مرد، ئیدی سەرو کەللەی خاوەن قەرزان پەیدا بوو، دەتگوت لە عاردیەوە هەڵدەقوڵێن، وەکو سێڵاو، بە کۆمەڵ بە سەرماندا دەڕژان، ناچار بووین دارو ئەدارمان بەوان بدەین، **ناچار** بووین خانووە چکۆلەکەشمان، کە بابم بە شەش مانگێك پاش بارکردنمان بۆ پوترسبۆرگ، لە ئەراخ رووباری نڤا کڕی بووی، بفرۆشین. ئیدی نازانم

چۆن تـەگبیری کاروبارەکـانی ترمـان کـرد، بـەڵام بـێ سـوکنەو بـێ مـەئوا مابنەوە، تەنانەت نانی رۆژانەمان نەبوو، دایکم زۆر نـەخۆش بـوو، رۆژ بـە رۆژ کەسیرەتر دەبوو، مەحاڵ بوو خواردنێکی باشـی بـدەینێ تـا گـورێکی وەبەردا بێتەوەو نەمرێ، شتێکمان نەبوو لە برسیەتی رزگارمان بکات...

دنیامان لێ بوو بووە **دۆزەخ**. من تازە پـێم نـابووە چـواردە سـاڵیەوە، لەو کاتەدا بوو، کە ئانافیودوروڤنا هاتە دیدەنیمان، بەردەوام دەیگوت کە ئەو موڵکی هەیـەو خزمایـەتی لەگـەڵمان هەیـە. دایکـەش دەیگـوت راسـتە ئانافیودوروڤنـا خزممانـە، بـەڵام خزمێکـی دوور. تـا بابـە لـە ژیانـا بـوو، ئانافیودوروڤنا هەرگیز سەردانی نەکرد بووین.

**بـــەڵام** کـە ئێسـتا هـاتبوو، چـاوانی تـەژی رونـدك بـوون، و گـوتی زۆر پەرۆش و خـەمباری ئێمەیـە، شـەریك و هاوبەشـی خـەم و وەزعـی ناڵـەباری ئێمەیـە، و هـەروەها گـوتی گوایـە بـاوکم سـەبەبکاری هـەموو ئـەو وەزعـە بووە:

دەبویست **لە** ئاستێکی باڵاتر لە دەرامەتی خۆی بژی، بە راست و بە چەپا قەرزی کردبوو، و لە رادەبـەدەر بـاوەڕی بـە توانـاو هێـزی تایبـەتی خـۆی هەبووە. گوتی زۆر حـەز دەکـات زیـاترو باشـترمان بناسـێت، و پێشـنیازی کرد کە کۆنە زامان لەبیر بکـەین، کـاتێ دایکـە پێـی گـوت کـە هـیچ کـاتێ هەستی خراپ و دژمنانەی بەرانبەر بەو نەبووە، هەنگێ ئانـا فیـدوروڤنا بـە دەستەسڕەکەی فرمێسـکەکانی سـڕی، ئەوسـا دایکـەی دەگـەڵ خـۆدا بـۆ کڵێسا بردو ئەوسا رای سپارد کە رێورەسمێکی ئەزیەتباری و نوێژ بـۆ ئـەو ((پیاوە ئازیزە)) بگێڕن (هەر بە شێوەیە نێوی باوکەی دەبرد).

ئیدی بەو شێوە پڕ ویقارو رێزە دەگەڵ دایکم دا ئاشت بووەوە.

ئانــا فیودورۆڤنــا، دوای وەعــزو ئیرشــادێکی زۆر، و دوای زنجیرەیــەك راوبۆچــوون و ئامۆژگــاری، وەزعو حــاڵی خــراپو نالــەباری ئێمــەی بــۆ بەرجەســتە کــردین، وەزعو حــاڵی بــێ سەرپەرشــتمان، وەزعو حــاڵی پــڕ نائومێدیو لە چارە نەهاتوومانی هێنایە بەرچاو، ئەوسا خــوڵکی کــردین خۆی گوتەنی بچینە لای ئەوو لە ماڵی ئــەودا بمێنینــەوە. دایکــە سوپاســی کرد، بەڵام تا ماوەیــەکی زۆر هــەر دوو دڵ بــوو، نەیــدەتوانی بڕیــار بــدات، بەڵام هیچ چارەیەکی تر نەبوو، و ئەمە تاقە چارە بــوو، ســەرەنجام گوتی بە مەمنونیەوە پێشنیازەکەی ئانا فیودورۆڤنا قەبووڵ دەکەین.

**هێشتاش** ئەو بەیانیەم لە بیرە کە لە کەناری پوترسبۆرگەوە بــۆ گــەڕەكو دوڕگەی ڤاسیلیوڤسکی گواستمانەوە، بەیانیەکی پایزی هەتاوی زۆر سارد بوو.

دایکــم دەگریــا،و مــن هەســتم بــە خەمباریــەکی ترســناك دەکــرد، هەســتم دەکرد دڵم خەریکە شەق دەبات... بەڕاستی ڕۆژگارێکی خەمناكو ترسناك بوو.

((٢))

لــــە هەروەڵــەوە، کــە هێشــتا مــنو دایکــم دەگــەڵ ئــەم ماڵــە تازەیەمانــدا ڕانەهاتبووین، هەردووکمان ژیانمان لەلای ئاناڤیودورۆڤنا، بە ئــەزموونێکی غــەریبو هەنــدێ نــاخۆشو خــەمناك دەبــینی. ئاناڤیودورۆڤنــا، لــە خانووەکەدا کە هی خۆی بوو لە ریزی شەشەمدا دەژیا. خانووەکــە بــریتی بوو لە پێنج ژوور، ئاناڤیودورۆڤناو ساشای دۆتمامی من لە سێ ژووریانــدا بوون.

ساشا کچۆڵەیەکی هەتیوی بێ داک و باب بوو، وئانافیودوروڤنا هێنابویە لای خۆی و بە خێو دەکرد. **ئێمەش** لە ژووری چوارەمدا دەژیاین، ژوورەکەی دی کە بە تەنیشت ژوورەکەی ئێمەوە بوو، بە کرێ بوو، ئانافیودوروڤنا بە کرێ دابووی بە خوێندکارێکی (قوتابی زانکۆ) هەژار بە نێوی پاکرۆفسکی. ئانافیودوروڤنا خۆش دەژیا، وەزع و حاڵی لەوە باشتر بوو کە ئێمە وێنامان دەکرد، بەڵام سەرچاوەی دارایی ئانافیودوروڤنا خۆیا نەبوو وەکو هەر هەموو ئەو کارانەی تری کە هەمیشە مژوڵ و سەرقاڵیان بوو، بەردەوام لە هاتوچۆدا بوو، رۆژی چەندین جار بە گالیسکە یان بە پیادە لە ماڵ وەدەردەکەوت. بەڵام چیدەکردو خەریکی چی بوو، **هەرگیز** نەمزانی و سەرم لێی دەرنەکرد. ئاشنایانی زۆرو هەمەجۆری هەبوو. خەڵکانێکی زۆر دەهاتنە نیدەنی، مەگەر هەر خوا بزانێ چ کەسانێك بوون، وهەمیشە بۆ کار دەهاتن و تەنیا یەك دوو دەقیقە گیر دەبوون.

هەر کاتێ زەنگی دەرگای حەوشە لێی دابا **دایکە** دەیبردمە ژوورەکەمانەوە. ئانافیدوروڤنا هەمیشە لەم کارەی دایکە پەست و تورە دەبوو، وهەمیشە دەیگوت ئێمە زۆر مەغرورین، لە وەزع و حاڵی خۆمان مەغروورترین، و ئەگەر شتێکیشمان هەبووایە پێوە بنازین هەر نەیسە، ئیدی بە سەعاتان لەم جۆرە قسانەی دەکردو زاری لێك نەدەدنا. ئەو کاتانە لەم گلەیی و تۆمەتی مەغروور بوونە حاڵی نەدەبووم، بەڵام ئەمرۆ تێی دەگەم، یان بەلای کەمەوە دەتوانم مەزەندەی ئەوە لێ بدەم کە بۆچی دایکم بەر لەوەی رازی بێ بچینە لای ئانافیدوروڤنا نەیدەتوانی

بڕیار بداتو ئەوەندە دوو دڵ بوو. ئانافیدوروڤنا ژنێکی خراپ بوو، هەمیشە ئازاری دەداین.

تا ئێستاش من لەو نهێنییە تێنەگەیشتم کە بۆچی خوڵکی کردین کە بڕۆین لای ئەو بژین. لە هەوەڵەوە تا رادەیەك لەگەڵماندا باش بوو، لێ پاشان کە زانی بێ دەرەتانو داماوینو هیچ شوێنێ شك نابەین کە بڕۆین، هەنگێ سیمای راستەقینەی خۆی ئاشکرا کرد. پاشان لەگەڵ مندا زۆر نەرمو میهرەبان بوو، بەڵام میهرەبانیەکی سواوی ریا ئامێز بوو. لە هەوەڵەوە منیش وەکو دایکم ئازارو عەزابێکی زۆرم کێشا.

ئانافیدوروڤنا **هەمیشە** تانەی لێدەداین، برینداری دەکردین، لە هەموو بۆنەیەکدا منەتی ئەوەی بەسەرا دەکردین کە چاکەی لەگەڵماندا کردووە، بەزەیی پێماندا هاتووەتەوە. کە بە **غەریبەو** بێگانانی دەناساندین دەیگوت کە ئێمە خزمانی هەژارو بێ دالدەی ئەوین:

بێوەژنێکی داماوو کچۆڵەیەکی هەتیو کە لە رووی بەزەیی ئینسانیو لە رای مەسیح دا لە ماڵەکەیدا پەنای داون. لەسەر خوانی نان خواردن پارووەکانی دەژماردین، ئەگەر نانیشمان نەخواردبا. هەر لە تەشەری خۆی نەدەکەوت:

دەیگوت لە هەنبەر ئەو خوڵکەدا کە دەمانکات، لووتو پووت دەکەینو خواردنەکەی ئەومان بە دڵ نیەو بە شایستەی خۆمانی نازانینو ناشوکری دەکەین، دەیگوت: "نانوانێ جگە لەوەی هەیەتی شتێکی نرمان دەرخوارد بدات، بە خۆیشی خۆزی خوازە خواردنی باشتر بخوات".

هەمیشە رەخنەی لە بابە دەگرت، **دەیگوت** خۆی لە خەڵکی تر بە زیاتر زانیوە، ویستویەتی لە خەڵکی باشتر بێت، بۆیە خوا لە باڵی داوە، ژنو

منداڵەکەی بێ هیچ دەرامەتێك ماونەتەوە، خۆ ئەگەر بەخت یاریان نەباو ئەم ژنە، ئەم خزمە چاکە کارو میهرەبان‌و دڵاوا مەسیحی روحە فریامان نەکەوتبا، تا ئێستا لە سوچی شەقامێکا لە برسا مردبوون... جا چ قسەیەکی نەدەکرد!

قسەکانی چەند بە ئازار بوون ئەوەندەش قێزەون بوون. دایکە هەمیشەی خوا دەگریا، تەندروستی رۆژ بە رۆژ خراپتر دەبوو.

دیار بوو کە بەرەو توانەوەو فەوتان دەچوو، سەرباری ئەمەش هەردووکمان لە بەیانیەوە تا ئێواریێ کارمان دەکرد، لە دەرزیی ماڵەوە تاقیبی تەقەڵ و درومانمان دەکرد،خەیاتانمان رادەسپارد درومانمان بدەنێ ، ئەمە هەرگیز بە دڵی ئانافیودوروڤنا نەبوو، هەمیشە دەیگوت خۆ ماڵەکەی پیشانگای جل‌و بەرگ نیە.

بەڵام خۆ دەبوایە شتێکمان هەبوایە لەبەری بکەین، دەبوایە پارەو پولێکمان بۆ رۆژانی رەش، بۆ تەنگانەیەکی لەناکاو پاشەکەوت بکردایە، خۆ دەبوایە پارەیەکی خۆمان هەبێت، ئیدی بە گوێرەی توانا پاشەکەوتمان دەکرد، بەو ئومێدەی رۆژێ لە رۆژان بتوانین لێرە بار بکەین‌و لە شوێنێکی تردا بگیرسێینەوە.

بەڵام دایکە بەم کارە زیاتر کەسیرە دەبوو، رۆژ بە رۆژ لاوازتر دەبوو: نەخۆشیەکەی وەکو خۆرە دەیخواردو خێراتر بەرەو گۆڕی دەبرد. هەموو ئەمانەم دەبینی، هەستم پێدەکرد، پێیانەوە دەتلامەوەو ئازارم دەچەشت!

هەر هەموو ئەمانە بە بەرچاوما رەت دەبوون! روویان دەدا! رۆژان تێدەپەڕین، هەموو رۆژەکان کۆپی یەکتر بوون. لە گۆشەگیرییەکی

تــەواودا دەژیــاین، دەتگــوت لــە شــار دابــڕاوین، بەشــێك لــە شــار نــین.
ئانافیودورۆڤنا کە هەستی کرد دەسەلاتداری تەواوەو کەس هـەڤڕکی نیـە، هەندێ هێور بووەوە.

کەس زاتی نەدەکرد لە رووی دا بوەستێ.

راڕەوێك ژوورەکەی **ئێمــەی** لـە ژوورەکـانی ئـەو جیـا دەکـردەوە، وەکـو پێشتر گوتم پوکروفسکی لە ژوورەکەی تەنیشت ئێمە دەژیا.

پوکروفسکی دەرسی فەرەنسیو ئەڵمانیو مێژوو و جوگرافیـای بـە ساشـا دەوتەوە، ئانافیدورۆڤنا گوتەنی "هەموو زانستەکان"ی پــێ دەگوتــەوە،و لە بری ئەوە کرێیان لێ نەدەسەندو خواردنیان بە خۆڕایی دەدایە. ساشـا هەر چەندە لاسارو بزێو بوو، بەلام کیژۆڵەیەکی زۆر زرینگ بوو...

ئەو کاتانە سیانزە سالان بوو. رۆژێك ئانافیدورۆڤنا بە دایکەی گوتبـوو وا چاکە منـیش لای پوکروفسـکی بخـوێنم، چـونکە ئـەوەی لـە قوتابخانـەی شـەوانەرۆژی خوێنــد بــووم، کــەم بــوو. دایکــەش بــە خۆشــیەوە قــەبوڵی کردبــوو، یــەك ســاڵی خشــت دەگــەڵ ساشــادا لای پوکروفســکی دەرســم خوێند. پوکروفسکی گەنجێکی زۆر هەژار بوو.

**گەسێکی** نەخۆشو لەش بە بار بـوو، بۆیـە نەیـدەتوانی بـە بـەردەوامیو رێكو پێکی لەسەر خوێندن بەردەوام بێ، کە پێمان دەگـوت "خوێنـدکار" هەر لەبەر ئەوە بوو دەممان لەسەرئەو ناوە راهاتبوو، ژیانێکی هـەژارانـەی گۆشەگیرانەی کپوکپ دەژیا، قەت دەنگێك لە ژوورەکەیەوە نەدەهات.

رواڵەتێکی هەندێ سەیرو غەریبی هـەبوو، زۆر خـوارو خـێچ رێـی دەکـرد، سـاردو سـڕ سـلاوی دەکرد، زۆریـش شـەرمن بـوو، هێنـدە سـەیر قسـەی

دەکرد کە من لە سەرەتادا گەر سەیرم کردبا نەمدەتوانی جڵەوی پێکەنینی خۆ بگرم.

ساشا، **هەمیشە** سەری دەکردە سەری‌و پێی رادەبوارد، بەتایبەتی ئەو کاتانەی کە دەرسی دەوتەوە. لەگەڵ ئەمەشا یەجگار هەستیار بوو، خراپ هەڵدەچوو، زوو زویر دەبوو، تورە دەبوو، لەسەر بچووکترین شت تورە دەبوو، وجڵەوی خۆی لە دەست دەداو هاواری بەسەرماندا دەکردو لە لای کەسوکارەکەمان شکاتی لێدەکردین، دەرسەکەی بە نیوەچڵی بەجێدەهێشت‌و دەخزیە ژوورەکەی خۆیەوە. بەڵام ئەگەر کەیفی قنج بوایە، دادەنیشت‌و رۆژ تا ئێواریٚ سەری بەسەر کتێباندا شۆڕ دەکردەوەو خەریکی خوێندنەوە دەبوو.

کتێبێکی زۆری هەبوون، جا کتێبی گرانبەهاو دەگمەن‌و نایاب. لە چەند شوێنێکی تریشدا بە پارە دەرسی **دەگوتەوە**، هەرکە کرێکەی وەردەگرت، خێرا دەچووە دەرێ‌و کتێبانی دەکڕی، بە تێپەڕ بوونی رۆژ لە نزیکترەوەو باشترو زیاترم ناسی، تا بڵێی میهرەبان‌و بەڕێز بوو، لە عەمراتما کەسی لەو باشترم نەبینی بوو. دایکم زۆری رێز دەگرت، سەرەنجام هەڵبەتە لە دوای دایکم — بوو بە باشترین دۆست‌و هاوڕێم.

هەرەڵجار، هەرچەندە بوو بووم بە **کیژێکی** گەورەو تەواو، گویٚ بە گوێی ساشا هەر بۆ کەیف تورەم دەکرد. هەندێجار، من‌و ساشای دۆتمام، بە سەعاتان پێکەوە دادەنیشتین‌و بیرمان دەخستە کار تا رێگەیەك بدۆزینەوە کە بە پۆکروفسکی رابوێرین‌و دەهری‌و تورەی بکەین. کاتێ کە تورە دەبوو بەڕاستی پێکەنیناوی دەبوو، و ئەمەمان زۆر بەلاوە خۆش بوو.

(ئێستا کە بیرم دەکەوێتەوە بە ڕاستی شەرمەزار دەبم). جارێکیان لەسەر بابەتێك هێندەمان سەر کردە سەری چاوانی تەژی ڕۆندك بوون، خەریك بوو بگری، بە ئاشکرا گوێمان لێبوو لە بن لێوانەوە دەیگوت "منداڵانی لاسار".

کە گوێم لەو قسەیەی بوو تەریق بوومەوە، هەستم بە شەرمەزاری کرد، دڵم گوشراو بەزەییم پێدا هاتەوە. بیرم دێت کە دەمو چاوم سوور هەڵگەڕا، بە چاوانی پڕ **فرمێسکەوە** لێی پاڕامەوە کە زویر نەبێتو سوعبەتو لاساریە قۆڕەکانمان بە هەند نەگرێ، بەڵام ئەو کتێبەکەی داخستو دەرسەکەی بە نیوەچڵی بەجێهێشتو خۆی بە ژوورەکەیدا کرد. بە درێژایی ئەو ڕۆژە بەدەم عەزابی پەشیمانییەوە تلامەوە. کە بیرم لەوە دەکردەوە ئێمەی منالّ، بە ڕەفتاری زبری خۆمان ئەومان گەیاند بووە رادەی گریان، زۆرم بەلاوە گران بوو. یانی چاوەڕوانی ئەو فرمێسکانە بووین...

بە تەما بووین ئەو فرمێسکانە ببینین... ئەوەمان دەویست، ئاخریەکەی توانی بوومان توڕەی بکەین، جڵەوی سەبری لە دەست دەربێنین، یانی ناچارمان کردبوو، ئەم پیاوە هەژارە کلۆڵەمان ناچار کرد کە ڕۆژگاری ڕەشی خۆی بیر بکەوێتەوە. بە درێژایی شەو لە داخو خەفەتو نیگەرانی و پەشیمانیدا خەرم لێنەکەوت. دەڵێن عەزابی ویژدانو پەشیمانی سوکنایی بە روح، و دڵو دەروون دەبەخشێت..

وانیە، بە پێچەوانەوە، **نازانم** چۆن... سەرباری ئەم نیگەرانیەم هەستم دەکرد غروورم بریندار کرا بوو. لەبەرم گران بوو بە چاوی منداڵێك تەماشام بکات، من ئەو کاتانە پانزە ساڵان بووم، لەو ڕۆژە بە دواوە بە

خەیاڵ خۆم ئەشکەنجە دەدا، هەزاران جۆرە نەخشەم دەکێشا تا نۆڕینی پوکروفسکی سەبارەت بە خۆم بگۆڕم. بەڵام تازە گیرۆدەی شەرمو شورەییەکی بە درێژا بوو بووم:

بەو وەزعو حاڵەمەوە **هیچ** کارێکم لە دەست نەدەهاتو تەنیا خۆم بە دنیای خەونو خەیاڵان دەسپارد (و هەر خوا دەزانێ چ خەیاڵاتێکم لێدەدا!) بەڵام چیتر شان بە شانی ساشا گاڵتەم پێنەدەکرد. پوکروفسکی-ش ئیتر لە دەستمان قەڵس نەدەبوو، لێ ئەمە ئەو غرووورەی منی رازی نەدەکرد. جا ئێستا پێویستە چەند وشەیەك سەبارەت بە غەریبترینو عەجیبترینو کلۆڵترین کەسێك کە **لە** ژیانما دیتوومە بڵێم.

من ئێستا باسی ئەو دەکەم، واتە رێك لەم کاتەدا کە ئەم بیرەوەریانە دەنووسم باسی ئەو دەکەم. چونکە تا ئێستا بە هیچ جۆرێ گوێم پێ نەدا بوو، و سەرنجی رانەکێشا بووم- بەڵام ئێستا و لە پڕا، هەموو شتێکی پەیوەست بە پوکروفسکی، سەرنجم رادەکێشێت. هەندێجار سەرو سەکوتی پیرەمێردێکی وردیلەی کورتە باڵای، پۆڕ سپی، شرپۆشی، سەرپۆتەڵاك تۆزاوی، بێ نموودی، دەستو پێ سپی لە ماڵەکەماندا پەیدا دەبوو- بە کورتیەکەی **پیاوێکی** گەلەك غەریب بوو. هەر کەسێك دیبای یەکسەر دەیزانی شەرم لە شتێك دەکات، وا دەهاتە بەرچاو بارێکی قورس بەسەر ریژدانیەرە بێت، بۆیە خۆی گرمۆڵە دەکرد تا کەس نەی بینێ، ئەداو ئەتواری ئەوەندە سەیرو سەمەرە بوو کە هەر کەسێك دیبای گومانی ئەوەی لێدەکرد کە ئەقڵی پارسەنگی دەوێ.

ئەم پیرەمێردە هەندێجار دەگەییە ماڵەکەی ئێمە، لە ڕاڕەوەکەداو لەبەر دەرگا شوشەییەکە دەوێستاو، زاتی نەدەکرد وەژوور بکەوێ. ئەگەر دیبای یەکێك لە ئێمە –ساشا یان من، یان یەکێك لە خزمەتکارەکان کە زانیبای دەگەڵی میهرەبانە، بەوێدا ڕەت دەبین– یەکسەر دەستێکی دەجولاندو بۆلای خۆیی گاز دەکردین، و بە دەست دەکەوتە ئامارە کردنی جۆراوجۆر، تەنیا کاتێ کە سەرێکت بۆ لەقاندباو خولکت کردبا وەژوور بکەوێ –کە نیشانەیەکی قەراردادی بوو کە میوان‌و بێگانە لە ماڵ نیەو بۆی هەیە وەژوور بکەوێ– **تەنیا** ئەو کاتە، کابرای پیرەمێرد بە ئەسپایی دەرگای دەکردەوە، و بزەی خۆشی دەکەوتە سەر لێوان، ولە خۆشیدا دەستەکانی لێك دەسوون‌و یەکڕاست لەسەر نووکی پێ بەرەو ژوورەکەی پوکروفسکی دەچوو.

ئەم پیاوە باوکی پوکروفسکی بوو. پاشان تول‌و تەفسیلی سەربوری ئەم پیرەمێرە بەلەنگازەم زانی. سەر زەمانێ لە شوێنێکا کارمەندی دەوڵەت بووە، **چونکە** کەرچ‌و بێ تواناو، بێ شەخسیەت بووە ئیدی تا کۆتایی لەسەر بچووکترین وەزیفەی دایەرەکەی ماوەتەوە. لە پاش مەرگی ژنەکەی (دایکی ئەم خوێندکاری حازریە، پوکروفسکی) کەوتووەتە بیری ئەوەی ژنی دووەم بێنێ، وکیژە بازرگانێکی بچووکی خواستبوو، ژنە تازەکەی ماڵەکەی ژێرو ژوور کردبوو، هەمووانی لە زەواق نابوو و ژیانی لێ حەرام کردبوون، هەموو شتێکی خستووە ژێر ڕکێفی خۆی. هەنگێ ئەم خوێندکارەی لەمەڕ خۆمان، **پوکروفسکی**، منداڵێکی دەساڵان بووە، باوەژنەکەی زۆری بوغزاندووە.

لێ چارەنووس رووی خۆشی بە پۆکروفسکی نیشان داوە، بیکوڤ گەورە مولکدار کە جاران بابی پوکرۆفسکی ناسی بوو ، گرتبوویە ژێر باڵی خۆی، خاوەنداری کردبوو، چاودێری‌و خاوەنداری ئەم منداڵە لە ئەستۆ دەگرێت‌و دەیخاتە قوتابخانەیەکی شەوانەرۆژی (شەوانەرۆژی بەو قوتابخانانە دەگوترێ کە قوتابی هەم تیایدا دەخوێنێ‌و هەم لەوێ دەحەوێتەوەو دەخەوێ، وەرگێڕ).

بیکۆف ئەم منداڵەی داڵدەدا، **چونکە** داکی رەحمەتیشی دەناسی. دایکی بەر لە شووکردن، لە ساوپەنای ئانا فیدوروڤنادا بووە، و هەر ئەویش پوکروفسکیی کارمەندی بۆ دۆزی بووەوەو بەشووی دابوو، ئاغای بیکۆف، دۆستو ئاشنای گیانی بە گیانی ئانافیدوروڤنا، هەر بە پیاوەتی‌و لە رووی دڵاواییەوە پێنج هەزار رۆبڵی وەکو جیازی بووکێ دابوو، کەس نازانێت ئەم پارەیە کێوە چووە، من ئەم سەربهوردەم لە ئانافیدوروڤناوە زانیوە.. پوکروفسکی خوێندکار هەرگیز حەزی نەدەکرد باسی ماڵباتەکەی خۆی بکات. **دەڵێن** دایکی یەجگار خشیك‌و جوان بووە، و پێم سەیرە کە ئافرەتێکی وا قایل بووە شوو بە کەسێکی وا بودڵە بکات...

ئەم ژنە لە هەرەتی لاویدا، چوار ساڵ دوای شووکردنەکەی مردووە، ئیدی پوکروفسکی قوتابخانەی شەوانە رۆژی تەواو کردووەو چووەتە ئامادەیی‌و پاشان چووەتە زانستگە. بەڵام ئاغای بیکوف کە بە بەردەوامی هاتوچۆی پوترسبۆرگی کردووە، دەستبەرداری نەبووە.

**پوکرۆفسکی** لەبەر نەخۆشی نەی توانیوە لەسەر خوێندنەکەی لە زانستگە بەردەوام بێ. هەنگێ ئاغای بیکۆف بە ئانافیدوروڤنای

ناساندووەو بە جددی رایسپاردووە کە ئاگای لێی بێ، ئیدی بە مجۆرە، **پوکروفسکی** لاو وەکو یەکێك لە خزمان لەمماڵەدا داڵدەدرا، خواردن‌و خەوتنی خۆرایی بوو، بەو مەرجەی لە بری ئەمە هەر دەرسێکی پێویست بە ساشا بڵێتەوە، پوکروفسکی پیریش بە دەستی ژنەکەیەوە حاڵی بێ حاڵ بوو، ئەقڵی لە دەست دابوو، پەنای وەبەر خراپترین کار برد بوو، زۆربەی کات مەست بوو، **ژنەکەی** لێی دەدا، دەری دەکرد، ناچاری دەکرد لە موبەقەکەدا بنوێت، وای کۆنترۆڵ کردبوو کە نەك هەر بە لێدانی توند مەمنون بوو بەڵکو بێ گلەیی‌و گازاندە بە هەموو جۆرە عەزابێك رازی بوو. ئەوی راستی بێ زۆر پیر نەبوو، بەلام ئەو خووە خراپەی، ئەو ئالودەبوونەی بەو دەردی پیریەی بردبوو. تاقە نیشانەی هەست‌و سۆزی مرۆڤانی لەم پیاوەدا ئەو خۆشەویستییە بێ سنوورە بوو کە دەرهەق بە کوڕەکەی هەی بوو.

خەڵکی دەیانگوت پوکروفسکی لاو بەمرو لە دایکی لای نەداوە، سێرێکن‌و کراون بە دوو لەتەوە. تۆ بڵێی یادو بیرەوەری ژنی یەکەمی، کە زۆری دەگەڵ میهرەبان‌و باش بوو، وای لەم پیرەمێرە زورهان‌و فەرتوسە کردبێ، ئەوەندە **خۆشەویستی** کوڕەکەی لە دڵدا بێ؟ پیرەمێر، سەری زمان‌و بنی زمانی کوڕەکەی بوو، باسی هیچ شتێکی نەدەکرد، کوڕەکەی نەبێ، هەمرو هەفتەیەك بێ بواردن دووجار دەهاتە دیدەنی. زاتی نەدەکرد لە دووجار زیاتر بێت، چونکە پوکروفسکی لاو تاقەتی ئەم دیدارانەی بابی نەبوو.

گەورەترین‌و خراپترین خەتار عەیبی ئەم لاوە، ئەمە بوو کە حورمەتی بابی نەدەگرت. هەڵبەتە دەبێ ئەمەش بڵێم کە کابرای پیرەمێر هەندێجار

بە هیچ جۆرێ تەحەمول نەدەکرا. بۆ نموونە لاپرەسەنیەکی زۆری دەکرد، یـان بـە قسـەو پرسـیاری سـواوپواوی وڕێنەئاسـا، کوڕەکـەی لـەکارو خوێندنەوە دەکرد، یان هەندێجار بە مەستیو سەرخۆشی دەهات بۆ لای. کوڕەکەی هەوڵیدا بەرەبەرە عادەتو خووە خراپـەکانی پـێ تـەرك بکـات، بۆ نموونە ئـەو هـەموو چـەنەبازییە بـێ مانایـەی، ئـەو هـەموو فوزوڵیـەتو لاپرەسەنیەی، سەرەنجام پیرەمێرد گەییە قۆناغێك کە لە هـەموو شـتێکدا گوێڕاڵی کوڕەکەی دەکرد، وەکو ئەوەی کوڕەکەی خیفزان بـێ، ئیـدی بـە بێ ئیزنی کوڕەکەی زاتی نەدەکرد زار هەڵێنێ.

پیرەمێری بەلەنگاز لە باسو **ستایشــی** "تپنکـا"ی کـوڕی ( کوڕەکـەی بـە وناوە نێو دەبرد) تێر نەدەبوو. هەر کاتێ کە دەهاتـە دیـدەنی، نیگـەرانو شـەرمن دەهاتـە بەرچـاو، رەنگـە لەبـەر ئـەوە بـوو بـێ کـە دڵنیـا نـەبووە لەوەی کوڕەکەی بە گەرمی پێشوازی بکات. ماوەیەك ئەم پـێو ئـەو پێـی دەکرد کە وەژووربکـەوێ یـان نـا، ئەگـەر بـە رێکـەوت مـن لـەوێ بوایـەم، نزیکـەی چـارەکە سـەعاتێك، بیسـت دەقیقەیـەك بـەگێری دێنـامو لـە کوڕەکەی دەپرسی:

چ دەکا؟ تەندروستی چۆنە؟ باری دەروونی چۆنە؟ **ئایا** بە تەمای کـارێکی جدیە؟ حاڵی حازر چ دەکات؟ سەرقاڵی خوێندنـەوەی جدیـە یـان نـا، ئایـا دەنووسـێت یـان نقـومی رامـانو بیرکردنەوەیـە؟ کـاتێ کـە بـە تـەواوەتی دڵنیـام دەکـرد، هـەنگێ پیرەمێـر بڕیـاری دەداو وەژووردەکـەوتو زۆر بـە ئەسـپاییو بـێ کـەمترین سـەداو بـە پـارێزەوە دەرگـای ژوورەکـەی دەکـردەوە، سـەری دەبـردە ژوورەوە، کـە بیـدیبا کوڕەکـەی تـوڕە نیـەو ئامـاژەی دەکـانێ وەژووربکـەوێ، هـەنگێ بـە هـێمنی وەژووردەکـەوت،

پاڵتۆکەی دادەکەند، شەپقەکەی دادەکەند –شەپقەکەی هەمیشە چرچ و لۆچ و لە چەندین لاوە کون بوو وقەراخەکانی سوا بوو– و هەردووکیانی بێ هیچ خشپەیەك بە عەلاگەکەوە هەڵدەواسی، هەنگێ بە پارێزێکی زۆرەوە لە گۆشەیەکدا.

**لەسەر** کورسییەك دادەنیشت و چاوی دەبڕییە کوڕەکەی و تەماشای بچووکترین جم و جۆڵی دەکرد تا بزانێ پتنکای ئازیزی لە چ حاڵەتێکی دەروونیدایە، ئەگەر بە ئاستەم بێتاقەت بوایە، پیرەمێر هەستی پێدەکرد، یەکسەر لەسەر کورسیەکەی هەڵدەستاو **دەیگوت**: "پتنکا، لە دەرەوە بووم و پیایەسەکی زۆرم کرد، خەریك بووم بە ئێرەدا رەت دەبووم، گوتم با لادەم و پشوویەك بدەم." ئەوسا کرۆکپ پاڵتۆو کڵاوەکەی هەڵدەگرت، بە ئەسپایی دەرگاکەی دەکردەوەو بۆ ئەوەی خەم و پەژارەی دڵی لە کوڕەکەی وەشێرێت، بزەیەکی دەستکردی بۆ دەکردو بە بێدەنگی دەڕۆیی.

بەلام **ئەگەر** کوڕە رووی خۆشی بە بابی نیشاندابا، پیرەمێر لە خۆشیا لە پێستی خۆی نەدەهێوری. ئەم شادی و خۆشیە لە چاوەکانیا پرشنگی دەدا، لە هەڵس وکەوتیا، لە سیمایدا رەنگی دەدایەوە. ئەگەر کوڕەکەی قسەیەکی پێ گوتبا، پیرەمێر لەسەر کورسیەکەی ئاخێزێکی بۆ دەکردو بە دەنگێکی ئارام و گوێڕایەڵانە وەڵامی دەدایەوە، بە دەنگێکی پڕ لە رێزو حورمەت، و هەمیشە هەوڵی دەدا وەڵامەکەی یەجگار پڕ نەزاکەت بێ و قسەکانی هەڵبژاردەبن، کە بەڕاستی زۆر پێکەنیناوی دەهاتە بەرچاو.

**ئەم** پیاوە زۆر بێ دەم و پل بوو، نەیدەزانی قسان بکات، ئیدی وشەی لێ دەچوونە قاتی و دەکەوتە مینگەمینگ و دەپەشۆکاو لە ئەنجامدا بە

جۆریٚ تۆڕە دەبوو کە نەیدەزانی دەستی لە کویٚ دابنیٚ، چی لە خۆی بکات، و بۆ ماوەیەکی زۆر لە ژێر لێوانەوە ورتە ورتێکی نامەفهومی دەکرد، وەکو بیەویٚ ئەو وەلامەی داویەتیوە راست بکاتەوە.

ئەگەر بە پێچەوانەوە توانیبای **وەلاٚمێکی** لەبار بداتەوە، پیرەمێر خۆی قیت دەکردەوە، ئیلەکەکەی، بۆینباخەکەی،و پالاتەوەکەی رێك دەخستەوەو جۆرە متمانەیەکی بە خۆی پەیدا دەکردو هەستی بە کەرامەتی خۆی دەکرد. جار جاریٚ هێندەی جورئەت پەیدا دەکرد کە بە ئەسپایی‌و بە هێمنی لەسەر کورسیەکەی هەلدەستا، لە دۆلابی کتێبەکان نزیك دەبووەوەو هەر وا بە رێکەوتەکی کتێبێکی دەردێنا،و هەر لە جێوە خواو راسان پەرەگرافێکی هەلدەبژاردو بە دەنگی بەرز دەستی بە خوێندنەوەی دەکرد.

ئەم کارانەی **بە** رووڵەتێکی هێدی‌و هێمن ئەنجام دەدا، وەك بلێی بۆی هەیەو رێی پێدراوە هەموو کاتێك تەسەڕوف بە کتێبەکانی کوڕەکەیەوە بکات، وەك بلێی رەفتاری میهرەبانانەی کوڕەکەی دەگەلیا، ئاساییەو مایەی سەرسامی نیە. بەلام جارێکیان بە رێکەوت دیتم کە پوکروفسکی تکای لێکرد دەست لە کتێبەکانی نەدات، ئەو پیرەمێرە بەلەنگازە چتۆ شپرزە بوو وپەشۆکا.

سەری لێ شێوا، تورە **بوو**، شلەژاو کتێبەکەی سەروخوار خستەوە جێگەی خۆی، ویستی چاکی بکاتەوە، وەری گێڕا، ئەمجارەیان بەرووپشت دایبنا: پشتی کتێبەکەی کردە دیوارەکە، بزەیەکی کرد، سوور هەلگەڕا، نەیدەزانی چۆن ئەم تاوانە گەورەیەی راست بکاتەوە.

پوکروفسکی بە نەرمونیانیو ئامۆژگاریەکانی توانی خووە بەدەکان بە باوکی تەرك بکات، ئەگەر سێ جاری دوا بە دوای یەك بە هوشیاری ببتبای، وەمەست نەبوایە، جاری سێیەم کە پیرەمێرد هەتبایە دیدەنی، لە کاتی رۆیشتنیا دراوێکی بیست و پێنج کۆبیکی یان نیو رۆبلی دەخستە دەستیەوە. هەندێجار، جووتە پیلاوێك، بۆینباخێك، یا ئیلەکێکی بۆ دەکڕی.

بریا پیرەمێرت دەبینی چۆن بە جلکە تازەکانیەوە **وەکو** تاوس خۆی دەنواند. هەندێجار دەهاتە ژوورەکەی ئێمەش، هەندێجار کێكو پسکیت یان سێوی بۆ منو ساشا ئێنا، و بە درێژایی وەختەکە هەر باسی پتنکای ئازیزی دەکرد.

**داوای** لێدەکردین بە جدی دەرس بخوێنین، گوێڕایەڵی قسەکانی بین، سوودی لێوەربگرین، ودەیگوت پتنکا کوڕێکی باشە، نموونەیە، ئەمە جگە لەوەی کە رۆشنبیرو خوێنەوارێکی چاکە. بەدەم ئەم قسانەوە، بە چاری چەپ، و بە شێوەیەکی کۆمیکی سەیرەوە چاوێکی لێدادەگرتین، ئێمەش خۆمان پێ نەدەگیراو لەبەردەم خریدا لە قاقای پێکەنینمان دەدا، دایکم زۆری خۆشدەویست. لێ پیرەمێر زۆری رق لە ئانافیدوروفنا بوو، هەر چەندە لە رووی خۆیا ملکەچ و بێدەنگ و گوێڕایەڵ، خۆی دەکرد بە مشکی تڕپیو، دەبوو بە ماستی مە یوو.

زۆری نەبرد کە وازم لە دەرس خوێندنی لای پوکروفسکی **هێنا**، ئەو بە چاوی منداڵێکەوە، بە چاوی کچۆڵەیەکی لاساری بزێو، تەماشای دەکردم، منو ساشای لە نای یەك تەرازوو دادەنا، ئەوەم زۆر لەبەر گران بوو، چونکە بەلای خۆمەوە هەموو هەوڵێ تەقەلایەکم ئەوە بوو کە شوێنەواری

ڕەفتاری ڕابردوومی لە دڵدا بسڕمەوە، کەچی بەمەی نەدەزانی. ئیدی ڕۆژ بە ڕۆژ پتر لەمە تووڕە دەبووم، وام لێهات جگە لە کاتی دەرسەکان، تاقە قسەیەکم لەگەڵیا نەدەکرد، زاتم نەبوو بیدوێنم، کە بمدیبا دەموچاوم سوور هەڵدەگەڕا، شپرزە دەبووم، دەپەشۆکام، هەنگێ دەچوومە ژوورەکەمو لە سوچێکا کزکۆڵەم دەکردو لە داخا دەگریام.

**نەمدەزانی** هەموو ئەمە بە کوێ دەگەیی‌و چۆن دەکەوتەوە، ئەگەر هەلومەرجێکی سەیر نەهاتبایە پێشێ‌و لە یەکتری نزیکی نەکردباینەوە. شەوێك، دایکم لەجەم ئانافیدوروڤنا بوو، بە پێدزەکە خۆم بە ژوورەکەی پوکروفسکی دا کرد.

دەمزانی کە لە **ماڵ** نیە، نازانم بۆچی هات بەسەرما کە سەرێکی ژوورەکەی بدەم، هەرچەندە ساڵێك زیاتر بوو کە دراوسێی دیوار بە دیوار بووین، بەڵام هەرگیزو بۆ ساتەوەختێکیش نەچووبوومە ژوورەکەی.

کەچی ئەمجارە دڵم بە جۆرێ لێی دەدا، دەمگوت هەر ئێستا سینەم شەق دەکات‌و دێتە دەرێ. بە کونجکاوی‌و فزوڵیەتێکی فرەوە ڕوانیمە دەورروبەرم. کەلوپەل‌و شمەکی نێو ژوورەکەی پوکروفسکی کۆن‌و شڕ بوو، هەمووی دڕا بوو بە یەکا، پاك‌و خاوێن نەبوو، هەر سیپاڵێکی لە سوچێکا کەوتبوو. پێنج دۆڵابی گەورەی کتێبی هەبوو کە بە دیوارەکەوەی داکوتی بوون. سەری مێزو کورسیەکانی پڕ بوون لە کاغەز! سەیری هەر لایەکت کردبا هەر کتێب وکاغەز بوو!

لە پڕ فکرۆکەیەکی **سەیرم** بەسەردا هات‌و لە هەمان کاتدا هەستێکی خەم ئامێزی تووڕەهات سەراپای داگرتم: وام بە خەیاڵدا هات کە بە دۆستایەتی

من رازی نابێت‌و دڵی پڕ لە خۆشەویستی من، گرینگییەکی ئەوتۆی بۆ ئەو نیە.

ئەو کەسێکی خوێنەوارو **رۆشنیر** بوو، من کیژێکی گەوج بوومو هیچم نەدەزانی‌و تەنانەت تاقە کتێبێکم نەخوێندبووەوە.. هەنگێ نیگایەکی پڕ لە بەغیلی‌و تاسەم برپە رەفە دووروودرێژە پڕ لە کتێبەکان. کۆمەڵە هەستێکی جیاواز، خەمینی، نا ئومێدی، وجۆرە توڕەییەکم تێ وپوکا بوو. لە پڕ خۆزیایەکم کەوتە دڵ کە هەموو کتێبەکانی بخوێنمەوە، دوا بە یەکیان بخوێنمەوەو **ئەم** کارە بە زووترین کات بکەم، ویەکسەریش بڕیاری خۆم دا، رەنگە لەو کاتەدا بەو خەیاڵە بوو بووم کە ئەگەر هەموو ئەو شتانەی ئەو دەیزانین، بزانم، زیاترم بایەخ بداتێ‌و بە شایستەی خۆشەویستی خۆیم بزانێ، بۆیە خێرا خۆم گەیاندە یەکەمین رەفە، بەپەلەو بێ بیرکردنەوە یەکەمین کتێبم کە کەوتە بەرچاو دەرهێنا، کتێبێکی تۆزاوی بوو، سوور هەڵگەڕام، بە ترس‌و لەرزەوە کتێبە دزیاریەکەم بۆ ژوورەکەی خۆم برد لێبڕام هەر ئەو شەوە، دوای ئەوەی دایکم دەنوێ، لەبەر چرا چکۆلەکەمان بیخوێنمەوە.

**بەڵام** کاتێ بە پەلە خۆم گەیاندەوە ژوورەکەمان، تووشی نائومێدیەکی فرە بووم، کە بەلەز پیرەکتێبم کردەوە، سەیرم کرد بریتییە لە کۆتە کتێبێکی نیمچە رزیوی مۆریانە خواردوو، و بە زمانی لاتینییە.

ئیدی یەکسەر گەڕاندمەوە، رێك لەو دەمەدا کە خەریك **بووم** کتێبەکە بخەمەوە جێگەی خۆی، لە ڕاڕەوەکەوە دەنگێکم بەر گوێ کەوت، وپاشان ترپەی پێی کەسێك هات کە نزیك دەبووەوە.

بە پەلە کەوتمە خۆ **کتێبەکە** بخەمەوە بەینی کتێبەکانی دیو لە شوێنەکەی خۆی دای بنەمەوە، بەڵام شوێنی کتێبی بەلەنگاز، کە لە ریزی کتێبەکانی تردا، بەر لەوەی دەری بێنم خۆی لە خۆیدا تەنگ بوو، ئێستا لە ئەنجامی گوشاری کتێبەکانی تردا پڕ بوو بووەوەو کتێبەکانی تر شوێنەکەیان گرتبوو وجێی نەدەبووەوە. نەمدەتوانی بە تۆبزی بیخەمەوە شوێنی یەکەمی، بۆیە بە هەموو هێزو توانامەوە کتێبەکانی ترم پاڵدا تا جێی بکەمەوە. ئەو بزمارە ژەنگنەی کە دۆلابەکەی بە دیوارەکەوە داکوتی بوو، وەکو بێژی چاوەنۆڕی پاڵێك بێ، یەکسەر قرتا. پیرە دۆلاب بەلادا هات، وهەموو کتێبەکان بەخشو هۆر، بە نێو ژوورەکەدا پەرتو بڵاوبوونەوە. لەم کاتەدا دەرگا کرایەوەو پوکروفسکی وەژوورکەوت.

پێویستە ئەوەش **بڵێم** کە تەحەمولی نەدەکرد کەس دەست لە شتەکانی بدات. جا واوەیلا بە حاڵی کەسێك زاتی کردبا پەنجەیەك بە کتێبەکانیەوە بدات!

جا بەم حیسابو پێوانەیە بیهێننە بەرچاوی خۆ کە وەختێ ئەو هەموو کتێبەم -بچووكو گەورە، ئەستوورو تەنك- بینی بەو شێوەیە لە دۆلابەکەوە داڕژانو بە ژێر مێزو کورسیو ناو ژوورەکەدا پەرشو بڵاو بوونەوە، چ ترسێکم لێ نیشت، ویستم هەڵبێم. **بەڵام** تازە درەنگ بوو بوو.

لە دڵی خۆدا گوتم: "تەواو، هەموو شتێك تەواو! قوڕم بۆ خۆ گرتەوە، ماڵوێران بووم! گەوجیەتیو لاساریم کردووە بە گاڵتەی منداڵان، ئیژی منداڵێکی دە ساڵانم، بەڕاستی کچۆڵەیەکی گەوجم! گەوجێکی گەورە!".

پوکروفسکی زۆر توڕە بوو، هاواریکرد: "هەر لەمەم کەم بوو، ئەمەت دەویست! شەرم لە خۆت ناکەی ئەم رەفتارانە دەکەی؟.

کەی ئاقڵ دەبی؟" بە پەلە کەوتە کۆکردنەوەی **کتێبەکان**، منیش دانەویمەوە کە یارمەتی بدەم. بەڵام جارێکی دی هاواری کرد: "پێویست ناکات، پێویست ناکات! هەق نیە پێ بخەیتە شوێنێك کە رێت پێ نەدرابێ".

**بەڵام** کە هەڵوێستی ملکەچانەی منی بینی، تۆزێك هێور بووەوە، بە تۆن و سەدایەکی مامۆستایانەی ئامۆژگاری ئامێزەوە گوتی: "باشە بە تەمای کەی ئاقڵ بی، یانی ئەمە ئیشە تۆ دەیکەی؟ کەی دەگۆڕێی؟ خۆ تۆ منداڵ نیت، تۆ ئێستا کچە چکۆلەکەی جاران نیت، تەمەنت پانزە ساڵە!".

وەك ئەوەی بیەوێ دڵنیا بێت کە من ئیتر منداڵ نیم. نیگایەکی کردم و دەموچاوی سوور هەڵگەڕا. هەوەڵجار لێی حاڵی نەبووم، لەبەردەمیا وەستا بووم و هایم و حەیران سەیرم دەکرد. هەستا، بە شەرمێکەوە لێم هاتە پێشێ، زۆر شپرزە و پەشۆکاو بوو، لەبن لێوانەوە کەوتە قسان، دیار بوو لە شتێك پەشیمانە و دەیویست عوزرخوایم بۆ بێنێتەوە، پێدەچوو لەوە پەشیمان بێ کە تازە بۆی دەرکەوتبوو کە من کیژێکی گەورە و تەواوم. ئیدی یەکسەر تێگەییشتم.

بە خۆیشم نەمزانی لەو ساتەدا چیم بەسەر هات، شڵەژام. کۆنترۆڵی خۆم لە دەست دا، دەموچاوم سوور هەڵگەڕا، **لە** پوکرۆفسکی زیاتر سوور هەڵگەڕام، دەستم بە دەموچاومەوە گرت و بەغار لە ژوورەکە وەدەرکەوتم.

نەمدەزانی چ بکەم، لە شەرما خۆم لە کوێ قایم بکەم. هەموو شتەکان بە لایەکو ئەوەی لە ژوورەکەیدا غافڵگیری کردبووم بەلایەک! ماوەی سێ دانە رۆژی خشت نەمدەتوانی تەمەشای بکەم. هەر کاتێ دیبام، بە جۆرێ سوور هەڵدەگەرام لەوە بوو بکەومە **گریـــان**، بیروخەیاڵاتی گەوجانەوپێکەنین ئامێز بەرۆکی مێشکی بەر نەدەدام. یەکێك لەو بیرو خەیاڵە سەیرانە ئەمە بوو کە بچم بۆ لایو رێکو رەوان دان بە هەموو شتێکدا بنەم، وەهەموو شتێکی بۆ باس بکەم، قەناعەتی پێ بکەم کە وەکو **کچۆڵەیەکی** گەوج رەفتارم نەکردووە، بەڵکو نیازم پاك بووە.

ئیدی نیمچە بڕیارێکم دا کە ئەم کارە بکەم، بەڵام شوکر بۆ خوا، خۆمو بەختم زاتم نەکردو لە دوا ساتدا ژێوان بوومەوە. تۆ بیر بکەوە ئەگەر ئەم کارەم بکردایە چەند گەوج و کەودەن دەهاتمە بەرچاو!... ئێستاش کە ئەو ساتانەم وەبیردێنەوە هەست بە شەرمو شوڕەییەکی گەورە دەکەم.

دوای ئەوە بە چەند رۆژێك دایکم زۆر خراپ نەخۆش کەوت. دوو رۆژ لە جێدا کەوت، و شەوی سێیەم تایەکی گەرمی لێهاتو کەوتە بزرکاندنو ورێنە.

شەوی پێشوو تا بەیانی بە دیارییەوە بوومو چاوم لێك نەنا، چاودێریم دەکرد، ئاوم دەدایەو دەرمانەکانمان لە کاتی خۆیدا دەدایە، بەڵام شەوی دووەم لە پەلوپۆ کەوتبووم. هەندێ جار خەو بەسەرما زاڵ دەبوو، بەرچاوم تاریك دەبوو. سەرم گێژ دەبوو، خەریك بوو لە ماندووییەتیدا دەکەوتم. هەموو جارێك ئاهو **ناڵەی** کزی دایکم بێداری دەکردمەوە، رێك بەر لەوەی خەو بمباتەوە، رادەپەڕیم، چاوم هەڵدێناو هەر دوای ساتێك

هەمدیس خاو دەبوومەوەو دەکەوتمە وەنەوز. نازانمو بیرم نایەت، بۆ چەند ساتێك چاوم چووە خەو یان نا.

بەڵام دەزانم لەو چەند ساتە خێرایەدا، **لەو** چەند ساتەی زۆرانبازی نێوان خەوو بێداریەدا خەوێکی سامناکم بینی، خەوێکی دێو ئاسا باڵی بەسەر مێشكو زەینی شەکەتمدا کێشا. بەترسێکی زۆرەوە چاوم هەڵێنا. ژوورەکە نقومی تاریکی تاریکی بوو. ئاگری چراکە لە گیانەڵڵادا بوو، خەریك بوو دەکوژایەوە، لە پڕ هەموو ژوورەکە غەرقی روناکی بوو، و دوای تۆزێك بە تەواوەتی کوژایەوە. نازانم بۆچی، **بەڵام** ترسێکی گەورەم لێنیشت. ئەو خەونە ترسناکە خەیاڵی پەرێشان کردم، لە ترسا دڵم دەگوشرا... لەسەر کورسیەکەم راپەڕیم، هاوارم کرد، ترسێکی نادیار دەستی نابووە بینمو خەریك بوو دەخنکام. رێك لەم دەمەدا دەرگا کرایەوەو پوکروفسکی وەژوورکەوت.

هەر ئەوەم وەبیرسێتەوە کاتێ وەهۆش هاتمەوە، بازووی **گرتبووم**. لەسەر کورسیەکی دانیشاندم، پەرداخێ ئاوێ دامێو پرسیار بارانی کردم. نازانم چ وەڵامێکیم دەدایەوە. بەڵام دەزانم دەستی گرتبوومودەیگوت:

"تۆش نەخۆشیت، تۆش زۆر نەخۆشیت، تات هەیە خەریکە خۆت دەفەوتێنی، دەبێ ئاگاداری خۆت بی، ئاگات لە تەندروستیت بێت، مێشکی خۆت مێور بکەرە راکشێ، بخەوە، من دوو سەعاتی دی بێدارت دەکەمەوە. هەوڵ بدە کەمێك ئیسراحەت بکەی... راکشێ، پێت دەڵێم راکشێ!"

گەنم گردی هەر وتیو **ونی**، رنەیهێشت هیچ ئیعترازێك بکرم.

ماندوویەتی زەیفی لێ سەند بووم، لە ماندوویەتیدا چاوم هەڵنەدەهات و، لەسەر قەنەفەکە نیمچە پەڵکەوتنێك، پاڵکەوتم، بە تەما بووم تەنیا بۆ نیو سەعاتێك بخەوم، کەچی تا بەیانی خەوتم. پوکرۆفسکی تا ئەو کاتەی دەبوایە دەرمان بە دایکم بدەم، هەڵی نەستاندم.

ئەو **رۆژە** پشوویەکم دا، بۆ شەوەکەی، کە خۆم ئامادە دەکرد بە دیار دایکمەوە دانیشم و لێبڕابووم کە ئەمجارەیان بە هیچ جۆرێ نەخەوم، رێك لەم کاتەدا لە دەرگای ژوورەکەمان درا، سەعات یازدە بوو، دەرگام کردەوە، پوکرۆفسکی بوو. گوتی: "ئەگەر ئاوا بە تەنێ و بێکار دانیشیت، تاقەتت دەچێت. ئەم **کتێبەم** بۆ هێناوی تا بیخوێنیتەوە و بێ تاقەت نەبی و کاتەکەت لێ بەسەر بچێت.. کتێبەکەم لێوەرگرت، لە یادم نیە ناونیشانەکەی چی بوو، پێم وایە هەر نەشمکردەوە، هەرچەندە تا بەیانیش نەخەوتم. حاڵەتێکی دەروونی سەیر خەوی زڕاند بووم، نەمدەتوانی لە یەك شوێندا بەند ببم. زۆرجار لەسەر کورسیەکەم هەڵدەستام و بە نێو ژوورەکەدا پیاسەم دەکرد. جۆرە شادیەکی قووڵ لە سەراپام نیشتبوو. ئەم ئاوردانەوەو هەڵوێستەی پوکرۆفسکی–م یەجگار لەلا خۆش بوو. هەستم بە شانازی دەکرد کە بەو شێوەیە لە خەمی مندایەو ئەو ئەزیەتەی لە پێناوی مندا کێشاوە. بە درێژایی شەوەکە هەر بیرم کردووەتەوەو زندە خەونانم هەڵبەستووە.

**پوکرۆفسکی** ئەو شەوە ئیتر نەهاتەوە، دەمزانی کە نایەتەوە، بیرم لە سبەی شەو دەکردەوە کە دەشێت چی رووبدات...

شەوی دوایی، کاتێ کە هەموو خەڵکی خانووەکە خەوتبوون، پوکرۆفسکی دەرکەی ژوورەکەی خۆی کردەوە، هەر لەبەر دەرگاکەوە

کەوتە قسە کردن لەگەڵما، ئێستا هیچ قسەیەکم لەو قسانە لە بیر نەماوە. ئەوەندەم بیر ماوە کە زۆر شپرزە بووم، شەرمم دەکرد، لە خۆم بێزار بوومو خودا خودام بوو قسەکانمان زوو تەواو بێت، هەرچەندە لە کانگای دڵەوە تامەزرۆی ئەوە بوومو لە بەیانی زووەوە خەوم بەو گفتوگۆیەوە دەبینیو لە دڵی خۆدا پرسیارو وەڵامی پێشوەختەم بۆ ئامادە دەکرد...

دۆستایەتی ئێمە لەو شەوەوە دەستی پێکرد.

ئیدی بە درێژایی ماوەی نەخۆشیەکەی دایکم، هەموو شەوێ چەند سەعاتێکمان پێکەوە رادەبوارد. بەرە بەرە بەسەر شەرمنیەکەی خۆم دا زاڵ بووم، هەرچەندە دوای هەر گفتوگۆیەك دەگەڵ پوکروفسکی دا، جۆرە ناڕەزاییەکی دەروونیم لا دروست دەبوو، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا بە شادیەکی پەنامەکیانەو خۆ ویستانەوە دەمبینی کە لەبەر خاتری من کتێبە بێنازەکانی فەرامۆش کردووە.

**رۆژێک**، بە رێکەوتو بەدەم سوعبەتەوە گفتوگۆیەکەمان هاتە سەر داڕوخانی دۆڵابەکەو داڕژانو پەرتبوونی کتێبەکانی ناوی. ساتێکی غەریب بوو، بە راشکاویو راستگۆییەکی لە رادەبەدەر واداریان کردم، هەموو حەقیقەتەکانی پێ بڵێم... و ئیعترافی تەواوی بۆ بکەم: ئیعترافم بۆ کرد کە دەمویست بخوێنمەوە، خۆم رۆشنبیر بکەم... و زۆرم لەبەر گران بوو کە بە منداڵم بزانن، و وەکو کچۆڵەیەکی منداڵ مامەڵەم لە تەکدا بکرێت...

جارێکی دی دەیڵێمەوە کە لە بارێکی دەروونی سەیردا بووم، **دڵم** نەرم بوو بوو، فرمێسك زابورە چاوانم —هیچ شتێکم لێی نەشاردەوە، هەموو شتێك، هەموو شتێکم بۆ گێڕایەوە. بۆم گێڕایەوە کە حەزم لێیەتی، خۆشم دەوێ، پڕ بە دڵ حەز دەکەم لەگەڵ ئەودا بژیم، و باری سەر شانی

سووك بکەم، هانی بدەم، پشتیوانی لێبکەم. نیگایەکی غەریبی کردم، هەم شەرمنانە بوو، هەم پڕ لە حەیرمان‌و حیرەت، و زمانی چووە کلیلەو تاقە قسەیەکی نەکرد. لە پڕ هەستم بە پەژارەیەکی قووڵ‌و خەمێکی گەورە کرد.

هەستم دەکرد لێم تێناگات، و لەوەیە لە دڵی خۆیدا گاڵتەم پێ بکات، لەپڕ وەکو منداڵ لە هۆڕژنی گریانم دا، فرمێسکم وەکو بارانی بوهار داباریین، و نەمتوانی جڵەوی خۆم بگرم،... پوکروفسکی هەردوو دەستی گرتم‌و ماچ بارانی کردن، باوەشی پێدا کردم‌و بە سینگی خۆیەوەی نووساندم. بە قسەی خۆش‌و زمانی شیرین کەوتە دڵدانەوەم، ئەویش زۆر هەڵچوو بوو.

لە بیرم نیە چی پێ گوتم، هەر ئەوەندەم لە بیرە کە هەم دەگریام هەم پێدەکەنیم، دەموچاوم سوور هەڵگەڕا،و لە خۆشیا نەمدەتوانی تاقە قسەیەك بکەم.

ویڕای ئەم هەموو سۆزو گودازەی خۆم، سەیرم کرد پوکروفسکی هێشتا هەر هەندێك سەرسامەو شەرم دەکات. وا دەهاتە بەرچاو کە ناتوانێ سەر لەم هەموو جۆش‌و خرۆش‌و سۆزو گودازە کوت‌و پڕەی من دەربکات، سەر لەم ئەشقە ئاگرینەی من سەبارەت بە خۆی دەربکات، پێدەچوو لە سەرەتاوە حەپەسا بێ، بەڵام پاشان حەپەسان‌و دوو دڵیەکەی رەوایەوە، بە هەمان سادەیی‌و راشکاوی بە هەمان میهرەبانی‌و خۆشەویستی وەڵامی دامەوە، وەکو ئەوەی دۆستی دڵسۆزی من بێ، وەکو ئەوەی برای هەقم بێ.

دڵم کرایەوە، هەستم بە خۆشیو شادییەکی گەورە کرد! هەستو نەستی خۆم لیٚ نەشاردەوە، هیچم لێی نەشاردەوە، جڵەوی خۆم بۆ بەردا، ئەویش ئەمەی بە چاوی خۆی دەبینی، ڕۆژ لە دوای ڕۆژ پتر دڵبەندم دەبوو.

ئەوی ڕاستی بیٚ، نازانم لەو شەو ژوانانەدا، لەو سەعاتە شیرینو عەزاب ئامێزانەدا کە پێکەوە، لەبەر ڕوناکی لەرزۆکی مۆمی بەردەم پەیکەرەکەدا، بە دیار دایکە بەلەنگازو نەخۆشەکەمەوە دەمان بردە سەر باسی چیمان بۆ یەکتر دەکرد...

جا **هیچ** ما باسی نەکەین؟ هەر شتێکمان بە خەیاڵدا بهاتبایە باسمان دەکرد، هەر شتێکمان بە دڵدا بهاتبایە دەرمان دەبڕی، و زاری خۆمان گومرگ نەدەکرد- تا رادەیەکی زۆر شاد بووین... زەمانێکی خەمناکو خۆش بوو، لە هەمان کاتدا هەم شادو هەم خەمناك بوو! ئێستاش کە ئەوکاتانەم بیر دەکەونەوە هەست هەم بە شادیو هەم بە خەم دەکەم.

بیرەوەری، چ شیرینو چ تاڵ، هەمیشە سەرچاوەی **عەزابن**، بەلای کەمەوە بۆ من وایە، بەلام تەنانەت ئەم عەزابەش شیرینو خۆشە. کاتیٚ کە دڵی بنیادەم پڕە، نەخۆشە، لە ڕەنجو عەزابدایە، وخەمبارە، ئەو کاتانە بیرەوەری دەی بوژێنێتەوە، تەڕو تازەی دەکاتەوە، وەکو ئەو دڵۆپە خوناوانەی کە شەویٚ پاش ڕۆژێکی گەرم دەکەوێتە سەر ئەو گوڵانەی کە هەتاوی تونی دوا نیوەڕۆ ژاکاندویەتی،دەیان بوژێنێتەوەو پاراویان دەکات.

**دایکم** بەرە بەرە چاك بووەوە، بەلام هێشتاش شەوانە بە دیاریەوەو دادەنیشتم. پوکرونسکی زۆرجار کتێبی بۆ دێنام، هەوەڵجار هەر بۆ

ئـەوەم دەخوێنـدەوە تـا خـەو نەمباتـەوە، بـەڵام دواتـر زۆر بـە تاسـەو تامەزرۆییەوە **دەمخوێندنەوە**. لـە پـڕ دنیایـەك شـتم بـۆ ئاشـكرا بـوو كـە پێشـتر نەمـدەزانین یـان ئاشـنایان نـەبووم. خوێندنـەوە دنیایـەك هـزرو هەستی تازەی لە ناخما تەقاندەوە كە لە هەموو لایەكەوە لـە دڵو زەینـم دەڕژان.

جا تا تاسەی كۆنترۆڵكردنی **ئەم** هـزرە تازانـەم زیـاتر دەبـوو، نـاخم پـتر دەهاڕۆژاو ئەو هەسـتو هزرانـەم لـەلا جـوانترو شـیرینتر دەبـوو، و روحـی ژێرو ژوورو دەوڵەمەندتر دەكردم، لە ناكاودا لە چاو تروكانێكدا ڵیان پـڕ دەكردمو دەسـتبەرداری هـەموو شـتێكی تـر دەبـووم. ئاشـوبێكی سـەیرو غـەریب لـە بـوونم دەڕوكـا. **بـــەڵام** ئـەم هێرشـە روحـیو دەروونیانـە، نەیاندەتوانی بە تەواوەتی بەڵانسم تێك بدەن. زیاتر وەكو خەون وا بوون، و هەر ئەمەش فریام كەوت.

كـە دایكـم چـاك بـووەوە، ئیـدی شـەوژوان و گفتوگۆیـە دوورو درێـژو دوو قۆڵیەكانمان بڕا. هێشتاش ناو بە ناو هەندێ قسەی بـێ سـەروبەرو سـەراوژ بێ ناوەڕۆكمان دەكردن بەڵام من حەزم دەكرد بایەخی تایبەتیان بـدەمێو مانای پەنامەكیان بۆ بدۆزمەوەو لەزەتم لەم كـارە وەردەگـرت. ژیـانم پـڕو ڕەنگ بـوو، خۆشـحاڵو ئاسـوودە بـووم، شـادیو لـەزەتێكی ئـارام لـە روحمەوە سەری دەكرد. چەند هەفتەیەك بەم شێوەیە بووری...

**رۆژێك** پوكرۆفسكی پیر هاتە دیدەنیمان. ماوەیـەكی زۆر قسـەی خۆشـی بۆ كردین، لە جاران زیاتر خۆشحاڵو بە كەیفو سوێرە قسـە بـوو، ژیـانی لـێ هەڵـدەقوڵا، بێوچـان پێدەكـەنی، بـە شـێوازی تایبـەتی خـۆی شۆخیوسـوعبەتی دەكـرد. ئـەنجام رازی ئـەم كەیفخۆشـیەی بـۆ ئاشـكرا

کردین‌و گوتی دوای یەك هەفتەی خشت، جەژنی لە دایك بوونی پتنکایەو بەو بۆنەیەوە دێتە دیدەنی **کوڕەکەی**، و ئیلەکێکی نوێ لەبەر دەکات‌و ژنەکەشی قەولی داوەتێ جووتێ پێلاوی تازەی بۆ بکڕێت. بە کورتیەکەی، پیرەمێرد لە کەیفان لەپێستی خۆی نەدەهێوری، شادی لێدەچۆڕا، هەر شتێکی بە هزروخەیاڵدا بهاتبوایە بێ گومرگ دەری دەپەڕاند.

**جەژنی** لە دایك بوونی! بیرۆکەی جەژنی لە دایکبوونی ئەو، ئارامی لەبەر بڕی بووم، بوو بوو بە خەیاڵاتی شەو ورۆژم. لێبڕام هەر چۆنێ بووە، بە پێشکەش کردنی دیاریەك دۆستایەتیەکەم دەگەڵ پوکروفسکیدا تازە بکەمەوە. بەڵام چ دیاریەك؟ ئەنجام بڕیارم دا کتێبی بۆ بەرم. دەمزانی حەزی لە دوا چاپی کۆ بەرهەمەکانی پوشکینە، لێبڕام بۆی بکڕم. سی ڕۆبڵێکم هەبوو، لە کاری تەقەڵ‌و درومانان پاشەکەوتم کردبوو. بۆیەم پاشەکەوتکردبوو کە دەستە جلکێکی بۆ خۆم پێ بکڕم.

زوو بە زوو ئاشپەزە پیرەکەمان، ماترینام نارد کە **سوراخی** نرخی کۆ بەرهەمەکانی پوشکینم بۆ بکات. ئەفسوس!

نرخی هەر یازدە بەرگەکەی، بە جزو بەندەکەیەوە، بەلای کەمەوە نیکردە شەست ڕۆبڵ. ئەم پارەیە لە کوێ بێنم؟ زۆرم بیر کردەوە، بەڵام هیچ چارەیەکم نەدۆزییەوە. نەمدەویست داوا لە دایکم بکەم. هەڵبەتە ئەگەر داوام لێکردبا کۆمەکی دەکردم، بەڵام لەو حاڵەدا هەموو خەڵکی خانووەکە بە چیرۆکی ئەم دیاریەی ئێمەیان دەزانی، وەنگێ دیارییەکە دەکەوتە بری ئەو دەرسانەی کە بۆ مارەی ساڵێکی خشت پێ دابووم. حەزم دەکرد بە خۆم، و بێ ئەوەی کەس پێی بزانێ، دیاریەکی پێشکەش

بکـەم. سـەبارەت بـەو وەخـتـو ماندووبوونـەی بـە منـەوە کێشـا بـووی دەمویست هەتا هەتایە هەر مەمنوونو منەتباری بم، و هیچ شتێکی لەبری ئەوە نەدەمێ تەنیا دۆستایەتیو خۆشەویستیم نەبێ. ئەنجام رێگەیـەکم دۆزیەوە کە لەم ئاستەنگە دەربچم.

**دەمزانی** لای هەندێ لەو دوکاندارانەی کە لە ژێر قەنتـەرەی گوسـتینی دا کتێبی کۆنیان دەفروشـت، هەنـدێجار دەشـێت بـە کـەمێك مامەڵـە کـردنو سـەودا، بـەنیوە قیمـەت کتێبـان بکـڕی، کتـێبی دەسـتی دووەم، کەبـە ئاستەم بەکار هاتبوونو هەر تازە بوون. بۆیە لێبڕام لە نزیکترین دەرفـەتا بڕۆم بۆ ئەوێندەرو سەرێکی **کتێبفرۆشیەکانی** دەستی دووەم بدەم. هـەر بـۆ سـبەینێ دەرفـەتم بـۆ رەخسـا، هـەم ئانافیـدوروڤناو هـەم خۆمـان پێویستمان بە کڕینی هەندێ شت بوو. دایکم هەندێ ماندوو بـوو وتاقـەتی نەبوو بچێ بۆ بازاڕو بیانکڕێـت، ئانافیـدوروڤناش لـە خـۆش شانسـی منـدا تەمبەڵی گرتبووی، بۆیە بازاڕ کردنەکە بە ملی مندا هاتو، منـیش دەگـەڵ ماتریتادا لە ماڵ رەدەرکەوتم.

بەختم یار بوو، و زۆر زوو دەورەیـەکی تـەواوی کـۆ بەرهـەکانی پۆشـکینم دۆزییەوە کە جزو بەندێکی زۆر باش کرابوو. کەوتمە مامەڵە دەگەڵ یـارۆی فرۆشیاردا، هەرەڵجار دلوای نرخێکی بەجگار زۆری کـرد، زیـاتر لـە نرخـی کتێبی تازە. پاشـان دوای مامەڵـەو چـەنەیەکی زۆر، دوای مانـدووبوونێکی فـرە، دوای ئـەوەی چـەندین جـار وام نوانـد کـە نامـەوێو **دەڕۆم** تـوانیم نرخەکەی بە یارۆی فرۆشیار دابگرمو ئەنجام هاتە سەر دە رۆبڵی زیو.

کە سەودلو مامەڵەو چەنە چەنەکەم لا خۆش بوو!.... ماتریتای بەلـەنگاز سەری لەوە دەرنـەدەکرد بـۆ چـی ئـەم گەرمـە مامەڵەیـە دەکـەمو بۆچـی

هاتووه بە سەرما ئەم هەموو کتێبە بکڕم. بەڵام ئەفسوس! هەموو داراییەکەی من تەنیا سی ڕۆبڵی کاغەزی بوو، و یارۆی فرۆشیارش ئامادە نەبوو لەدوا نرخی خۆی بێتە خوارتر. ئیدی زۆری لێ پاڕامەوە، زۆرم سوێند وئایەتان بە گژاکرد، وئەنجام کەوتمە ڕێ کە بڕۆم. کەمێك دڵی نەرم بوو، بەڵام تەنیا دوو ڕۆبڵ و نیو هاتە خوارێ، و سوێندی خوارد کە چونکە ئافرەتێکی باشم بۆیە بەو نرخەم دەداتێ، دەنا بەم نرخە بە هیچکەسێکی تری نادات. ئێستا تەنیا دوو ڕۆبڵ و نیوم کەم بوو! خەریك بوو لە داخا دەست بە گریان بکەم. بەڵام لە پڕێکا شانسێکی چاوەڕوان نەکراو فریام کەوت.

**چەند** شەقاوێك لەولای ئێمەوە، پوکروفسکی پیرم بە دیار مێزی کتێبفرۆشێکی ترەوە بینی، چوار پێنج کتێبفرۆش دەوریان دابوو و بە سەوداو مامەڵە گێژو کاسیان کردبوو، و بارییان بە ئەقڵە سووکەکەی دەکرد، هەر یەکەیان بە جۆرێ ستایشی کاڵای خۆی بۆ دەکرد. مەگەر هەر خوا زانیبای چ کتێبێکیان بۆ هەڵدەداو ئەویش دەیویست چ کتێبێك بکڕێت!

پیرەمێری بەلەنگاز لە ناوەندیاندا حایر مابوو ونەیدەزانی وەڵامی کیهەیان بداتەوەو بارەڕ بە کێیان بکاتو نەیدەزانی چی لەو هەموو کتێبە بکات کە پێیان نیشاندەدا. چووم بۆ لای و لێم پرسی چ دەکات لێرە. بە دیتنی من گەشایەوە، زۆر خۆشحاڵ بوو!.. زۆری خۆشدەویستم، ڕەنگە بە قەد پتنکای کوڕی خۆشی ویستبێم.

وەڵامی دامەوە: "گەرەکمە کتێبان بکڕم فرڤارا ئالکسیوڤنا. خەریکە چەند **کتێبێک** بۆ پتنکای کوڕم دەکڕم. چونکە جەژنی لە دایکبوونەکەی

نزیک بووەتەوە، و بە خۆت دەزانی زۆری حەز لە کتێبە، کتێب دەپەرستێ، بۆیە هاتووم کتێبی بۆ بکڕم..".

پیرەمێر، خۆی لە خۆیدا بە **شێوازێکی** پێکەنیناوی قسانی دەکرد، ئێستاش کە تەواو شپرزە بوو بوو، هێندەی دی پێکەنیناوی تر دەینواند. نرخی هەر کتێبێکی دەپرسی لە یەك، یا دوو، یا سێ ڕۆبڵی زیو کەمتر نەبوو، وای لێهاتبوو نەیدەوێرا نرخی کتێبە گەورەکان بپرسێت، تەنیا نیگایەکی عەزرەتباری دەکردن، بە قامکان پەڕەکانی هەڵدەدانەوە، و بە دەستیەوە دەگرتن و ئەمدیو ئەو دیوێکی دەکردن و لە جێی خۆیان دای دەنانەوە. لە بن لێوانەوە **دەیگوت**: "نا، نا، زۆر گرانە، بەڵکو شتێکی دی بدۆزمەوە."و هەنگێ لە نێو نامیلکەو کتێبانی مۆسیقادا، لە نێو بەیازو سڵناماندا دەگەڕا، ئەم بابەتە کتێبانە کە بەبار هەڵدرابوونەوە هەموویان هەرزان بوون.

پێم گوت: – یانی دەتەوێ ئەم شتانە بکڕی؟ ئەمانە گەندەن، بە کەڵك نایەن."

وەڵامی دایەوە:

– نا، نا، لەمانە ناکڕم. بنواڕە ئەوێندەر، کتێبی چکۆلەی جوانی لێیە ! بزانە چەند جوانن ! "

ئەم قسانەی هێندە زەبوونانەو مێواش و خەمبارانە لە زار هاتنە دەرێ، لە دڵی خۆدا گوتم هەر ئێستا لە داخا دەکەوێتە گریان، چونکە ئەو کتێبە **جوانانە** هەموویان فرە گران بوون. تەنانەت فرمێسکیکیشم بینی کە بە گۆنا سیسەڵەو چرچەڵەکانیا هات و بەسەر کەپوە سوورەکەیدا داڕژا. لێم پرسی چەندی پارە پێیە. بەلەنگازە پارچە ڕۆژنامەیەکی چرچ و لۆچی لە

بەرگی دەرهێنا کە پارەکانی تێوە پێچا بوو، وگوتی: "تەمەشا، ئەمە هەموو پارەکەمە. یەك نیو رۆبڵی، بیستو پێنج کۆپیکییەك، و بایی بیستو پێنج کۆپیکییەکش دراوی وردەی مسی".

بە پەلە بەرەو لای ئەو فرۆشیارەم راکێشا کە مامەڵەی بەرهەمەکانی پوشکینم لەگەڵ کردبوو. پێم گوت: "ئەم یازدە کتێبە هەر هەمووی بایی سیو دوو رۆبڵو نیوی کاغەزییە، من سی رۆبڵم پێیە، ئەگەر تۆ دوو رۆبڵو نیوەکەی بدەی، دەیکرینو بە ناوی هەردووکمانەوە پێشکەش بە پتنکای دەکەین". پیرەمێردی بەلەنگاز خەریك بوو لە خۆشیا شێت بێ، هەموو پارەکەی هەڵرشتە سەر مێزی کابرا، وئەویش کتێبخانە هاوبەشەکەمانی دایە. پیرەمێری میرەبان هەندێ لە کتێبەکانی تەپاندنە گیرفانەکانیەوە، هەندێکی تریانی نانە بن هەنگڵیو ئەوانی تری بە دەستەوە گرتن، و بەرەو ماڵی بردنەوەو بەڵێنی دامێ کە سبەینێ هەر هەموویان بە دزیەوە لەگەڵ خۆیدا بینێ.

پاش نیوەڕۆی سبەینێ هات بۆ دیدەنی کوڕەکەی. وەکو عادەتی هەمیشەیی نزیکەی سەعاتێك لەلای مایەوە، وپاشان **وەکو** هەمووجارێك هاتە دیدەنی ئێمەو بەسەرو پۆتە لاکێکی پێکەنیناوی رازو مەتەڵ ئامێزەوە لە تەنیشت منەوە دانیشت. هەوەڵجار بەدەم بزەوە کەوتە هەڵکڵۆفینی دەستەکانی، زۆر بەختیارو شاد بوو بەوەی کە نهێنییەکی پێیە، ئەوجا گوتی هەموو کتێبەکانی بە دزیەوە، بێ ئەوەی بێڵێ کەسێك پێی بزانێ، هێناوە بۆ ماڵی ئێمەو داوێی بە ماتوینار، ماترینا‌ش لە سرچێکی موبەتەکەدا شاردونیەوە. پاش ئەوە باسەکەمان هاتە سەر ئەو جەژنی لە دایك بوونەی کە چاوەنۆڕی بووین، پیرەمێرد مارەیەك باسی

ئەوەی کرد کە چۆن دیاریەکەمان پێشکەش بکەین، تا زیاتر بە تـانی ئـەو بابەتـەدا دەچـوو، زیـاترم بـۆ روون دەبـووەوە کـە شـتێکی لـە دڵدایـە، ناتوانێ، زات ناکات، و ناوێرێ بیـدرکێنێ. منـیش بـە بێـدەنگی چاوەڕوانم دەکرد. ئەو شادیە پەنهانە، ئەو ئارامیو ئاسودەییەی کە مـن بـە ئاسـانی لە ئەداو ئەتواریا دەمبینی، لە سەرو سیمایدا دەمخوێندەوە، لـە تروکـانی چاوی چەپیا بۆم دەردەکەوت، بەرە بـەرە ئـاوا بـوو. سـات بـە سـات بـێ ئۆقرەترو بێ تاقەت تر دەبوو، **ئەنجام** نەیتوانی لەوەی پتر خۆی بگرێت. بە شەرمەوەو بە دەنگێکی نزم گوتی:

– گـوێ بگـرە فرفـارا ئالکسـیوفنا... دەزانـی چـیە فرفـارا ئالکسیوفنا؟...

پیرەمێردەی بەلەنگاز تەواو پەریشانو شپرزە بوو بوو:

– تەمەشاکە: "کە جەژنی لە دایکبوونەکەی هات، تۆ دە دانەی لـە کتێبەکان بدەیە، مەبەستم ئەمەیە بە نێوی خۆتـەوە پێشکەشـی بکە، هـەنگێ منـیش بـەرگی یازدەیـەمی دەدەمـێ. بـە جیـا، بـە ناوی خۆمەوە پێشکەشی دەکەم. یانی بەو شـێوەیە تـۆ دیـاریی خۆتی دەدەیتێو منیش دیاریی خۆمی دەدەمێ".

لەم کاتەدا **پیرەمێرد** تەواو شـەپۆکاو زمـانی چـووە کلیلـەو بێـدەنگ بـوو. نیگایـەکی خێـرام کـردێ، بـە شـەرمو شـەرمەزاریو تاسـەوە چـاوەڕوانی قرێری من بوو.

پێم گوت:

– باشـە بۆچـی ژێـوان بوویتـەوە کـە بـە هاوبەشـی دیاریەکـەمانی پێشکەش بکەین، زاکار پترۆفیتچ؟.

- چونکە، ڤرڤارا ئالکسیوڤنا... چونکە.. مەبەستم ئەمەیە... من.. چونکە..

خۆلاسە، پیرەمێر تەواو شڵەژا، دەموچاوی سوور هەڵگەڕا، زمانی کەوتە تەتەڵە، نەیتوانی رستەکەی تەواو بکات یا هیچ قسەیەکی تر بکات.

ئەنجام کەوتە روونکردنەوەی مەبەستەکەی:

دەزانی چۆن؟ دەزانی ڤرڤارا ئالکسیوڤنا، من هەندێجار لاساری دەکەم... یانی حەز دەکەم ئەوە بزانی کە من هەمیشە سەرسەختی دەکەم،... رێگەی نادروست دەگرم... هەمیشە زێدەرۆیی دەکەم... شتێك دەکەم کە پێویست نیە بیکەم.. لە مەبەستم تێ گەیشتی؟... هەندێ رۆژ دنیا زۆر سارد دەبێت، منیش خەمێکی زۆر دام دەگرێت.. یانی خەمێکی کوتوپڕ بەرۆکم دەگرێت، هەر ئەوەندەم خۆشە شتێکی ناخۆشم بێتە پێشێ، ئیدی خۆم پێ کۆنترۆڵ ناکرێ.. لە رێ دەردەچم.. و هەندێجار یەك دوو پێکی زیادە دەخۆمەوە. پێتنکا پێی ناخۆش دەبێ، ڤرڤارا ئالکسیوڤنا، تورە دەبێت، قسەی سووکو زبرم پێ دەڵێت، لۆمەم دەکات، هاوارم بەسەردا دەکات، ئامۆژگاریم دەکات کە دەبێ چۆن رەفتار بکەم...

بۆیە دەمەوێ بەم دیاریە ئەوەی بۆ بسەلمێنم کە خۆم چاك کردووە، و رێگای دروستم گرتووەتە بەر. دەمەوێ ئەوەی پێشان بدەم کە هەندێ پارەم پاشەکەوت کردووە تا کتێبێکی بۆ بکڕم، دەمەوێ بۆی بسەلمێنم کە ماوەیەکی زۆرە خەریکی پاشەکەوتم ئەوجا ئەم پارەیەم کۆ کردووەتەوەو ئەم کتێبەم پێ کڕیوە، چونکە من جگە لەو پارەیەی کە ناو بە ناو پێتنکا وێمدەدات، هیچی ترم نیە، بە خۆیشی ئەمە دەزانێ،

ئیدی بۆی دەردەکەوێ چی بەو پارەیە دەکەم کە ئەو دەمداتێ، تێدەگات کە ئەم کارەم لەبەر خاتری ئەو کردووە.

زۆرم بە زەیی بە پیرەمێرا هاتەوە. ساتێك لە فکران راچووم. هێشتا هەر بە نیگەرانی سەیری دەکردم.

گوتم:

- گوێ بگرە زاکار پترۆفیتچ، تۆ هەر یازدە بەرگەکەی بدەیە.
- هەر هەمووی! هەموو کتێبەکان؟ هەموو کتێبەکانی بدەمێ؟
- بەڵێ، هەر هەمووی.
- یانی من بیدەمێ؟
- بەڵێ، تۆ بیدەیە.
- یانی دیاریی من بێ؟ بە ناوی خۆمەوە؟
- بەڵێ، دیاریی تۆ بێت، بە ناوی خۆتەوە.

پێم وابوو زۆر بە روونی مەبەستی خۆم پێ گوت، بەلام پیرەمێر تا ماوەیەکی زۆر لە مەبەستم حاڵی نەبوو، دوای کەمێك بیرکردنەوەو سەرسامی گوتی:

- بەڵێ، ئەمە زۆر باشە، بەراستی باشە... ئەدی تۆ فرفارا ئالکسیوفنا.... لەم حاڵەدا چی دەکەی؟
- هیچ، هیچی نادەمێ؟

پیرەمێرد، لەپڕ بە دەنگێکی ترس ئامێزەوە هاواری کرد:

- چی؟ تۆ هیچ دیاریەك بە پتنکا نادەی؟ حەز ناکەی هیچی بدەیتێ؟

پیرەمێرد یەجگار سەرسامو ناڕەحەت بوو، هەستم کرد ئامادەیە پێشنیازەکەی خۆی ڕەت بکاتەوە، تا منیش بتوانم دیاریەك پێشکەش بە کوڕەکەی بکەم. کە دڵێکی میرەبانی هەبوو!

ئیدی دڵنیام کرد کە منیش **خۆشحاڵ** دەبم شتێك پێشکەش بە پتنکا بکەم، بەڵام نامەوێ ئەو، کە بابی پتنکایە، لە پێشکەشکردنی ئەم دیاریە بێبەش بکەم. گوتم: "ئەگەر کوڕەکەت بەم دیاریە خۆشحاڵ ببێت، و تۆ دڵخۆش ببیت، هەنگێ منیش شادو خۆشحاڵ دەبم چونکە ئەوسا لە ناخی دڵەوە هەستدەکەم کە منیش دیاریەکم پێشکەش کردووە".

پیرەمێر بەم قسانەی من تەواو ئاسوودە بوو، ئارامی گرت. دوو دانە سەعاتی دیکەش لە جەم ئێمە مایەوە. بەڵام لەم ماوەیەدا جێی بە خۆ نەدەگرت، هەڵدەستا دەجوڵا، ئێرەو ئەوێی دەکرد، لە یەکبینە قسەی دەکرد، یاری منداڵانەی دەگەڵ ساشادا دەکرد، بە دزیەوە منی ماچ دەکرد، نوقورچی لە باسکم دەگرت، لەپشتەوە زمانی لە ئانافیدوروڤنا دەردێنا و گاڵتەی پێدەکرد. ئیدی لە ئەنجامدا ئانافیدوروڤنا پولێکی پێوەنا و دەری کرد. بە کورتی پیرەمێر یەجگار خۆشحاڵ بوو، لەوە ناچوو بە عەمراتی ئەوەندە خۆشحاڵ بووبێ.

ڕۆژی **جەژنی** لە دایکبوونی پوکروفسکی، پیرەمێر ڕێك لە سەعات یازدەی تەواودا، یەکڕێ لە کڵێساوە هاتبوو، پاڵتۆیەکی جوان پینەکراوی لەبەر بوو، هەروەها وەکو بەڵێنی دابوو ئێلەکێکی تازەی لەبەر دابوو، وجووتێ پێڵاوی نوێی لە پێدا بوو، کۆمەڵێك کتێبی وەبن هەردوو هەنگڵی دابوو.

ئێمە هەموومان لەو دەمەدا لە لای ئانا ئیڤوروڤنا بووین، لە ژووری میوان ڕۆنیشتبووینو نانمان دەخواردەوە (یەك شەممە بوو). وا بزانم پیرەمێر

به باسی پزشکین که کەڵە شاعیرێکی نایابە دەستی بە قسان کرد. بەڵام لە پڕ سەرەداوی قسانی لە دەست بەر بوو وشپرزە بوو و بابەتەکەی گۆڕی‌و هاتە سەر باسی ئەوەی کە چەند پێویستە هەمووان رەفتارو ئاکاری باشمان هەبێت‌و ئەوەی رەفتاری باش نەبێ‌و رێگەی دروست نەگرێ چ بەڵایەکی بەسەر دێت.

و مەبەستی ئەوە بوو **ئەگەر** کەسێك رەفتاری دروست نەبێت، دەبێ بزانین رێگەی گومڕایی گرتووەو خووی خراپ بنیادەم بەرەو هەڵدێر دەبات، و تەنانەت چەند نموونەیەکی کارەساتاوی پەند ئامێز زیادەڕۆیی بادەنۆشیشی گێڕایەوەو بەوە کۆتایی بە قسەکانی هێنا کە ماوەیەکە رەفتاری خۆی چاك کردووەو رەفتاری ئێستای نموونەییە. تەنانەت باسی ئەوەشی کرد کە پێشتریش پەی بە دروستی **ئامۆژگارییەکانی** کوڕەکەی کردبوو،ودەمێکە ئەمەی بۆ دەرکەوتووەو قسەکانی وەکو گوارە لە گوێ کردووەو ئێستا بە کردەوە، نەك بە قسە، بادەنۆشی تەرك کردووە، بەڵگەش ئەمەیە کە ماوەیەکی زۆر پارەی پاشەکەوت کردووە، ئەمجا توانیویەتی ئەم کتێبانە بە دیاری بۆ کوڕەکەی بکڕێت.

که گوێم لە قسەکانی پیرەمێرد دەبوو، زۆر بە زەحمەت جڵەوی پێکەنین‌و گریانی خۆم پێ دەگیرا. زۆر چاك دەیزانی لە کاتی پێویستدا چۆن درۆ بکات! کتێبەکانیان بۆ ژوورەکەی پوکروفسکی بردو لەسەر رەفەیەکیان دانان، پوکروفسکی یەکسەر ئەم مەتەڵەی هەڵهێنا. پیرەمێردیان **دەعوەت** کرد کە نیوەڕۆژە لەگەڵ ئێمەدا بخوات. هەموومان ئەو رۆژە یەجگار شادو بە کەیف بووین، دوای فراڤین‌دەستمان بە کۆنکان کرد، ساشاو من لاساری‌و بزێوییەکی زۆرمان کرد. پوکروفسکی دەگەڵ مندا، بە لوتفو

میهرەبان بوو، وچەند جارێك هەوڵی دا دەرفەت بێنێ و بە تەنیا قسان دەگەڵ مندا بکات، بەلام من ئەو دەرفەتەم بۆ نەڕەخساند. ئەو ڕۆژە خۆشترین ڕۆژی سەرانسەری هەر چواردە ساڵەکەی تەمەنم بوو. ئێستا دەگەمە سەر بیرەوەریە تاڵ و خەمینەکان. ئیدی لێرەوە چیرۆکی ڕۆژە ڕەشەکانم دەست پێدەکات. ڕەنگە هەر لەبەر ئەمەش بێ کە قەڵەمەکەم خاو دەبێتەوە، جەنە دەبەستێ، لە تۆ وایە نایەوێ لەوەی پتر بنووسم. هەڵبەتە هەر ئەوەش واداری کردم بەو هەموو سۆزوگودازەوە، بەو هەموو تاسەبارییەوە ئەو هەموو وردەکاریە بێهودەیەی ژیانی بێ بایەخم لەو ڕۆژانەدا کە تیا شاد بووم، یاد بکەمەوەو بە قەڵەم و شەی بسپێرم. ئەو ڕۆژە خۆشانە زۆر کورت بوون، دوای ئەوە نۆرەی ڕۆژگاری خەم و پەژارەهات، ڕۆژگاری ڕەش و شووم، مەگەر هەر خوا بیزانێ کە ئەم خەم و پەژارەیە بە کوێ دەگات و کەی تەواو دەبێت نەگبەتی و ڕۆژ ڕەشی من بە نەخۆشکەوتن و مردنی پوکروفسکی دەستی پێکرد. دوو مانگێك پاش ئەو دوا واریقاتانەی گێڕامەوە نەخۆش کەوت ولە جێدا کەوت.

لەو یەك دوو مانگەی دواییدا هەوڵ و تەقەلایەکی زۆری دا، زۆری خۆ ماندوو کرد کە ژیانێك بۆ خۆی دابین بکات، چونکە ڕەزع و حاڵی خراپ و ناجێگیر بوو، پێشنیازی ئەوەیان بۆ کرد کە لە شوێنێکدا ببێ بە مامۆستا، بەلام لەم کارە بێزار بوو. لەبەر نەخۆشی و نالەباری تەندروستیشی نەیدەتوانی لەسەر هیچ کارێکی دەوڵەتی دابمەزرێ، خۆ ئەگەر داشمەزرایە، دەبوایە مارەیەکی زۆر چاوەڕوانی کردبا تا یەکەم قیستی مووچەکەی وەربگرێت.

به کورتی پوکروفسکی رووی دەکردە هەر لایەك جوابیان دەکرد، بەرە بەرە ورەی بەرداو مجێزی تێك چوو، ڕۆژ بە ڕۆژ باری تەندروستی خراپتر دەبوو، بەلام ئەو گوێی بە سەلامەتی‌و تەندروستی خۆی نەدەدا. پایز هات. هەموو ڕۆژێ بە پلتۆ تەنکەکەیەوە وەدەردەکەوت تا بە دوای کارا بگەڕێ، بەلکو لە شوێنێکدا کارێك بدۆزێتەوەو تۆزێ وەزعی باش ببێ، دیارە ئەم گەڕانە بێهوودەیە زۆری ئازار دەدا. پێلاوەکانی پڕ دەبوون لە ئاو. لەبەر باران تەڕ دەبوو، وبەو تەڕییە بۆ مالّ دەگەڕایەوە، تا ڕۆژێك ناچار لە جێگەدا کەوت، ئەو کەوتنەی کەوت ئیدی هەلنەستایەوە... لە ناوەڕاستی پایزدا، بەر لە کۆتایی ئۆکتۆبەر گیانی سپارد.

**دەتوانم** بلێم بە درێژایی ماوەی نەخۆشیەکەی، ژوورەکەیم چۆلّ نەکرد، چاودێری‌و پەرستاریم دەکرد، زۆرشەو تا بەیانی بە دیاریەوە نەدەخەوتم. زۆر جار وڕێنەی دەکرد، مەگەر هەر خوا زانیبای باسی چیدەکرد. باسی ئەو کارەی دەکرد کە بە دوویا دەگەڕا، باسی کتێبەکانی، باسی من، باسی باوکی...

بەمەدا هەندێ شتم دەربارەی **نهێنییەکانی** ژیانی بۆ دەرکەوت کە تا ئەو کاتە نەك هەر لێیان بێ ئاگا بووم، بەلکو مەزندەشم بۆیان نەدەچوو. لە سەرەتای نەخۆشیەکەیدا، هەموو خەلکی مالەکە زۆر بە غەریبی تەماشای منیان دەکرد، ئانا فیدوروڤنا کە تەماشای دەکردم سەری ناڕەزایی با دەدا، بەلام من چاوم دانەدەخست، ڕێك چاوم دەبڕیە دووڕ چاوی هەر کەسێك سەیری کردبام، بۆیە چیتر کەس لەسەر ئەوەی پەرۆشی پرکروفسکی بووم‌و پەرستاریم دەکرد لـووت‌و پـوونی لێنە دەکردم. بە تایبەتی دایکم.

هەندێجار پوکروفسکی دەیناسیمەوە، بەڵام زۆر بە کەمی دەیناسیمەوە. زۆریەی کات بێهۆش بوو. هەندێ شەو بە خەیاڵ گفتوگۆیەکی دوورو درێژی دەگەڵ کەسێکدا دەکرد. قسەکانی ڕوون نەبوون، دەنگی کە دەتگوت لە بنەبانی ئەشکەوتەوە دێ، کە لە ژوورەچکۆلەکەدا دەنگی دەدایەوە، دەتگوت دەنگدانەوەی نێو گۆڕە. لەو ساتانەدا هەستم بە ترس دەکرد. بەتایبەتی لە دوا شەودا وەکو شێتی لێهاتبوو، دووچاری ئازارێکی بێ ڕەزا بوو بوو، ئاهو ناڵەکەی روحی ئازار دەدام. هەموو ئەوانەی لە ماڵەکەدا بوون ترسیان لێ نیشتبوو. تەنانەت ئانافیدوروڤناش لە خوا دەپاڕایەوە رەحمی پێدا بکات و بەزووترین کات بۆ خۆیی بەرێتەوە. دکتۆرێکیان بانگ کرد. دکتۆرەکە گوتی نەخۆشەکە تا بەیانی دەمرێت.

پوکروفسکی پیر، هەموو شەوەکەی لەڕاڕەوەکەدا ولەبەر دەرگای ژووری کوڕەکەی بەسەربرد، هەر لەوێدا ڕایەخێکیان بۆ ڕاخست. هەرسا نا ساتێ خۆی بە ژووری کوڕەکەیدا دەکرد. دیمەنی کوڕەکەی بەو حاڵەوە بەڕاستی سامناك بوو. بە جۆرێ لە ژێر باری خەمو پەژارەدا داغان بوو بوو، لە تۆ رایە بەنج بروەو هەموو هەستو هۆشی لە دەست داوە. سەری لە ترسا دەلەرزی. ئازای بەدەنی دەلەرزی و لێوی دەجوڵاو لە بەرخۆیەوە شتی دەگوت ودەگوتەوە.. لە دڵی خۆدا گوتم ڕەنگە لە داخانا شێت ببێ.

نزیکی بەرەبەیان، پیرەمێرد کە خەم و عەزاب گیانەسەری کرد بوو لەسەر هەمان کۆنە ڕابەخ خەوی لێکەوت، خەوێك لەتۆ رایە مردووە.

لـه نێـوان سـەعات حـەوتو هەشـتی بەیانیـدا، ئـاوزینگ و گیانـەڵلای كوڕەكەی دەستی پێكرد، بابیم بێداركردەوە. پوكروفسكی لەوسـاتەدا بـە تەواوەتی وەهۆش هاتبووەوە، خوا حافیزی لـە هـەموومان كـرد. شـتێكی زۆر سەیربوو! نەمدەتوانی بگریم، بەڵام روحم ئەنجن ئەنجن دەبوو.

**بەڵام** دواساتەكانی تەمەنی بۆ من گەورەترین عـەزابو ئەشـكەنجە بـوون. پوكروفسكی بە زمانی لە كۆچوی پەیتا پـەیتا شـتێكی لـەمن داوا دەكـرد، منیش هەرچیم دەكـردو دەكۆشـا لێـی حـاڵی نـەدەبووم. نەمـدەزانی چـی گەرەكە. خەریك بوو لە داخو كەسەردا دڵم شـەقی دەبـرد. **پوكروفسـكی** یـەك دانـە سـەعاتی تـەواو بـەدەم گیانـەڵلاوە، بـیّ قـەراری كـرد، بێهـودە بـەدووی شـتێكدا دەگـەڕا، و دەیویسـت بـە دەسـتە ساردوسـڕەكانیو بەئاماژە ئـەو شـتە لـە مـن بگەیـەنیّ، بـەڵام بێهـودە. ئـەوجا بـەدەنگێكی خەفەی نامەفهوم كۆمـەڵێك وشـەی نـا روونـی وت كـە هەمـدیس نـەمتوانی بزانم چی دەویّ وگەرەكیە چی بە من بڵێت. هەموو ئەوانەم، كە لە ماڵـەوە بوون، هێنانە دیاری، ئاوم بۆ راگرت بەڵكو بیخواتـەوە، تاقـە كاردانـەوەی ئەوە بوو كە بە خەمێكی قووڵەوە سەری بادەدا.

ئەنجام لە مەبەستی حاڵی بووم. **داوای** لێكدەكردم پـەردەی پەنجەرەكـە لا بدەم و تاكەكانی بكەمەوە، پێدەچـوو بیـەویّ دوا نیگـای تیشـكی رۆژ بكات، نیگای ئەم جیهانەی خوا بكات، تەمەشـای خـۆر بكـات. پەردەكـەم لادایە لاوە، بەڵام تیشكی هەتاو زۆر كـزو رەنـگ زەردو خـەمین بـوو، وەك ژیانی روو لە ژاكانو هەڵوەرینی ئەم پیاوە بەلەنگازە روو لە مردنـە. دنیـا هەتاو نەبوو، هەور بەری ئاسمانی گرتبوو. تەمومـژ هـەموو لایـەكی تـەنی بوو، چ ئاسمـانێكی بـە بـارانو تـەڵخ و تاریكو خـەمین بـوو! چـۆڕاوگەی

باران بە چوارچێوەی پەنجەرەکەدا دەهاتە خوارێو ئاوێکی پیس و سارد بە شووشەکەیدا دادەچۆڕا. هەموو شتێك تەڵخ و تاریكو مایەی بێزاری بوو. ڕوناکی کزی خۆر بە حاڵ دەهاتە ژوورەوەو نەیدەتوانی لەرزۆکی چرا چکۆلەکەی بەردەم پەیکەرەکەی مەسیح وەشێرێ. پوکروفسکی، بەدەم ئاوێلکەدانەوە، نیگایەکی پڕ خەمی منی کردو سەرێکی لەقاندو دوای چرکەیەك گیانی سپارد.

ئانافیدوروفنا ئەرکی ڕێورەسمی جەنازەی لە **ئەستۆی** خۆی گرت. سادەترینو هەرزانترین تابووتی کڕیو گالیسکەیەکی بچوکی بەکرێ گرت. ئانافیدوروفنا بۆ ئەوەی قەرەبووی ئەو مەسرەفانەی خۆی بکاتەوە، دەستی بەسەر هەموو کتێبو شتەکانی دیکەی مردووەکەدا گرت. پیرەمێرد، لەگەڵیا بەشەڕ هات، کردی بە قەرقەشەو دەنگە دەنگ، چەندی توانی کتێبانی لێ سەندەوە، و هەمووی تەپاندنە گیرفانەکانیەوە، تەنانەت ژمارەیەکیشی لێ خستنە ناو کڵاوەکەیەوە، سێ دانە ڕۆژی تەواو لێی نەبووەوە، دەهاتو دەڕۆیی‌و کتێبی دەبردو تەنانەت ئەو ڕۆژەش کە دەبوا بۆ کڵێسا بڕوات دڵی نەدەهات کتێبەکان بەجێ بێڵێ.

بە درێژایی ئەو ڕۆژانە کزو ماتو بێهۆشو حەواس بوو، گێلو حۆلو خەمینو غەریب بە دەوری تابووتەکەدا دەسووڕایەوە، جارێ چەپکە گوڵی سەر تابووتەکەی ڕێك دەخستەوە، جارێ مۆمەکانی دادەگیرساند یان شوێنەکانی دەگۆڕینو جارێ دەیکوژاندنەوە. خویا بوو کە نیگەرانو بێ حەواسو پەرنەوازە بیرە. دایکمو ئانافیدوروفنا هیچیان لە ڕێوڕەسمی نوێژی مردووا، لە کڵێسا ئامادە نەبوون، دایکم لەبەر ئەوەی نەخۆش بوو،

بەڵام ئانافیدوروڤنا، هەرچەندە خۆی ئامادە كرد بوو كە بێت، بەڵام لە دوا ساتدا دەگەڵ پیرە مێرا بوو بە شەڕی، بۆیە نەهات.

**تەنیا** منو پیرە مێرد لە ڕێوڕەسمی نوێژی مردووا ئامادە بووین. لە گەرمەی ڕێوڕەسمەكەدا جۆرە خەمو ترسێك سەراپای داگرتم، دەتگوت پێشبینی قەوماوێكی ناخۆش **دەكەم**، لە كڵێساكەدا بەتۆبزی خۆم بەسەر پێوە گرتبوو. ئەنجام سەری تابووتەكەیان نایەوە، بزماریان لێدا،وخستیانە پشتی عەرەبانەیەكەوەو عەرەبانچییەكە بەلەز كەوتە ڕێ. هەر تا كۆتایی شەقامەكە بەگەڵ گالیسكەكە كەوتم، چونكە گالیسكەچییەكە لە ئەسپەكەیەوە ژەندو هەڵیكردە چوار ناڵە، پیرەمێر، بە دەنگی بەرز دەگریاو بە دووی گالیسكەكەدا غاری دەدا، گوڕی ڕاكردنەكەی دەیكردە كارێك كە گریانەكەی پچڕ پچڕ بێ. شەبقەكەی لەسەری كەوتبوو، و بۆ وەی لە گالیسكەكە دوا نەكەوێ، نەگەڕابووەوە هەلی بگرێتەوە.

باران سەرو پۆتەلاكی تەڕ دەكرد، وكزە بایەكی **سارد** بە دەموچاویا دەچزاو قوڕوسیانی سەر شەقامەكەی بە دەموچاویا دەپژاند. بەلام پیرەمێر هەستی بە هیچ نەدەكرد، بە دەم گریانەوە لەم دیوی گالیسكەكەوە بۆ ئەو دیوی غاری دەدا.

چمكر داوێنی پاڵتۆ شڕە تالكێشەكەی وەكو دوو باڵی باڵندە بە دەم بایەكەوە شەمایان دەكرد، هەر كتێب بوو ولە گیرفانەكانیەوە دەردەپەڕی دەكەوتە سەر زەوی، بەلام كتێبێكی ئەستووری، توند بە هەردووك دەستان گرتبوو، هەر لە خنكاوێك دەچوو پەلاماری بەلەمی ڕزگار بوون بدات، ڕێبوارانی سەر ڕێگاكە كلاوەكانیان لەسەر دادەگرتو

نیشانەی چەلیپایان دەکێشا. ژمارەیەکی دی دەوەستان‌و بە سەرسامی دەیانڕوانیە پیرەمێری بەلەنگاز، هەر سا ناساتیێ کتێبێك لە بەرکی پیرەمیر بەر دەبووەوەو دەکەوتە قوڕو چڵپاوی سەر جادەکە. خەڵکەکە رایاندەگرت‌و لە کەوتنی کتێبەکان ئاگاداریان دەکردەوە، پیرەمێر هەڵی دەگرتنەوەو دیسان بە غار دوای تابووتەکە دەکەوتەوە. لە گۆشەیەکی شەقامەکەوە پیرەژنێکی هەژار ی سواڵکەر ناسا، پیێ بە پێی ئەو بە غاردان دووی تابوتەکە کەوت.

**تەنیا** ئەم دوو کەسەی بە دواوە بوو. ئەنجام گالیسکەکە پێچی کردەوەو لە چاوم ون بوو. من بۆ ماڵ گەڕامەوە، هەرکە گەییشتمەوە بە دڵێکی بەجگار خەمینەوە باوەشم بە دایکمدا کرد، تا هێزم تیا بوو بە خۆمەوە قرساند، ماچ بارانم کرد، و بارانی گریانم دای کرد، هێندە بەترس‌و لەرزەوە دەمگوشی بە خۆمەوە، وەك ئەوەی بمەویێ دوا ئازیزو دۆستی ئەم دنیایەم توند لە ئامێز بگرم‌و نەیەڵم مەرگ ئەویشم لیێ بفڕێنیێ. بەڵام مەرگ لە ئێستاوە بەسەر سەری دایکە بەلەنگازەکەمدا دەسووڕایەوە.

٦/١١

**سەبارەت** بە پیاسەو گەڕانەکەی دوێنێمان لە دوورگەکاندا، زۆر منەتباری تۆم ماکار ئالکسیوڤیچ!، نازانم چۆن‌و بە چ زمانێك سوپاست بکەم؟

ئاو وهەوای دورگەکان چەند دلگیرو خۆش بوو، چەند سروشتێکی سەوزو جوان بوو! لە مێژ بوو سەوزەزارانم نەبینی بوو.بە درێژایی ماوەی نەخۆشییەکەم هەر بیرم لە مردن دەکردەوەو پێم وابوو مەرگم مسۆگەرە.

جا بە خۆت بیری لێ بکەوە کە دوێنێ، لەو گەشتەدا چ هەستێکم لەلا پەیدا بوو! لێم مەگرە کە دوێنێ ئەوەندە خەمگین بووم، ئەلهەقی زۆر زۆر خۆشحاڵ بووم. هەستم بە ئاسودەییەکی زۆر دەکرد. بەلام نازانم بۆچی هەمیشە لەم ساتە خۆشانەی ژیانمدا هەست بە جۆرە خەمینییەك دەکەم، هەمیشە گریان دەمگرێ‌و دەکەومە گریان، گوێ مەدەیە کە تۆزێك **گریام**. بەخۆشم نازانم بۆچی هەندێجار دەگریم.

بەتەبیعەت زۆر هەستیارم، زوو هەڵدەچم، کول‌وکۆڤانێکی سەیر ناوێتەی هەستەکانمە. رەنگە کزومانی کەش‌ر مەواکە، وساماڵی ئاسمان‌و بۆڵێڵی و زەردە پەڕی ئێواریێ،وئارامی ئاسۆ، هەر هەموو پێکەوە دەوریان لەمەدا هەبوویێ...

نازانم... **بەلام** دوێنێ لە وەزعو حاڵێکا بووم کە هەموو شتێك لەبەر چاوم خەمناك بوو، دڵم بە ڕادەیەك پڕبوو، ئەگەر نەگریابام، شەقی دەبرد. بەلام بۆچی ئەم شتانە بۆ تۆ بنووسم؟ ئەم شتە ناخۆشانە، ئەم شتانە چەند ناخۆش‌ر پڕ ئازارن، گێڕانەوەشیان ناخۆشترو بە ئازارترە.

بەڵام رەنگە تۆ لە من بگەی، لە هەمان کاتدا هەم شادو هەم خەمبار بووم! بەڵێ، بەڕاستی تۆ بنیادەمێکی باش‌و میهرەبانی ماکار ئالکسیوڤنا!

دوێنێ هەمیشە دەتڕوانیە چاوانی مــن تا هەستەکانم لە چاوانما بخوێنیتەوە،و بە شەوق و شادی من دەگەشایتەوە. هەر بڕە درەختێکی بچووکمان دیبا، بە هەر ڕێیەکدا نشێو بووینایەوە، لای هەر گۆماوێك وەستا باین.

تۆ دەکەوتیە پێشەوەو نیگای چاوانی منت دەکرد، وەك ئەوەی بە موڵك‌و زەوی‌و زاری خۆتام بگێڕی‌و جوانی ئەو موڵکانەم پێ نیشان بدەیت‌و خەمی دڵمیان پێ بڕەوینییەوە،و وادارم بکەی دڵبەندیان ببم. هەر هەموو ئەمە ئەوە دەسەلمێنێ کە تۆ دڵ‌و دەروونێکی باشت هەیە ماکار ئالکسیوڤیچ. لەبەر ئەوە زۆرم خۆش دەوێی. جارێ خوداحافیز. ئەمڕۆش نەخۆشم. دوێنێ پێیەکانم تەڕ بوون وسەرمام بووە. فیدوراش نەخۆشە، هەردووکمان نەخۆشین.

لە بیرم مەکە، زوو زوو سەرم بدە.

دڵسۆزت

ف. د

**

***ئازیزەکەم ڤرڤارا ئالکسیوڤنا*** ***٦/١٢***

فریشتەکەم، من لە دڵی خۆدا بە تەمای ئەوە بووم، گەشتە دوو قۆڵیەکەی ئەو ڕۆژەمان بە دورگەکانا بە چامەیەکی دوورو درێژ وەسف بکەی، کەچی سەیر دەکەم تەنیا یەك لاپەڕەی بچووکت بە پەخشان نووسیوە.

بۆیە ئەمە دەڵێم چونکە ئەوەی نووسیوتە بەڕاستی کەمە، بەڵام شتێکی یەجگار جوان، یەجگار نایابت نووسیوە! نامەکەت هەموو شتێکی لەخۆ گرتووە، هەموو شتێکی تیایە: وەسفی سروشتت کردووە، دیمەنی جۆراوجۆری گوندت وێنە گرتووە، و گوزارشتت لە شەریفترین هەستو سۆز کردووە، چما هیچ شتێك مارە ئەم نامە کورتە لە خۆی نەگرتبێ؟ بەڕاستی هەموو شتێکت زۆر بە جوانی وەسف کردووە.

من ئەو بەهرەیەم نیە. چەند لاپەڕان بە خەتە خوارو خێچەکەم ڕەش بکەمەوە، هەر هیچ دەرناچێت، خۆم تاقیکردووەتەوە، توانای بەهرەی وەسفکردنی هیچ شتێکم نیە.

دۆستە **ئازیزەکەم**، لە نامەکەتا دەڵێی، من بنیادەمێکی دڵو دەروون پاکم، کەسێکی شیر پاکم، دڵڕەشیم لە زاتو مەزەبا نیە، ناتوانم ئازار بە عەبدەل بەشەر بگەیەنمو ڕەحمەتو جوانی خوا وەکو چۆن لە تەبیعەتدا

بەرجەستەیە، بەو ئاوایە دەبینم، و تا حەز بکەی لە هەموو جۆرە ستایشێکت هەڵکێشام.

بەڵێ، هەموو ئەمانە راستن **ئازیزەکەم**، هەر هەمووی راستی راستە، بە ڕاستی من بە هەمان شێوەم کە تۆ دەڵێی، بە خۆیشم ئەمە دەزانم، بەڵام کاتێ ئەو بابەتە شتانەی کە تۆ دەینووسیت، دەخوێنمەوە، بەدەست خۆم نیە دڵم ناسك دەبێتەوە، پاشان بیرەوەریو هزری خەمناك بەسەرما دادەبارێت.

گوێ بگرە **قشتیلەکەم**، حەز دەکەم شتێکت بۆ بگێڕمەوە. وەختێ کە لە کاری دەوڵەتی دامەزرام، تەمەنم لە هەڤدەساڵ پتر نەبوو، یانی نزیکەی سی دانە ساڵە لە خزمەتدام، یانی دەتوانم دوای ماوەیەکی دی ئاهەنگی سییەمین ساڵیادی دامەزرانم لەم کارە بگێڕم. خوا دەزانێ لەو ماوەیەدا چەندم جلکی رەسمی دڕیوە!

ئیدی گەورە بووم، چوومەتە تەمەنەوە، فێری جدیەتو هەوڵو کۆشش بووم، ئاقڵ بووم، و فێری خەڵك ناسین بووم. ژیاوم، دەتوانم بڵێم بەڕاستی لەم دنیایەدا ژیاوم، دنیام دیتووە، تەنانەت سەردەمانێ دەیانویست کاندیدم بکەنو ناوم بدەن بە بەرپرسان تا نیشانەو میدالم بدەنێ.

لەگینە باوەڕم پێ نەکەی، **بەلاَم** دڵنیابە کە درۆت دەگەڵ ناکەم، ئەدی بۆ نەبوو؟

خەڵکانی بەد نە بانهێشت، ریسەکەیان کردەوە بە خوری، من لێتی ناشارمەوە دۆستە میهرەبانەکەم، کە پیاوێکی داخراوم، نەخوێنەوارم، بێگومان بێ ئەقلم، بەلام دڵی منیش وەکو دڵی هەر کەسێکی ترە.

دەزانی یەکێك لەو خەڵکە بە دا نە چی دەرهەق بە من کرد؟ شەرمم دێ بیگێڕمەوە —هەڵبەتە دەپرسیت بۆچی ئەو کارەی کرد؟

بۆیە ئەو کارەی کرد چونکە من کەسێکی سادەو ساکارو بێ وەیو هێدیو هێمنو میرەبان بووم! ئیدی ئەمەی پێ قووت نەدەچوو، دەبوایە باجی ئەمە بدەم.

ئیدی کەوتە جنێو پێدانم. هەوەڵجار پێی گوتم: "تۆ واەو وای ماکار ئالکسیوفیچ" پاشان گوتی: "لەوەی پتر چاوەڕێی چ شتێکی دی لە ماکار ئالکسیوفیچ دەکرێ! " لە دواییدا گوتی: "ئیدی ئەوە ماکار ئالکسیوفیچەو بە شەرت!

هەزارو یەك نۆرینی لە ژێر سەردایە ! " دەبینی ئازیزەکەم، دەبینی چی دەگەڵ کردم؟ هەمیشەو هەموو خەتاو کەمو کوڕیەك بە ملی ماکار ئالکسیوفیچ دا دەهێنرا.

ئیدی ناوی ماکار ئالکسیوفیچ لە سەرانسەری دایەرەدا بوو بە وێردی سەر زاران. هەر بەوەندەش وازیان نەهێنا کە کردیانم بە بنێشتە خۆشەی ژێر دانان، هەر بەوەندەوە نەوەستان کە ناویان کردم بە هاوتای جوێن، گیریان بە پێڵاوەکانمەوە، بە جلکە رەسمیەکەمەوە، بەسەرو چاومەوە، بە قژمەوە، بە سیمامەوە بەست، هیچ یەکێك لە مانەیان بە دڵ نەبوو، ودەبوایە هەمووی بە دڵی ئەوان بگۆڕم. ئەم گەڕو بەزمە، ئەم بەلایە هەموو رۆژێکی خوا، هەر حەوت رۆژی هەفتەکە دووبارە دەبووەوە.

ئەنجام راماتم، چونکە من دەتوانم خۆم دەگەڵ هەموو شتێکدا رابێنم، چونکە من کەسێکی لا شەڕم، کەسێکی سادەو خاکیم، بەڵام بۆچی ئەو بەزمەیان پێدەکردم، بۆچی گەڕیان پێدەکردم؟ زیانم بۆ کەس هەبوو؟

پلـەو پایـەی کەسـم داگرتبـوو؟ راپـۆرتم لـە کـەس دابـوو؟ پاداشـتی بـە نەهەقم وەرگرتبوو؟ زیادەکرێی خۆراییم داوا کرد بوو؟ بوختـانم بـۆ کـەس کرد بوو؟ ئەوپەڕی بێ ویژدانیـە گـەر گومـانی وا لـە مـن بکرێـت.یـانی لـە کەسێکی وەکو من دەوەشێتەوە شتی وابکەم؟

تـۆ بـە خـۆت حـوکم بـدە **ئازیزەکـەم**. ئایـا ئـەو جـۆرە کارانـە لـە مـن دەوەشێتەوە؟ ئەدی بۆچی ئەم هەموو هێرشە ناڕەوایەم دەکەنە سەر؟..

کەچی تۆ من بە بنیادەمێکی شایستەو پیاوێکی بەرێز دەزانـی، تـۆ سـەد قاتی هەموو ئەو خەڵکانە باشتری قشتیلەکەم. جا بـا لـە خـۆ بپرسـین کـە باشترین ئەرکو سوخەتی بنیادەمان چیە؟ دوێـنێ یفسـتاف ئیڤـانوڤیچ لـە گفتوگۆیـەکی تایبـەتی دا پێـی گـوتم گـەورەترین سـوخەتو ئـەرکی بنیادەمان ئەوەیە بزانێت چۆن یەك دنیا پارە کۆبکاتەوە.

بە سوعبەتەوە ئەوەی **گوت** (دەزانم بە سوعبەتەوە ئـەوەی گـوت) بـەڵام ئەو پەندەی پێویستە لە قسەکەی ئـەوەوە هـەڵێنجری، ئەمەیـە کـە مـرۆڤ لەسەرێتی فێـری ئـەوە بـبێ نـەبێت بـە بـار بەسـەر خـەڵکی تـرەوە، ومـن یەکێکم لەوانەی کە بار نیم بەسەر هیچکەسێکەوە! ئـەو پـارووە نانـەی کـە دەیخۆم بە رەنجی شانی خۆم پەیدای دەکـەم. راسـتە کـە پـارووە نـانێکی رووتە، زۆرجار نانی رشـکەو هیچـی تـر، بـەڵام بـە ئارەقـەی نێـو چـەوانو رەنجی شانی خۆم پەیدای دەکەم، و بێ منـەتو بـە حـەڵاڵیو سـەربەرزی دەیخۆم. ئیدی لەوەی پتر چیان لە بابایەکی وەکو من دەوێ؟

**من** دەزانم نڤیسـککاری (نوسـخەبرداری) شـوغڵێکی شایسـتە نیـە، بـەڵام لەگەڵ ئەمەشدا، مـن شـانازی بـە کارەکەمـەوە دەکـەم، نـانی خـۆم بـە

ئارەقەی نێو چەوان پەیدا دەکەم، ئایا ئڤیسککاری خەتایە، گوناحە؟
گاڵتەم پێدەکەن، قاقا پێدەکەنن.
"بابایەکی روونوسکارە... کاتبێکی مشك ئاسایە تەنیا ئەوە دەزانێ قەواڵەو سەنەدان روونووس بکاتەوە..." باشە ئەم کارە هیچ شەرمێکی تیایە، کارێکی بێ ئابڕووانەیە؟ دەست خەتم زۆر روونە، خەتم خۆشە، خەڵکی خوا خوایانە ببینن،سەرۆکیش زۆر لێی رازیە، گرینگترین قەواڵەو دیکۆمێنتی خۆی دەداتە من کە بۆی روونووس بکەم.
راستە من شێوازی ئەدەبیم نیە، لەو رووەوە سفری سفرم، نەفرەتی خوا لە شێواز بێ، هەر لەبەر ئەمەشە لە کارەکەمدا هیچ پلەو پایەیەکم پەیدا نەکردووە، هەر بۆیە ئێستاش بەم سادەیی، و بێ هیچ رازانەوەو جوانکارییەك نامە بۆ تۆ دەنووسم، هیچ وشەبازیەك ناکەم، شتەکە چۆن بە دڵمدا دێ‌و هەستی پێ دەکەم، بەو ئاوایە دەری دەبڕم... هەموو ئەمانە دەزانم.
باشە ئەگەر هەموو کەسێك نووسەر بوایەو بۆ خۆی شتی خۆی نووسیبایە، ئەنگێ کێ کاری روونووسی‌و کاتبی دەکرد؟
من ئەو پرسیارە لە تۆ دەکەم‌و تکایە وەڵامم بدەرەو پێم بڵێ من لەسەر هەقم یان نا؟ من دەزانم ئەمڕۆکە پێویستیان پێمە، ناتوانن دەستبەردارم بن، ئیدی بۆچی دەبێ خەڵکی بەبێ هۆ سەر بکەنە سەر بنیادەمێکی ئابڕومەندو بە قسەی نڕەهاتو پووچ قەڵسی بکەن؟
زۆر چاکە، مادامێکی لێکچوونێك لە نێوان من‌و مشکدا دەبینن با هەر بە مشکم بزانن! بەڵام ئەم مشکە پێویستە، ئەم مشکە سوودی خۆی هەیە،و

ئەم مشکە پاداشتو کریێ وەردەگرێت، کەواتە مشکێکی باشە... من مشکێکی لەو جۆرەم!..

جا **دۆستە** ئازیزەکەم لەوەی پتر باسی ئەم بابەتە ناکەم.. ببورە بە دەستی خۆم نەبوو هەندێ درێژدادڕیم کرد. بە هەرحاڵ بە تەما نەبووم ئەمەت بۆ بنووسم، ئیدی تۆزێك گەرم بووم! بە هەرحاڵ خۆشە پیاو ناو بە ناو خۆی بەسەر بکاتەوە. بە دوعا دۆستە ئازیزەکەم، کۆترە باریکەکەم، تەسەلابەخش وفێنکی دڵەکەم، بێگومان سەرت دەدەم، قەولت دەدەمێ کە سەرت دەدەم نوری چاوانم... جا تا دێم دڵتەنگ مەبە. کتێبێکت بۆ دێنم، جارێ بە **دوعا** ڤارینکا.

*دۆستی میهرەبان ودڵسۆزت*

*ماکار دیڤوشکین*

**

*ماکار ئالکسیوڤیچی رێزدارو ئازیز.* ٢٠/٦

به پەلە ئەم نامەیەت بۆ **دەنووسم**، چونکە کاری خەڵکیم لە لایە، دەبێ زوو تەواوی بکەم‌و بیدەمەوە دەستی خاوەنی. گوێ بگریە بزانە چیت پێ دەڵێم:

دەرفەتی سەودایەکی باش هەڵکەوتووە. فیدورا دەڵێت ناسیاوێکی دەستە جلکێکی رەسیمی کارمەندانی دەوڵەتی هەیەو دەیەوێ بیفرۆشێت، وەهەر نفت‌و نوێیە، لەگەڵ بێجامەیەک‌و ئێلەکێک‌و شەپقەیەکدا،وهەر هەمووی بە پارەیەکی هەرزان هەڕاج کردووە. باشە **بۆچی** تۆ نایکڕیت؟

خۆ ئێستا وەزعت خراپ نیە، و تۆزە پارەیەکیشت پاشەکەوت کردووە، بە خۆت پێت گوتم. ئیدی رەزیلی مەکە، رەزیلی بەسە، هەموو ئەم جلکانە بۆ تۆ پێویستن. تەمەشایەکی خۆت بکە، تەمەشایەکی جلەکانت بکە، شڕو شەپڕێو بوون. یەکپارچە پینەن، شەرم ناکەی؟

هیچ جلێکی تازەت لەبەردا نیە. من دەزانم پالتۆی رەسمی تازەت نیە، هەرچەندە خۆت دەڵێی هەتە، **خودا** دەزانێ چیت لێکردووە، پالتۆ تازەکەت بۆ کوێ بردووە، لە کوێت فرۆشتووە! وەرە مەردی چاك بەر بە قسەم بکە، ئەم جلکانە بکڕە. لەبەر خاتری من بیکڕە، ئەگەر منت خۆش دەوێ، هیچ لێی مەوەستەو بیکڕە.

چەند کراسێکت بەدیاری بۆ ناردووم، بەڵام تۆ بۆچی بەو شێوەیە ماڵی خۆت وێران دەکەی ماکار ئالکسیوڤیچ، تۆ خۆت نابووت دەکەی، بێگومان ئەو کراسانە پارەیەکی زۆریان تێچووە، بۆچی ئەو هەموو پارەیە لە پێناوی مندا خەرج دەکەی؟

بەڕاستی **پیاوێکی** دەستبڵاوی، چەند حەزت لە دەستبڵاوی بێهودەیە! من پێویستم بەم کراسانە نەبوو، هەر هەموویان زیادن، من زۆر چاك دەزانم کە تۆ خۆشتدەوێم، دڵنیای دڵنیام، زەرەیەك گومانم لەوە نیە، بۆیە پێویست ناکات بە دیاریی و سەوقاتی ئەمەم بیر بخەیتەوە.

بەڕاستی قەبوڵ کردنی ئەو دیاریانەم لەبەر گرانە، **چونکە** دەزانم چەند لەسەر تۆ دەکەوێ. یەك جار پێت دەڵێم واز لەم کارە بێنە، تێم دەگەی؟ تکات لێدەکەم، لێت دەپاڕێمەوە واز لەم کارە بێنە. ماکار ئالکسیوڤیچ، داوات لێ کردووم پاشماوەی یاداشتەکانمت بۆ بنێرم، حەز دەکەی ئەم یاداشتانە تەواو بکەم. من خۆیشم نازانم چۆن توانی بووم ئەوەندەی کە بۆم ناردبووی بنووسم! بەڵام ئێستا بە خۆما ڕاناپەڕمووم بگەڕێمەوەو باسی ڕابردووی خۆم بکەم، تەنانەت حەز ناکەم بیریش لەم ڕابردووە بکەمەوە، دەمەوێ فەرامۆشی بکەم، من لەو ڕابردوو وبیرەوەریانە، لە هەر هەموویان دەترسم، خۆ باسی **دایکە** کڵۆڵەکەم، کە کیژە بێ نەواکەی لە نێو ئەم ئەهریمەنانەدا بەجێهێشت، بۆ من لە هەر شتێکی دیکە بە ئازارترە. کە بیر لەو شتانە بکەمەوە دڵم خوێن دەدەڵێنێ. هەر هەموو ئەم بیرەوەریانە هێشتا لە یادگەی مندا زندوون، ونە پەرژارم هەر بیریان لێ بکەمەوە چ جای کە بمەوێ ڕێکیان بخەمو بیان نووسمەوە، هەموو

ئەم رووداوا نە تەنیا یەك سڵیان بەسەرا تێپەڕیوە، بە خۆیشت هەموویان دەزانیت.

با باسی ئانافیدوروڤنات بۆ بکەم، بەوەم تاوانبار دەکات کە سپڵەو پێ نەزانم، هەرگیز ئەو تۆمەتەی قەبوڵ نیە کە شەریکە تاوانی بیکۆف بووە. داوام لێدەکات بچمەوە لەگەڵ ئەو و لە ماڵەکەی ئەودا بژیم. دەڵێت من بە پیتاكو سەدەقە دەژیم، دەڵێت من کەوتوومەتە سەر هەڵدێرێکی هەزار بە هەزار، و رێگەی گومڕاییم گرتووەتە بەر.

**بەڵێن** دەدات ئەگەر بگەڕێمەوە جەم ئەو، بە خۆی قسان دەگەڵ ئاغای بیکۆف دەکاتو هەموو کاروبارەکان راست دەکاتەوەو ناچاری دەکات قەرەبووی هەموو هەڵەکانی دەرهەق بە من، بکات. دڵێت ئاغای بیکۆف ئامادەیە جیازیەکم بداتێ.

با بۆ خۆی بڵێ، حەز دەکەم وەڵامی نەدەمەوە! من لێرە خۆشحاڵم، لەگەڵ تۆ، لەگەڵ فیدورای میهرەبانندا خۆشحاڵم. کە دڵسۆزیەکەی دەرهەق بە من، دایەنە پیرەکەم وەیاد دێنێتەوە.

هەرچەندە تۆ لە خزمە دوورەکانی منی، **بەڵام** تۆ بە زەبری ناوو ئابڕوت دەمپارێزیت. بەلام ئەوانە، من مەعدەنەکەیان دەناسم، دەزانم لە چ قوماشێکن، هەوڵ دەدەم، ئەگەر بتوانم لە هزرو بیرەوەری خۆمیان بسڕمەوە. لەوەی پتر چیان لە من گەرەکە؟ کەمیان پێکردم؟ فیدورا دەڵێت هەر هەموو ئەمانە قسەی رووتنو لە ئەنجامدا بێزاردەبنو وازم لێدێنن. لە خوام گەرەکە قسەکەی فیدورا ڕاست دەربچێ.

ف. د.

**کۆترەکەم، ژیکەڵەکەم!** ٦/٢١

دەمەوێ **نامەت** بۆ بنووسم، بەڵام نازانم لە کوێوە دەست پێبکەم.
یانی سەیر نیە کە ئێستا ئێمە ئەوەندە لە یەکترەوە نزیکین، بەمجۆرە دەژین؟! بۆیە ئەمە دەڵێم چونکە هیچ کاتێ، بە عەمرام ئەوەندە شادو دڵخۆش نەبووم. لە تۆ وایە خودا ماڵو منداڵو خانەوادەیەکی پێ بە خشیوم!

ئازیزەکەم، ڕۆڵەکەم، کچۆڵە **جوانەکەم**، ئەو قسانە چیە دەربارەی ئەو چوار کراسەی کە بۆم ناردبوویت دەیکەیت؟ تۆ پێویستت پێیانە، من ئەمەم لە فیدورا دەرهێناوە.
من ئەو کاتانە شادم کە بتوانم دڵی تۆ خۆش بکەم، ئارەزووەکانی تۆ بێنمە دی، جا لەم خۆشیە بێ بەشم مەکە، **خەمبارم** مەکە، عاجزم مەکە، هیچ خوتە و بۆڵەیەك مەکە، لە عەمرام ئەم خۆشیەم بەخۆوە نەبینیوە، ئێستا هەست بە ژیان دەکەم. هەستدەکەم دوو چەنانە دەژیم، چونکە تۆ لە نزیکی منا ئاکنجیت، ئەمە زۆرم شادو دڵخۆش دەکات، ئێستا منیش ناسیاوو ئاشنایانم هەیە، هاتوچۆم هەیە، ئەمڕۆ یەکێك لە کرێ نشینانی ماڵەکە، (راتازاییف) دەعوەتی چا خواردنەوەی کردم، راتازاییف هەمان ئەو فەرمانبەرەیە کە شەو کۆڕی ئەدەبی ساز دەکات. ئەمشەو کۆڕێکی ئەدەبی ساز دەکات، بڕیارە کۆوەبینو باسی کارێن ئەدەبی بکەین.

جا ئێمە ئێستا ئاوا رادەبوێرین! جاری بە دوعا، من ئەمانەم بێ هیچ مەبەستێکی تایبەتی بۆ نووسیویت، تەنیا بۆ ئەوەم نووسیوون کە بزانیت چەند وەزعو حاڵم باشە. تەندروستیم باشە. ئازیزەکەم بە تیریزات گوتبوو کە پێویستت بە تۆزێك ئاوریشمە بۆ گوڵدۆزیەکانت، بۆتی دەکڕم قشتیلەکەم، ئاوریشمت بۆ دەکڕم. بەشانازیەوە سبەینێ ئەم ئاواتەت دێنمە دی، ئەم داوایەت جێبەجێ دەکەم، من دەزانم ئەو شتانە لە کوێ دەفرۆشن. جارێ خودا ئاگادارت بێ.

*دۆستی دڵسۆزت*

*ماکار دیڤشکین*

**

*خانمی ئازیز، فرفارا ئالکسیوفنا* ٦/٢٢

پێویستە ئاگادارت بکەمەوە خانمی هەرە **ئازیز** کە بەڵایەکی گەورە لە ماڵەکەماندا روویداوە، بەڕاستی قەوماوێکی خەمناکە!

ئەم بەیانیە، دەوروبەری سەعات پێنج کوڕە چکۆلەکەی خات گورشکۆف قەزاو بەڵای تۆی برد، نازانم بە چ نەخۆشیەك مرد، تیفۆ بوو یان نەخۆشیەکی دی، چوومە **ماڵی** گورشکۆف، کە خەڵکێکی کلۆڵو داماون، مەگەر خوا بە خۆی بزانێ بە چ هەژاریەك دەژین، چەند نەبوون، هەر هەموویان لە یەك ژوورا دەژین، هەر بۆ پاداشتنی ئابڕوو بە پەردەیەکی سادە کردوویانە بە دوو بەشەوە. پێشوەختە تابووتێکی چکۆلەیان پەیدا کردبوو–تابووتێکی زۆر سادە بەڵام جوان:

بە حازری کڕیبوویان، کوڕەکەیان دە ساڵان بوو، زۆریان دڵ پێ خۆش بوو، هیوایەکی زۆریان پێی هەبوو.

بەڕاستی پیاو بە دیتنیان خەمبار دەبێت ڤارینکا گیان! دایکەکە ناگری، بەڵام هەر کەسێك بیدینێ هەست دەکات چەند خەمگینە، چەند داماوە. رەنگە بە مردنی ئەم کوڕیژگەیە ئانخۆرێکیان لێ کەم بوو بێتەوە، بەڵام دوو منداڵی دیکەشیان هەیە، منداڵێکی بەر مەمکەو کچۆڵەیەکی شەش ساڵان یان کەمێ گەورەتر.

چ لەوە ناخۆشترە **منداڵێک** ببینی، منداڵی خۆت، پارچەیەك لە جەرگت، بەدەم ئازارەوە بتلێتەوەو نەتوانی هیچی بۆ بکەی. بابەکەی لەسەر

کورسیەکی شەق‌و شڕ دانیشتبوو، جلێکی شڕو شەپڕێوو چڵکنی لەبەردا بوو، لە جێی خۆی نەدەبزووت، بەڵام خوڕ خوڕ ڕوندك بە ڕوومەتیا دەهاتە خوارێ.

ئیدی لەوەیە لە داخ و کەسەردا بووبێ، یان لەوەیە تەنیا خووی پێوە گرتبوو بێ- **چاوەکانی** کزو پرووش دایمە هەویان کردبوو. چ پیاوێکی بە حەیاو حورمەت‌و غەریبە ! کە قسەی دەگەڵدا دەکەی سوڕ هەڵدەگەڕێ، دەپەشۆکێ و دەمی دەکەوێتە تەتەڵەو نازانێ چ بڵێ. کچە چکۆڵەکەیان مات‌و خەمبار بە دیار تابووتەکەوە دانەوی بووەوەو حایرو سەرگەردان‌و بەستەزمان لە فکران ڕاچوو بوو!

ڤارینکای ئازیزم، دەزانی کە منداڵان دەبینم لە فکران ڕاچوون، دڵم دەگوشرێ؟ دیمەنێکی یەجگار خەمناکە !

**بووکەڵەیەکی** لە پەڕۆ کۆن چێکراو لە بەردەمیا کەوتبوو، بەڵام کچۆڵەکە گەمەی پێنە دەکرد، مات‌و بێ جوڵە لەو گۆڕە وەستابوو، ڕیەکێك لە قامکە چکۆڵەکانی لە زاری ڕاکرد بوو. خاوەن ماڵەکە نوقوڵێکی دایە، نوقوڵەکەی وەرگرت بەڵام نەیخوارد. دیمەنێکی خەمناکە ڤارینکا گیان، وا نیە ؟

*ماکار دیوشکین*

**

*ماکار ئالکسیوڤیتچی ئازیزم* ٦/٢٥

کتێبەکەت بۆ دەنێرمەوە، کتێبێکی یەجگار بێ کەڵك بوو، شایستەی ئەوە نیە پەڕەکانیشی هەڵبدەیتەوە. بنیادەم شەرم دەکات هەر بە دەستەوەی بگرێ. ئەم گەنجە بە نرخەت لە کوێ پەیدا کردووە؟
بەبێ سوعبەت ئایا بەڕاستی حەزت لەم جۆرە کتێبانەیە ماکار ئالکسیوڤنا؟ ماوەیەك لەمەپێش قەولیان داومەتێ کتێبێکم بۆ خوێندنەوە بۆ بێنن. ئەگەر حەز بکەی بە ئامەنەت دەتدەمێ. بەلاّم جارێ خودا حافیز. بە ڕاستی ماوەم نیە لەوەی پترت بۆ بنووسم.

ڤ. د.

**

*ڤارنیکای ئازیزم:* ٢٦/٦

**ڕاست** دەویٚ من ئەم کتێبە تورەهاتەم نەخوێندبووەوە، قشتیلەکەم. تەنیا چاوێکم بە چەند دێڕێکیا خشاندو خۆش هاتە بەرچاوم، تەنیا بۆ پێکەنین و سەرگەرمی نوسراوە، بۆ ئەوەی خەڵکی بخاتە پێکەنین. لە دڵی خۆدا گوتم: ڕەنگە ڤارنیکاش حەزی لێبکات بۆیە کڕیمو بۆم ناردیت. بەڵام قەیدی نیە، ڕاتازاییف بەڵێنی داومەتیٚ کتێبانی ئەدەبی جدیم بە ئامەنەت بداتیٚ، هەنگیٚ تۆش کتێبی باشت دەبن ژیکەلەکەم.

ڕاتازاییف شارەزای ئەدەبە، **زۆر** بەلەدە، بە خۆیشی ئەهلی قەڵەمە، دەنووسێت. نووسەرە. قەڵەمێکی زۆر چالاکی هەیە، جا چ شێوازێکی جوانی هەیە، دەریایەکە لە شێواز، بەسەر هەر وشەیەکدا زاڵە، بۆ هەر وشەیەك شێوازێکی هەیە، شتێکە ئەقڵ قەبوڵی ناکات. هەر ڕستەیەکی سادەی بدەیتیٚ، تەنانەت ڕستەی بازاڕیو سواویش، لەو بابەتە ڕستەو وشانەی کە من بۆ نموونە هەندێجار بە ڤالدونیو تیریزیان دەڵێم، دەتوانیٚ شێوازێکی یەجگار جوانی بە بەردا بکات.

منیش دەچمە شەوکۆڕە ئەدەبیەکانی، ئێمە قلیان دەکێشینو ئەویش شتمان بۆ دەخوێنێتەوە، هەندێجار پێنج دانە سەعات لەسەر خوێندنەوە بەردەوام دەبێتو ئێمە گوێ دەگرین. ئەدەبیات نیە، ئاهەنگی پەیڤانە! یەجگار بەلەزەت، فرەخۆش، **جوان** ئەمما جوان! وەکو گوڵان، ڕێك میناکی گوڵستانە، دەتوانی لە هە ر لاپەڕەیەکیا چەپکە گوڵێك بچنی! بە

خۆیشی تا بڵێی پیاوێکی ناسک‌و میهرەبان‌و خۆشەویست و سەنگینە. من لە بەردەم ئەودا چیم، ها؟ هیچ.

ئەو **پیاوێکی** بە ناقو دەنگە، من چیم؟ من لە چاو ئەودا هیچ نیم، هەر هیچ نیم، کەچی لەگەڵ کەسێکی وەکو منیش دا هەر خۆشرەفتارو میهرەبانە. من هەندێ شتی بۆ دەنووسمەوە. بەڵام ڤارینکا وا خەیاڵ نەکەی بۆیەم دەگەڵ میهرەبانە چونکە ئەو شتانەی بۆ دەنووسمەوە. هەرگیز باوەڕ بەو جۆرە دەمگۆو بانگەشانە مەکە ڤارینکا گیان. باوەڕ بەو دەمگۆ غەرەزئامێزانە مەکە! نا، نا، من ئەم کارە بە ویستی خۆم دەکەم، کەس زۆری لێنەکردووم، بۆیە ئەم کارە دەکەم تا دڵی خۆش بکەم، ئەویش بۆیە دەگەڵم میهرەبانە تا دڵم خۆش بکات. دڵنیابە لەمە. پیاوێکی باشە، زۆر میهرەبانە، و نووسەرێکی بێ هاوتایە.

ئەدەبیات شتێکی سەیرە ڤارینکا **گیان**، شتێکی یەجگار سەیرو جوانە، من پێرێ لە جەم ئەم پیاوانە ئەمەم کەشف کرد. ئەدەبیات شتێکی قووڵە!

دڵی بنیادەم بەهێز دەکات، ورەی بەرز دەکاتەوە، ئەقڵی دەوڵەمەند دەکات، سیقاڵی دەکاتەوە، زۆر شتی فێر دەکات. هەر نامیلکەیەکی ئەمانە پڕە لە شتی سەیرو جوان‌و ئاوازە. چەند جوان‌و بەرز دارێژراون! ئەدەبیات تابلۆیە، یانی تابلۆو ئاوێنەیە، دەربڕینی هەست‌و سۆزە، رەخنەیەکی ناسکی ناسکە، وانەی پەندو ئامۆژگارییە، راستکەرەوەی رەوشت‌و ئاکارە، بەڵگەنامەیە.

هەر هەموو ئەم شتانە لەوانەوە، لە نێو ئەواندا فێربووم. جا راست‌و رەوان پێت دەڵێم ڤارینکا گیان، کە وەختێ لە نێو ئەوانا دادەنیشم و

گوێ دەگرم (کە وەکو ئەوانیش قلیانێك دەکێشم) و دەبینم باسی بابەتی جۆراو جۆر دەکەن، لە پڕ هەست بە نیگەرانی، بە شپرزەییەکی زۆر دەکەم، هەست بە شەرمو شورەییەکی فرە دەکەم.

خەڵکی وەکو من و تۆ لەو جۆرە کۆڕو نێوەندەدا تەنیا ئەوەمان لە دەست دێ قوپو قەپ بێدەنگ بین.

لەو جۆرە کۆڕانەدا هەست دەکەم کەسێکی کەودەنم، **شەرم** لە خۆ دەکەم، بە درێژایی شەو مێشکم دەخەمە کار تا بەڵکو منیش وشەیەك، نیو وشە بدۆزمەوەو لە باسو خواسەکاندا بەشداریەك بکەم، بەڵام وشەم لێ دەچنە قاتی و بەدەستەو نایەن!

تەنانەت ئەو کارەشم لە دەست نایەت! ئیدی لەو ساتانەدا دڵم بە خۆ دەسووتێ ڤارینکا گیان، دڵم بە خۆ دەسووتێ چونکە من لە ئاستی ئەواندا نیم، وەك دەڵێن بە کەلەش گەورەو بە ئەقڵ بچووکم.

بۆ نموونە کاتی دەست بە تاڵیم بەچی بەسەر دەبەم؟ دەخەوم، کە بێ ئەقڵم، لە کاتێکا دەتوانم لە جیاتی ئەو هەموو خەوە زیادەیە، خۆم بە شتێکی باشەوە مژوڵ بکەم، بۆ نموونە دەتوانم دانیشم و شتێك بنووسم.

ئەمە هەم بۆ خۆم خۆشەو هەم بۆ خەڵکی تریش **خۆشە**. خۆزیا دەتزانی ئەو نووسەرانە بێ چاوێنی بن، لە بری نووسینەکانیان چەند وەردەگرن، بە نووسین چیان دەستدەکەوێ! حەڵاڵیان بێ یاخوا! بۆ نموونە تەمەشای ئەم راتازایفە بکە!

چ پارەو پولێکی زۆری دەستدەکەوێ! نووسینی یەك لاپەڕەی چاپی چەندی وەخت دەوێ؟ دەتوانێ رۆژی پێنج دانە لاپەڕان بنووسێت، بۆی گێڕامەوە کە لە بری هەر لاپەڕەیەك سێ سەد رۆبڵ وەردەگرێت. کە

حیکایەتێکی کۆمیدی یان ڕووداوێکی سەیر دادەڕێژێتەوە پێنج سەد ڕۆبڵی لە بری وەردەگرێت.. بگرە هەندێجار هەزار ڕۆبڵیش وەردەگرێ، بەڵام ئەم حاڵەتە زۆر کەمە...

تۆ لەمبارەیەوە چ دەڵێی ڤرڤارا ئالکسیوڤنا؟ ئەمە هەموو شتێك نیە... تەسەور بکە، دەفتەرێکی **چکۆڵەی** هەیە کە شیعرەکانی تیا نووسیوەتەوە، هەڵبەتە چامە درێژەکانیشی تیا نیە، داوای حەوت هەزار ڕۆبڵی لێدەکات!

جا بزانە! ئەمە پارەیە نە گاڵتە، یەك تەلاری گەورەی پێ دێ، دەڵێت ئامادەن پێنج هەزار ڕۆبڵی بدەنێ، بەڵام نایدات. ویستم قەناعەتی پێ بکەمو بێتە ڕەدایە، پێم گوت: " برا پێنج هەزار ڕۆبڵەکە لەو کلاوچیانە وەریگرە، وەریگرە، پێیان رابوێرە، پێنج هەزار ڕۆبڵ پارەیە نە گاڵتە! کەچی گوتی: نا، حەوت **هەزارم** دەوێ، ئاقیبەت ئەو کلاوچیانە حەوت هەزارەکە هەر دەدەن".

ئەلهەقی پیاوێکی زرینگە.

قشتیلەکەم مادامێکی هاتورمەتە سەر باسی ئەو، کتێبێکی هەیە بە ناونیشانی "ڤیانی ئیتالیایی" بۆچی پەرەگرافێکت لەو کتێبە بۆ نەنووسمەوە؟ پەرەگرافەکە بەمجۆرەیە، بیخوێنەرەو پاشان خۆت حوکم بدە:

".... ڤلادیمیر دەلەرزی، سۆزو کەڵکەڵەو خولیاکانی ناخی شێتانە خرۆشابوو، خوێنی هاتبووە جۆش...

هاواری کرد: "کۆنتیس، کۆنتیس! تۆ رادەی ئەم سۆزو گودازە ترسناکە نازانی، تۆ رادەی سەوداسەری شێتانەی من نازانی، نا، نا، خەونەکانم

درۆم دەگەڵ ناکەن، من ئاشقی تۆم، دڵبەندی تۆم، من شێتانە، کێویانە،هۆڤیانە، سەوداسەرانە عاشقی تۆم! خوێنی دەمارەکانی مێردەکەت ناتوانێ پشکۆی ئەم ئەشقە شێتانەو پڕ خرۆشەی من دابمرکێنێتەوە! کۆسپ و وردە لەمپەران ناتوانن بەری ئەو شەپۆلە خرۆشاوانە بگرن کە دڵیان هێناومەتە لەرزەو لە گەڕانەوە نایەن، هەروەها ناتوانن ئەو ئاگرە دۆزەخیەی کە بەر بووەتە دڵمو دەروونی شەکەتو تینووم، دابمرکێننەوە. ئاخ زینایدا، ئاخ زینایدا!..

کۆنتیس، سەری خستە سەر شانیو لە بن لێوانەوە گوتی:

"فلادیمیر!

سمیلسیکی بەوپەڕی جۆش و خرۆشو شادیەوە هاواری کرد:

"زینایدا!"

لە کانگای دڵەوە هەناسەیەکی هەڵکێشا، ئاگرێک بەر بووە میحرابی ئەشق، و سینەی ئەم قوربانیە بێ نەوایانەی هێنایە لەرزە.

کۆنتیس کە بە دەم لەزەتی ئەشقەوە، سینەی بەرزو نزم دەبووەوە، چاوانی پرشنگیان دەداو گۆناکانی سوور هەڵدەگەڕان، لە بن لێوانەوە گوتی:

– فلادیمیر!...

زەماوەندێکی قاژە و سامناک گەیی بووە لوتکەی خۆی.

دوای نیو سەعاتێك، کۆنتی پیر، خۆی بە زووری نووستنی هاوسەرەکەیدا کرد. بە ئەوازشەوە دەستێکی بە گۆنای کۆنتیس دا هێناو گوتی: "زۆر چاکە مامزەکەم، چۆنە ئێستا لەبەر خاتری میوانە ئازیزەکەمان سەماوەری لێ دەم بدەی؟"

ها قشتیلەکەم ئێستا چ دەڵێی، رات چیە؟ راستە کەمێك گۆساخی تێدایە.. ئەمە شتێك نیە بشاردرێتەوە، بەلام قسەیەکی جوانە، بە شێوازێکی شیرین نووسراوە! ئیدی شتی جوان، جوانەو نکۆڵی لێ ناکرێت. ئەگەر رێگەم بدەی پەرەگرافێکی بچووکی دیکەشت لە چیرۆکی (ئیرماك‌و زولەیخا)وە بۆ دەنووسمەوە.

پوختەی چیرۆکەکە ئەمەیە کە (ئیرماك)ی قۆزاق، قسەو پیاوە مۆڤییە ترسناکە وەختێ سیبریای گرت، ئاشقی زولەیخا بوو، زولەیخا کیژی (کوچوم)ی تزاری سیبریایە کە ئیرماك بە دیلی گرتوویەتی. ئەم رووداوە هی سەردەمی ئیڤانی سامناکە، کە خۆت باشتری دەزانی. ئەمە دەقی گفتوگۆی نێوان ئیرماك‌و زولەیخایە:

"باشە زولەیخا تۆ منت خۆ دەوێ؟ پێم بڵێ کە خۆشت دەوێم...

زولەیخا لە بن لێوانەوە گوتی: "خۆشم دەوێی ئیرماك.

"سوپاس‌و ستایش بۆ تۆ ئەی **ئاسمان**! من بەختەوەرو شادم!.. هەموو شتێکت پێ بەخشیم، هەموو خەون‌و ئاواتەکانی دڵەی لاسارمت هێنایە دی، لە هەرزەکاریمەوە تا ئێستا هەر خەون‌و ئاواتێکم هەبووە، هێناتەدی. کەواتە ئەی ئەستێرەی بەخت، هەر تۆ بووی منت بۆ ئێرە بکێش کرد، کەواتە لەبەر ئەمە بوو منت بۆ ئەم شوێنە دوورە، بۆ ئەودیوی سنووران بکێش کرد. کارێکی وەها دەکەم هەموو خەڵکی دڵبەندی زولەیخای ئازیزم بن، و هیچ پیاوێك، هیچ یەکێك لەو ئەهریمەنانە زات نەکەن‌و نەوێرن لۆمەم بکەن، تۆمەتبارم بکەن! ئاه بریا دەیانتوانی وازی ئازارەکانی روحی ناسکی هەڵێنن، و ئەو شیعرە ئاپایەیان دەبینی کە لە هەر فرمێسکێکی زولەیخای مندا پەنهانە! ئاه...

لێمگوێ با بە ماچ ئەم فرمێسکەت بسڕم، لێمگەڕێ با ئەم فرمێسکە موبارەکەت بنۆشم، ئەم فرمێسکە خواییەت... ئەی کچی ئاسمان..

زولەیخا گوتی:

ئێرماك خەڵکی شەڕانین، خەڵکی زاڵمن، دوامان دەکەون تا ئازارمان بدەن، ئەم کارەی ئێمە قەبوڵ ناکەن، مەحکوممان دەکەن، ئێرماکی **ئـازیزم!** ئاخر کچێکی بێنەوا کە لە زاگەی خۆیدا، لە نێو بەرو بەستەڵەکی سیبریادا پەروەردەو گەورە بووبێ‌و کە جگە لە ژێر خێوەتەکەی بابی هەرگیز لە شوێنێکی دیدا نەژیابێ، دەتوانێ لەم جیهانە ساردو سڕو بێ گیان‌و خۆپەرستەی ئێوەدا چ بکات؟ خەڵکی لە من حاڵی نابن ئەی خۆشەویستی من، ئەی شۆڕە سوارەکەی خەون‌و خەیاڵی من! ئەی ئەشق‌و ئەڤینی من!

چاوانی ئێرماك بە شێوەیەکی ترسناك ئەبڵەق بوون، هاواری کرد: "هەنگێ شمشێرەکەی قوزاق لە کێلان دەردێت و بەسەر سەریانەوە دەکلێنێ..

جا تۆ بهێنە بەر چاوی خۆت **ڤارینکا** گیان، وەختێ ئێرماك بەکوشتنی زولەیخا بزانێ چەند نیگەران دەبێ‌و چۆن دەهاڕوژێ!

پیرەمێری نابینا، کوچوم، لە ژێر پەردەی تاریکی شەودا، لە غیابی ئێرماك دا، بە دزییەوە خۆی بە سەراپەردەکەیدا دەکات‌و گۆشاوگۆش کیژەکەی خۆی سەر دەبڕێت، تا بەمە جەزرەبەیەکی گورچوبڕ لە ئێرماك بدات، کە بینایی چاوان‌و تەخت‌و تاجەکەی لێ داگیر کردبوو.

ئێرماك، لە حاڵێکدا بە دەم توڕەبوونێکی شێتانەوە، خەنجەرە پۆڵاینەکەی لە هەسانی جادوویی دەدا هاواری کرد:

"دەنگی لە هەساندانی پۆلا چەند خۆشە! حەزم لە خوێنە، حەزم لە خوێنە! دەبێ هەر هەموویان بکوژم، دەبێ سەریان لە لاشە جیا بکەمەوە، دەبێ تاقوبڕیان بکەم،دەبێ پارچە پارچەیان بکەم!".

ئێرماك، دوای هەموو ئەم کارانە کە دەبینێ بەبێ زولەیخای مەحبوبەی هەڵناکات، خۆی دەخاتە رووباری ئێرتیش‌و دەخنکێ‌و چیرۆکەکە بەوە کۆتایی دێت.

جا **ئێستا** ئەم پەرەگرافە کورتەش بخوێنەوە. ئەمە نموونەیەکە لە شێوازی وەسفی کۆمیکی کە تەنیا بەو مەبەستە نووسراوە خەڵکی بێنێتە پێکەنین: "ئێوەی ئیڤان پروکوفیوڤیچ ژلتوپوزوف (ترسنۆك) دەناسن؟ مەبەستم هەمان ئیڤان پروکوفیوڤیچە کە لاقی پروکوڵ ئیڤانوفیوڤیچی گەست. ئیڤان پروکوفیوڤیچ بنیادەمێکی توندە تەبیعەتە، زوو تورە دەبێت، بەڵام کۆمەڵێك بەهرەو سوخەتی چاکی دەگمەنیشی هەیە، لەلایەکی ترەوە پروکوڵ ئیڤانوفیوڤیچ ئاشقی خواردنی ترپوکە ڕەشەو هەنگوینە. ئەمە ئەو کاتانە کە هێشتا دڵبەندی پلاگیا ئانتۆنوفنا بوو... بەڵام رەنگە ئێوە پلاگیا ئانتونوفنا نەناسن! هەمان ئەو ژنەیە کە هەمیشە تەنورەکەی بەرو پشت لەبەر دەکات...."

بەڕاستی پێکەنیناویە ڤارینکا گیان، تەنزێکی جوانە، کە ئەم پەرەگرافەی بۆ دەخوێندینەوە، لەبەر پێکەنین خۆمان پێنەدەگیرا، راستە گەنجێکی هەندێ بێ ئەقڵە، خوا هیدایەتی بدا!.. ڤارینکا گیان من دان بەوەدا دەنێم کە هەر چەندی ئەم چیرۆکە کەمێك مەکروهە، رهەندێك مەکشوفە، هەوەسکارانەیە، بەڵام بێ وەبەو هیچ نیشانەیەکی لیبرالیزم‌و بێ سەرویەری تێدا نیە. یانی هیچ نیازو نیەتێکی خراپی تێدا نیە. ئەوەش

بزانە ڤارینکا گیان کە راتازاییف پیاوێکی خاکیو بێ فیزو هەوایە، هەر بۆیەش نووسەرێکی زۆر رەسەنوچاکە، وەکو نووسەرانی دی نیە.
دەزانی هەندێجار بیرۆکەیەکی سەیرم بە مێشکدا دێت: باشە چ دەبێ ئەگەر منیش، بەڵێ منیش، دەست بە نووسینی شتێك بکەم؟ یانی چی دەبێ؟ بۆ نموونە وای دابنێ رۆژێك، کوتوپڕ کتێبێك بەم سەرناوە کەوتە کتێبخانەکانەوە: "هۆزانەکانی ماکار دیوڤشکین"، هەنگێ تۆ چ دەڵێی فریشتە چکۆڵەکەم؟
رات چی دەبێ؟
چۆن بیری لێدەکەیەوە؟
ئەگەر بۆچوونی منت دەوێ فریشتەکەم، ئەوی راستی بێ، هەر کە **کتێبەکەم** بڵاو بوایەتەوە، ئیدی رووم نەدەهات پێ بە بولواری نیفسکی دا بنەمو خۆم نیشانی خەڵکی بدەم. چونکە هەموو کەسێك ئاماژەیان دەکردمێ: "تەمەشا، ئا ئەوە شاعیرو نووسەر دیوڤشکینە، بەڵێ خۆیەتی." ئەگەر ئەمە روویدابا، چیم لە پێڵاوەکانم بکردایە؟ جا فشتیلەکەم دەبێ ئەوەت عەرز بکەم کە پێڵاوەکانم هەمیشە یەکپارچە پینەن.
زۆربەی کات بنەکانیان هەڵتەقیوەو دەمیان کردووەتەوەو زۆر ناشیرینو مەکروفن. باشە وەختێ خەڵکی بدیبن نووسەرەکەیان، دیوڤشکین، جووتێ پێڵاوی شڕی پینەپیناوی لە پێدایە چ **دەڵێن**؟ خۆ ئەگەر کونتێسێك یان دۆتمیرێ یان هەر خانمێکی دیکە بەمە بزانێ، هەنگێ چ دەڵێ؟ لەوەیە ئەم کونتێسە ئەم پینانە هەر نەبینێ، چونکە ئەوەندەی من بزانم کۆنتێسان گوێ بە پێڵاوی خەڵکی نادەن، بە تایبەتی پێڵاوی

فەرمانبەرانی چکۆلەی دەوڵەت (چونکە چی زۆرە پێڵاو زۆرە، دنیا پڕە لە پێڵاوی هەمە جۆر)، بەلام بێگومان خەڵکانی دی بۆی دەگێڕنەوە کە پێڵاوەکانم پینە پیناوین.

هەر **دۆستەکانی** خۆم خیانەتم لێ دەکەن، لەسەرووی هەموویانەوە راتازاییف.. راتازاییف لە پێش هەموو کەسێکەوە لێم دەکات بە قاو...

زۆرجار هاتوچۆی کۆنتیس دەکات و بۆ هەموو میوانداریەکانی ئەو دەعوەت و بانگهێشت دەکرێت.. و دەڵێت هەر کاتێ بیەوێ دەتوانێ وەکو یەکێك لە خانەوادەکەیان سەری بدات. دەڵێت کۆنتێس بەڕاستی ناسکە ژنە، شارەزای ئەدەبە، و ژنێکی ژنانەی تەواو عەیارە، ئەم راتازاییفەش نموونەیەکی یەجگار سەیرە !.

ئیدی باسی ئەم بابەتە بەسە: هەر هەموو ئەم شتانەت بۆ سوعبەت و سەرگەرمی بۆ دەنووسم **فریشتە** چکۆلەکەم... بۆیە ئەمانەت بۆ دەنووسم تا تۆزێك سەرگەرم ومژوولت بکەم. خودا حافیز کۆترەکەم!

ئەگەر ئەمجارە نامەکەم تۆزێك درێژە، هی ئەوەیە کە ئەمڕۆ مجێزم خۆشە. هەموومان پێکەوە لە ژوورەکەی راتازاییف شێومان خواردو جۆرە شەرابێك دەستاو دەستی دەکرد کە رەنگە تۆ بە عەمرات تامت نەکردبێ (دەزانی ئەمانە چەند سوعبەتچی و ئەهلی کەیف و حەنەکن، فریشتەکەم ! ..)

**باشە** بۆچی ئەمانە بۆ تۆ بگێڕمەوە؟ ئومێدەوارم خراپ لێم حاڵی نەبی ڤاریتکا، من هەموو ئەمانەت بۆ خۆشی بۆ دەنووسم. خەمت نەبێ کتێبانت بۆ دەنێرم، دڵنیابە بۆتی دەنێرم. ئێمە لێرە کتێبێکمان لەلایە بە ناونیشانی (پول دوکوك) کەدەستاو دەست دەکات، بەلام من ئەم

رۆمانەت بۆ نانێرم ئازیزەکەم، نا، نا بە کەڵکی تۆ نایەت، شایستەی ئەوە نیە تۆ بیخوێنیتەوە.

دەڵێن هەموو رەخنەگرانی پوترسبۆرگی بێزارو تورە کردووە، هەموویان لێی ناڕازین. دەگەڵ ئەم نامەیەدا پاکەتێ شیرینیت بۆ دەنێرم، پاکەتێکی نیو کیلۆیی، ئەمەم بە تایبەتی بۆ کڕیویت، بیخۆ، نۆشی گیانی بکە ئازیزەکەم.

هەرجارێ دانەیەکت لێ نایە زارت یادی من بکەوە. بە یادی منەوە بیخۆ. بەڵام ئاگات لێ بێ مژمژەکانت نەجووی، بیان مژە، دەنا دانت دێشن. رەنگە زیاتر حەز لە شەریەتی میوە بکەی؟ بۆم بنووسە کە زیاتر حەزت لە کام جۆریانە.ئیدی جارێ خودا حافیز، مەسیح دەست بە باڵتەوە بگرێ کۆترەکەم.

*دۆستی هەمیشە دڵسۆزت*

*ماکار دیوشکین*

*بەڕێز ماکار سیوشکینی ئازیز*　　　　*٦/٢٧*

فیدورا **دەڵێت** ئەگەر من بمەوێ خەڵکانێك هەن کە بە جدی لە خەمی منداڵو دەتوانن کارێکی وەکو مامۆستایەتی، مامۆستای ماڵان-م بۆ پەیدا بکەن. تۆ چ دەڵێی دۆستی ئازیزم؟

بە بۆچوونی تۆ ئەم کارە بکەم یان نا؟ هەڵبەتە ئەگەر ئەم کارە بکەم چیتر نابم بە بار بەسەر شانی تۆوە، ولەوەش دەچێت کارێکی باش بێو کرێکەشی کەم نەبێت.

بەلام لەلایەکیشەوە کەمێك **دەترسم** بچم لەگەڵ خەڵکانێکی بێگانەدا دابنیشم. ئەمانە ماڵباتێکی شارستانین. ئەگەر بکەونە پرسوجۆو لە وەزعو حاڵم بپرسن، چیان وەلام بدەمەوە؟

ئەمە جگە لەوەی کە من کەسێکی زۆر شەرمنو دوورە پەرێزم، حەز دەکەم هەتا هەتایە لەو مەرزو بۆیەدا بمێنم کە ماوەیەکی زۆری تیا ژیاوم. مرۆڤ لە زاگەو ژینگەی خۆیدا، چەند ناخۆشیو دەردە سەریشی تیا دیتبێ، هەست بە جۆرە ئاسوودەیییەك دەکات. ئەمە جگە لەوەی ئەو ماڵە لە لادێیەکی دوورە دەستا دەژین، و هەر خوا دەزانێ چ کارێکم پێ دەسپێرنو چ کارێکیان لێم دەوێ!

لەوەیە تەنیا ئەرکی سەرپەرشتیو خزمەتکاری **منداڵەکانم** پێ بسپێرن. لەوەش ناچێ جێی متمانە بن، لە ماوەی دوو ساڵدا سێ جار مامۆستای منداڵەکانیان گۆڕیوە، جا نازانم ئامۆژگاری تۆ چیە ماکار ئالکسیوڤیچ؟

تکایە بۆچوونی خۆتم پێ بڵێ، ئەم کارە بکەم یان نا؟.. ئەوە بۆچی قـەت سەرێکم نادەی؟

مەگەر بە ڕێکەوت **جارێک** دەرگام لێ بکەیەوە. جگە لە یـەك شـەممۆانی کلێسـا، مەگـەر بـە ڕێکـەوت یەکـدی بـدینین! بەڕاسـتی کەسـێکی دوورە پەرێزو گۆشەگیری! کوتو مت وەکو منی، باشە من خزمت نیم؟

تۆ منـت خـۆش نـاوێ، ماکـار ئالکسـیوڤیچ، زۆر جـار کـە بـە تـەنێ دەبم، خەمێکی گەورە دام دەگرێ. هەندێجار بە تایبەتی کـاتی بـولێڵی ئێـوارێ، کاتی زەردەپەڕو خۆرنشین، هەست دەکەم لەم جیهانەدا تەنیای تەنیام.

فیـدورا بـۆ کـڕینی هەنـدێك شـت چـووەتە دەرێ، منـیش بـە تـەنیا دانیشتوومو پەت بۆ **خەون**و خەیاڵان شل دەکەم: دەکەومە یادی ڕۆژانـی رابردوو، ڕۆژانی شادیو ڕۆژانـی پـڕ خـەمو جـەخار، هـەموو شتێك لەبـەر چاوم زندوو دەبێتەوە، لە تۆ وایـە بیرەوەریـەکان لـە نێـو تـەمو مژێکـەوە سەرەتاتکێم دەگەڵ دەکەن، بە خەیاڵ سیما ئاشناکان دەبینم (هەنـدێجار وا دەزانم بەڕاستی دەیـان بیـنم)، بـە تایبـەتی سـیمای دایکـم، لـە هـەموو سیماکانی دی پتری دەبینم... خەونێکی یەجگار زۆر دەبینم!

هەست دەکەم تەندروسـتیم بـاش نیـە، یـەجگار لاوازو بـێ هێـز بـووم. بـۆ نموونە ئەم بەیانیە کە لە خەو ڕابووم هەستم بە ئازارێکی سـەیر کـرد، زۆر خراپ دەکۆکم. ئەم کۆکەیە لە هەموو شتێك خراپترە!

هەستدەکەم، بگرە دەزانم کە بەو زووانـە **دەمرم**، کـێ خـۆی دەکـات بـە خـاوەنی جەنازەکـەم، کـێ بـەرەو گۆڕسـتان بـەڕێم دەکـاتو بـە خـاکم دەسپێرێ؟ کێ بۆم دەگری؟

خۆ لەوەشە لە شوێنێکی بێگانەدا، لە غوربەتا، لە سوچی ماڵێکی بێگانە، لە نێو خەڵکانێکی بێگانەدا بمرم... ئاه **خودایا**! ئەم ژیانە چەند پڕ جەخاروخامناکە! ماکار ئالکسیوڤیچ! بۆچی ئەم هەموو شیرینیو نوقڵەم بۆ دەنێری دۆستی ئازیزم، تاکەی نوقڵ بارانم دەکەی؟ ئاخر ئەم هەموو پارەیە لە کوێ دێنی. دۆستی ئازیزم، ئاگات لە پارەکانت بێ، پاشەکەوت بکە، توبی توخودا دەست بە پارەوە بگرە، بە خۆڕایی بە فیڕۆی مەدە!

مافورۆکەیەکم چنیوە، **تازە** لێ بوومەتەوە، فیدورا خەریکە دەیفرۆشێت: بایی پەنجا رۆبڵی کاغەزییە. ئەمە نرخێکی زۆر باشە، باوەڕم نەدەکرد کەس ئەو نرخەی بداتێ. سێ رۆبڵی زیو دەدەم بە فیدۆرا،و بە باقیەکەشی دەستێك جلك، دەستێك جلکی سادە، بەڵام گەرم کە لە سەرمام بپارێزێ، بۆ خۆم دەدروم. ئیلەکێکیش بۆ تۆ دەدروم، قوماشێکی باش هەڵدەبژێرمو بە دەستی خۆم بۆتی دەدروم.

فیدورا کتێبی (حیکایەتەکانی ئیڤان بیلکین)ی بۆ هێناوم، وا بۆتی دەنێرم گەر حەزت لێ بوو بیخوێنەوە. **بەڵام** تکایە ئاگات لە کتێبەکە بێ، خەت بە ژێر دێڕەکانیا مەکێشە، و زۆریش لای خۆت دوای مەخە، چونکە هی خۆم نیە. ئەم کتێبە لە نووسینی پوشکینە. دوو ساڵ لەمەپێش ئەم حیکاتەتانەم لەگەڵ دایکما خوێندووەتەوە، کە ئێستا بۆ جاری دووەم خوێندمەوە زۆر خەمبار بووم. ئەگەر کتێبی ترت لەلا هەیە بۆمی بنێرە، بەڵام تکایە لەو کتێبانە نا کە لە راتازاییفت وەرگرتوون، ئەوانەم بۆ مەنێرە، چوکە لەوەیە کتێبەکانی خۆیت بە ئەمانەت بداتێ، ئەگەر تا

ئێستا کتێبێکی بڵاوکردبێتەوە. نازانم چۆن زەوق لەو نووسینە تووڕەهاتانەی ئەو وەردەگری ماکار ئالکسیوڤیچ؟

بەڕاستی نووسینەکانی سواوو پواوو بازاڕیو تووڕەهاتن.. جارێ خودا حافیز! بەڕاستی زۆرم چەنەبازی کرد، ئاسمانو ڕێسمانم لێك دروون. کە خەمباریم حەزم لێیە ئەرزو ئاسمان لێك بدرووم... ئەمە جۆرە دەواو دەرمانێکە، یەکسەر هەست دەکەم حاڵم باشتر دەبێت، بەتایبەتی ئەگەر توانیبم ئەو شتانە هەڵڕێژم کە لەسەر دڵم بوون بە گرێ. بە دوعا دۆستو هاوڕێم، خودا حافیز.

*دڵسۆزت*

*ف. د.*

*فرفارا ئالکسیوفنای ئازیزم* ٦/٢٨

بەڕاستی بە خۆڕایی خۆت ئەزیەت دەدەی، کە دەستبەرداری ئەمە دەبیت؟

**شەرم** لە خۆت ناکەی؟ بەسە فریشتە چکۆلەکەم، کەنگێ ئاقڵ دەبیت؟ چۆن ڕێگە بەم بیرانە دەدەی بەرۆکی مێشکت بگرن؟

تۆ نەخۆش نیت روحەکەم، هەرگیز نەخۆش نیت، لە گوێزی ساغ ساغتری، بە پێچەوانەوە تۆ وەکو گوڵان دەگەشێیتەوە، شکۆفە دەکەی، ڕاستە تۆزێ بێ رەنگی، بەڵام وێڕای ئەوەش **وەکو** گوڵان دەپشکویت.

ئیدی ئەم خەون و خەیاڵانەت لە چیە؟

واز لەو تورەهاتانە بێنە کۆترەکەم، چیتر بیری لێ مەکەوە، ئیدی ئەم قسانە بەسە! چاو لە من بکە ئازیزەکەم، بزانە قەت ڕێ بەو خەیاڵاتانە دەدەم؟

من ناڵێم تۆ خۆت بیلێ **ئازیزەکەم**. من ئاگاداری خۆمم هێدی و هێمن دەژیم، باش دەخەوم، تەندروستیم زۆر باشە، زۆر بە کەیف و بە دەماخم، هەر کەسێ دەمبینێ دڵی دەکرێتەوە. بەسە ئازیزەکەم، بەسە، شەرم لە خۆت بکە.

**ئەم** خەیاڵاتە لە بیر بکە. من دەتناسم، دەمارت دەناسم، دەزانم چیت بە مێشکا تێدەپەڕێ کچۆلەکەم:

لەگەڵ بچووکترین شتا، لەگەڵ کەمترین ئاریشەدا ئیدی خەون و خەیاڵ دەتباتەوە، و خێرا خەم سەرو دڵت دەگریٚ. تۆبی توخودا دەست لەم کارە هەڵگرە، لەبەر خاتری من... دەست لەم کارە هەڵگرە.. سەبارەت بە کارکردن لە ماڵی بێگانان، هەرگیز. نا، نا، **مەحاڵە**! ئەم بیرە هیچە چیە داویە لە کەللەت؟

نەخاسمە لە شوێنێکی دوورە دەست، لە گوندێك؟ دوور لێرە! نا، کچەکەم، نا، من رازی نابم، بە هەموو توانامەوە دژی ئەم نەخشەیە دەوەستم. ئامادەم کۆنە پاڵتۆیەکەم بفرۆشم و بە تۆی کراسێك بسورێنمەوەو نەیەڵم تۆ ئاتاجی هیچ شتێك ببی.

نا ڤارینکا، نا، من تۆ دەناسم. ئەمە بیرێکی پوچە، گەوجێتیە! بیرێکی شێتانەیە! بێگومان ئەمە تەگبیری فیدورایە، کە ژنێکی گەوجە، بێگومان ئەو کەرە ئەم بیرانەی خستووەتە مێشکتەوە.

تۆ هێشتا فیدورات نەناسیوە، دەیناسیت گیانەکەم؟

باوەڕ بەیەك **قسەی** مەکە... ژنە دێهاتیەکی گەوجە، گەوج و شڕندەیە، چی بە دەما بێ دەیڵێ، دیقی مەرگی بە مێردەکەی کردو هەواڵەی گۆڕی کرد. ناشێت باسی خراپی و ناهەمواری ژیانی ئێستامانی بۆ کردبیت و دڵی تەنگ کردبیت؟ نا، نا، کۆترەکەم، قشتیلەکەم، مەحاڵە!

ئاخر ئەگەر تۆ بڕۆی من چی بکەم، چیم بەسەر دێت، چ شتێکم بۆ دەمێنێتەوە لەم ژیانەدا بیکەم؟ نا ڤارینکا گیان، نا، نە گیانەکەم، ئەم بیرە لە کەللەت دەربکە. تۆ کە دەگەڵ ئێمەدای لە چیت کەمە؟

چ کەموکوڕیەکت هەیە؟ بوونی تۆ سەرچاوەی شادی ئێمەیە، سەرچاوەیەکی لە بن نەهاتوو، ئێمە زۆرمان خۆش دەوێی، تۆش بەبێ

ئێمە هەڵناکەی: کەواتە هێدیو ئارام لە شوێنی خۆت بژی، خەیاتی خۆت بکە یان بخوێنەوە، خۆ ئەگەر حەز دەکەی واز لە خەیاتیەکەش بێنە، خەیاتی بکەی یان نا فەرق ناکات... بەڵام لەگەڵ ئێمەدا وەمێنە، لەگەڵ ئێمەدا بژی. باشە هەر بیر لەوە بکەوە ژیان لێرە بەبێ تۆ چۆن دەبێ. !

ئاخر ئێمە بۆ کوێ بڕۆین، بۆ کام لا سەر هەڵبگرین؟

بە تەمام چەند کتێبێکت بۆ بێنم، و پاشان دوای ماوەیەك پێکەوە دەچینە گەشتو گەڕان. **بەڵام** ڤارینکا گیان، بەسە بەس، واز لەو پڕۆژە و نەخشانە بێنە، تۆزێ هۆشو ئەقڵ بێنەوە بەر خۆتو ئەم بیرۆکە تۆڕەهاتانە توڕ بدە !

بە زووترین کات دێمە دیدەنیت. بەڵام رێم بدە با رێك وراست پێت بڵێم ئەوەی دەربارەی راتازاییف دەیڵێی دروست نیە ! من دەزانم کە پیاوێکی رۆشنبیر نیم، خوێندنم تەواو نەکردووە، کەچە سیواتێکم هەیە یان نیە.

بە هەر حاڵ نامەوێ باسی خۆم بکەم، باسی راتازاییف دەکەم، بمبوورە من لەسەرمە بەرگری لێبکەم، تۆ کەیفی خۆتە، **ئەو** پیاوە دۆستی منە، بۆیە داکۆکی لێ دەکەم، دەبێ تای ئەو بگرم. نووسەرێکی زۆر زۆر باشە. من دەگەڵ بۆچوونەکانی تۆدا نیم، ناتوانم دەگەڵ ئەو داوەریەی تۆدا بم. شێوازێکی جوان، گوڵ ئاسا، ناسك، پڕ وێنە، و تەژی مانای هەیە.

بەڕاستی نووسەرێکی گەورەیە !

**ڤارینکا** گیان رەنگە بەبێ تاقەتی نووسینەکانیت خوێندبێتەوە، یان لە کاتی خوێندنەوەیاندا حەواست پەرتو بڵاوبووبێ، بە دڵ نەت خوێندبنەوە، یان مجێزت تەواو نەبووە، یان لەوەیە لەو دەمەدا لە فیدورا پەست بووبی، یان لەو کاتەدا رووداوێکی ناگەوارا مژولی کردبی، هەقە

جارێکی دی، بە جددی بیانخوێنیتەوە، کاتێ کە شادو بە دەماخی، مجێزت خۆشە، دڵت خۆشە، بۆ نموونە کاتێ کە شیرینیەکت لە دەمدایە، مژمژەیەکت بە دەمەوەیە، لە ساتێکی وادا ئەو پەرەگرافانە دووبارە بخوێنیتەوە.

من نکۆڵی لەوە ناکەم کە (کەسیش ناتوانێ نکۆڵی بکات) کە نووسەرانی لەو باشتر هەن، نووسەرانی زۆر لەو باشتر هەن. **بەلام** ئەوان بەپێی پایەو شۆرەتی خۆیانو راتازاییف–ش بەپێی خۆی، ئەوان زۆر باش دەنووسن، وراتازاییف–ش باش دەنووسێت. راتازاییف لەوان جیایە، ریبازی تایبەتی خۆی هەیە، بە شێوازی خۆی دەنووسێت.هەرچیەك دەنووسێت باشی دەنووسێت. جارێ خودا حافیز ڤارینکا گیان، ناتوانم لەوەی پتر لەسەری برۆم، دەبێ پەلە بکەم، کارم هەن. بەلام تکات لێدەکەم ڤارینکا گیان، لێت دەپارێمەوە بڵندە جوانەکەم، ئاگات لە خۆت بێ، خەفەت مەخۆ، سینگت فراوان بێ، دڵی خۆت بدەوە خودا پشتو پەنات بێ.

*هاوڕێی دڵسۆزو ئەمەکدارت*

*ماکار دیوڤشکین.*

پەراوێز: سوپاس بۆ ئەو کتێبەی بۆت ناردووم ئازیزەکەم، مادامێکی تۆ حەزت لێیە پوشکین–ش دەخوێنمەوە. بەڵێنت دەدەمێ کە ئەمشەو دێمە دیدەنیت.

**

*ماکار ئالکسیوڤیچ — ی ئازیزم.* ٧/١

**فا**، هاوڕێم، نا، من ناتوانم بەم شێوەیە لەگەڵ ئێوەدا بژیم، باریم بەسەر ئێوەوە، من بیری خۆم کردووەتەوە.

گەییومەتە ئەو قەناعەتەی دەستبەرداربوونی ئەم کارە باشە هەڵەیەکی گەورەیە. خۆ ئەم کارە هەر هیچ نەبێ نانی ڕۆژانەم دابیندەکات. هەموو هەوڵێکی خۆم دەخەمە کار کە شایستەی میهرەبانیو خۆشەویستی ئەو خەڵکە بێگانەیە بم، بگرە ئەگەر پێویستی کرد هەوڵدەدەم تەبیعەتی خۆیشم بگۆڕم. ڕاستە زۆر زەحمەتو ئەستەمە مرۆڤ لە نێو بێگانانندا بژیو **چاوی** لە ڕەحمەتو میهرو مەحەبەتی ئەوان بێت، و ناچار هەستی ڕاستەقینەی خۆ سنووردار بکات یان بشارێتەوە، بەلام خودا خۆی کۆمەکم دەکات.

خۆ نابێ وناکرێ هەتا هەتایە هەر سەرباروکۆشەگیرو دوورە پەرێزبم، من پێشتریش ئەم ئەزموونەم دیتووە. لە بیرمە کاتێ کە منداڵ **بووم**.

ودەچوومە قوتابخانەی شەوانەڕۆژی، کە یەك شەمموان بۆ ماڵ دەهاتمەوە، بە درێژایی ڕۆژەە، لە دەوروبەری ماڵەوە، هەر خەریکی جرتو فرتو هەڵبەزو دابەز بووم. هەندێجار دایکم سەرزەنشتی دەکردم، بەلام من گوێم نە دەدایە:

**دڵم** پڕ لە شادمانی بوو و ڕۆحم لە خۆشیو کەیفان پرشنگی دەداو دەدرەوشایەوە، لە کەیف وخۆشیان لە پێستی خۆم نەدەهێوریم. کە

ئێوارە دادەهات، خەمێکی قورس‌وکوشندە سەرو دڵی دەگرتم، چونکە دەبوایە لە سەعات نۆدا بۆ قوتابخانە شەوانە ڕۆژیەکەم بگەڕێمەوە، لە قوتابخانەدا هەموو شتێك سارد، نامۆو، وشك‌و ناخۆش بوو، و بەڕێوەبەری قوتابخانەکە ڕۆژانی دوو شەمموان پەست و بێ تاقەت بوو، ڕەفتاری دەگەڵمدا توندو وشك بوو، لە داخا دڵم دەهاتە ژان، چاوم پڕدەبوون لە فرمێسك، خێرا خۆم بە پەنایەکدا دەکردو بە تەنیاو بە کڕی دەکەوتمە روندك هەڵڕشتن، فرمێسکەکانم لەوانی دی دەشاردەوە تا وا نەزانن لەبەر تەمەڵی دەگریم. ئەلهەقی گریانەکەم هیچ پەیوەندیەکی بەدەرس‌و دەورەوە نەبوو..

ئیدی پاشان دەگەڵ قوتابخانەدا ڕاهاتم، بە ڕادەیەك **ڕاهاتم**، دوایی کە وەختی ئەوە هات ئەو قوتابخانەیە بەجێ بێڵم‌و خودا حافیزی لە هەڤاڵەکانم بکەم دەستم بە گریان کرد.

زۆر هەڵەیە لەوەی پتر باریم بەسەر ئێوە، هەردووکتانەوە. ئەمەم زۆر لەبەر گرانە، بۆیە بە بێ پەردە ئەمەت پێ دڵێم، چونکە بەوە ڕاهاتووم کە هیچت لێنەشارمەوە. بۆچی لات وایە من فیدورا نابینم کە لەگەڵ گەردی بەیانیدا ڕادەبێ‌و تا حەوت نیوەشەو جلشۆری دەکات؟

هەر چەندە ئێسکە پیرەکانی پێویستیان بە ئیسراحەت ویشووە، چما پێت وایە من **تۆ** نابینم چۆن لەبەر خاتری من ماڵی خۆت وێران دەکەی، ودوا کۆپیکی بەرکت بۆ من خەرج دەکەی؟ دەرامەتی کەسێکی وەکو تۆ ئەمەی تیا نابێ دۆستی ئازیز!..

تۆ لە نامەکەتدا بۆت نووسیووم ئامادەی دوا شتی خۆت بفرۆشیت تـا مـن نەکەومە ئاستەنگو ئاتاجی هیچ شتێك نەبم. باوەڕ بە قسـەکانت دەکـەم، دەزانم چەند دڵاواو میهرەبانی، دەزانم هەموو پیاوەتیەکت لە دەست دێ: بەڵام ئەمانە قسەن‌و بـێ بـیر کردنـەوە دەیانکـەی. تـۆ ئێسـتا بڕۆکەیـەك پارەت هەیـە کـە چاوەڕوانی نـەبووی، ئـەویش ئـەو تـۆزە پاداشـتەیە کـە پێیان داوی، ئەدی دوای ئەوە چ دەکەی؟

بە خۆت دەزانی کە من **هەمیشە** نەخۆشم، ناتوانم وەکو تۆ کاربکەم، کـە خۆزگە بمتوانیبا کاربکەم.

ئەمـە جگـە لـەوەی کـە هـەموو کـاتێ کـار دەسـت ناکـەوێ. ئیـدی وەکـو دەبینی ئەوە وەزع‌و حاڵەکەیە، گەرەکتە چی بکەم؟ لێـرە دەبم بـە چـی؟ یـانی دەتـەوێ دەسـتەو ئـەژنۆ لێـی دانیشـم، ومـات‌و خـەمبار تەماشـای ئێـوەی ئـازیز بکـەم کـە کـار دەکـەن؟ ئایـا مـن بـەم حاڵەمـەوە دەتـوانم زەڕەیەك پیاوەتی‌و خۆشەویستی ئێـوە بدەمـەوە؟ باشـە بۆچـی دەبـێ وا تەسەوور بکەی کە تۆ بەبێ من هەڵناکەی هاوڕێم؟ ئاخر مـن چ خێـرێکم بـۆ تۆ هەبووە؟ چ چاکەیەکم لەگەڵ کردوویت؟ راستە من لـە کانگـەی دڵـەوە پابەنـدی تـۆم، راسـتە زۆر زۆرم خـۆش دەوێـی، بـەڵام چارەنووسـی مـن، خەمین‌وشوومە! من تەنیا دەتوانم خۆشـم بـوێی، هیچـی تـرم لـە دەسـت نایـەت، و نـاتوانم چـاکەو پیـاوەتی تـۆ بدەمـەوە. هـەوڵ مـەدە ژێـوانم بکەیـەوە، بـاش بـیر لـە قسـەکانم بکـەوەو دوا بۆچـوونی خـۆتم پـێ بڵـێ، چاوەڕوانی وەڵامی تۆم..

*ئلسۆزت ف. د.*

٧/١

شێتییە ڤارینکا، **شێتییە**، هەر هەموو ئەمە شێتیەکی تەواوە!

پیاو هەرکە بۆ ساتێ لێت غافڵ دەبێ، نازانم چ کەڵکەڵەیەکت دەکەوێتە سەر: ئەمە دروست نیە، وئەوە خراپە!...

هتد بەڵام من دەزانم هەر هەموو ئەم قسانە پووچن، ئەمە شێتییە. ئاخر تۆ چیت گەرەکە، چ گلەییەکت لە ئێمە هەیە؟ لێرە لەچیت کەمە ئازیزەکەم؟

ئاخر بڵێ بزانم لە چیت **کەمە**! تۆ ئێمەت خۆش دەوێ، و ئێمە تۆمان خۆشدەوێ، یانی هەموومان بە یەکتر رازین و خۆشحاڵین:

لەوەی زیاتر چیت گەرەکە؟ ئاخر دەتەوێ لەو غەریبایەتیە، لە نێو ئەو بێگانانەدا چ بکەی؟ من دڵنیام کە تۆ نازانی بێگانە یانی چی! وەرە لە من بپرسە.

من بێگانە دەناسم **ئازیزەکەم**، دەماری دەناسم، من ئەوەم بەسەر هاتووە کە نانی بێگانە بخۆم.. بێگانە نامەردن، نا پیاون ئازیزەکەم، لەوە خوێڕیترن دڵە چکۆلەکەی تۆ تەحەمولیان بکات، بە خوتەو بۆڵە، بە سەرزەنشت و گازاندە، بە نیگای حەقارەت ئامێز زوخاوە سکت دەکەن.

تۆ لێرە، لای ئێمە ئاسوودەو دڵڕەحەتی، لە هێلانەیەکی چکۆلەدای دوور لە هەر ئاسیوو وەیەك. ئەگەر بڕۆی وەکو ئەوەیە لاقێك یان دەستێکمان لە دەست دابێ، ئەگەر بڕۆی وەکو ئەوەیە ژیانمان لەگەڵ خۆتا بەری.

ئاخر ئێمە بەبێ تۆ چ بکەین، چۆن هەڵبکەین؟ منی پیرەمێردی کڵۆڵ بێ تۆ چ بکەم؟ تۆ پێت وایە هیچ پێویستییەکمان بە تۆ نیە؟

ئەم قسەیە چیە، تۆ بە کەڵکی ئێمە نایەی؟ نا، ڤارینکا گیان نا، تۆ بە خۆت حەکەم بەو بزانە چۆن تۆ بە کەڵکی ئێمە نایەی؟ چۆن دەتوانین دەسبەرداری تۆ بین؟

تۆ بڕبڕەی پشتی منی ڤارینکا گیان، دەزانی بوونی تۆ چ خۆشحاڵییەکە بۆ من!... بۆ نموونە لەم ساتە وەختەدا کە بیر لە تۆ دەکەمەوە، دڵم یەجگار خۆش دەبێ.

هەندێجار کاتێ نامەت بۆ دەنووسم و هەموو هەستو نەستی خۆمی تیا دەردەبڕم، و وەڵامێکی تێرو تەسەلو شایستەم لە تۆوە پێدەگاتەوە، ئەمە کەمە؟ یان هەندێجار جلکت بۆ دەکڕم، شەپقەیەکت بۆ دەنێرم، هەندێجار تۆ داوای شتێك دەکەیو من بۆتی دەکڕم یان ئەنجامی دەدەم..

. ئیدی چۆن دەڵێی کە تۆ بە کەڵکی من نایەی، هیچ **سوودێکت** بۆ من نیە؟ ئاخر من بەم سەری پیرییە بە تاقی تەنیا چیم پێدەکرێ، بە کەڵکی چی دێم، چیم بەسەر دێت؟ ڕەنگە تا ئێستا بیرت لەمە نەکردبێتەوە ڤارینکا گیان!

دەبێ بیرێك لەمەش بکەیتەوە، پێویستە لە **خۆت** بپرسیت: "لە دوای من چی بەسەر ئەم پیرەمێردە دێت؟" من هۆگری تۆ بووم ئازیزەکەم. ئەگەر تۆ نەبی چ بەڵایەکم بەسەر دێت؟ دەچم خۆم دەخەمە ڕوباری نیڤاوەو هەموو شتێك کۆتایی دێتو دەبڕێتەوە، بەڵێ، ڤارینکا بە جدی ئەو کارە دەکەم، ئاخر بەبێ تۆ من چی بکەم؟

ئاخ ڤارینكا، ڤارینكا حەیاتەكەم، روحەكەم، عەزیزەكەم، وا دیارە دەتەوێ بەو زووانە گالیسكەیەكی مردووان بەرەو گۆڕستانی (فولكوفو)م بەرێت، و تەنیا پیرەژنێكی نەگبەتی گەدای شڕو شپرێو دوای جەنازەكەم بكەوێ،و چەند پیاوێك چەند دەمە خاكەنازێك گڵم بەسەردا بكەن‌و لێی بدەن بڕێن‌و جەنازەكەم بە تەنێ لەوێندەر بمێنێ... ئەمە تاوانە، كارێكی درێوە، ئەمەی تۆ دەیلێی‌و دەیكەی تاوانە، كارێكی نابەجێیە ڤارینكای دڵەكەم... خودا شایەدە كارێكی ناپەسندە، تاوانە!...

وا كتێبەكەت بۆ دەنێرمەوە **كچۆڵەكەم**، ڤارینكای حەیاتەكەم، ئەگەر بۆچوونی منت لە بارەی ئەم حیكایەتانەوە گەرەكە كچۆڵەكەم، ئەوا دڵنیات دەكەم لە عەمرانم كتێبی وا جوانم نەخوێندووەتەوە، لە هەموو تەمەنما كتێبی وا سەیرم نەخوێندووەتەوە، بۆیە لە خۆم دەپرسم، چۆن تاكو نهو بەم گێلییەتیە ژیاوم، كە پیاوێكی كەللە پووك بووم!.. خوا ئەقڵ بە ئەولادم بدات!...

چ كارێكم كردووە؟ لە كام كێوەوە هاتووم؟ مەبەستم ئەمەیە كە هیچ شتێك نازانم حەیاتەكەم،هەر هیچ شتێك نازانم، بەبێ پەردە پێت دەڵێم ڤارینكا گیان: بەڕاستی كەسێكی نەخوێندەوارو بێ سەوادم.

تا ئێستا هەندێ شتی زۆر كەمم خوێندووەتەوە، ئەوەندە كەمە لە نرخی نەبوودایە، وەكو ئەوەیە هیچم نەخوێندبێتەوە. ئەمانەم خوێندووەتەوە:

( ئاكارو وێنەی پیاوێك)، كتێبێكی **چاكە**، قووڵە، (كوڕێژگەی زەنگ ژەن)و (قورینگەكانی ئیبیكۆس) ئەوەندەم خوێندووەتەوەو تەواو، ئاو بێنەو دەست بشۆ، لە ژیانما هیچ شتێكی ترم نەخوێندووەتەوە، ئێستا لە خوێندنەوەی (بەڕێوەبەری وێستگە)ی ناو ئەو كتێبە بوومەوە كە تۆ بۆت

نارد بووم، جا ڤارینکا گیان پێویستە دان بەو حەقیقەتا بنەم کە : سەیرە پیاو عەمرێك لەم جیهانەدا بەسەر بەرێ‌و نەزانێ کتێبێك لە بن دەستیا هەیە کە هەموو ژیانی بەوپەڕی سادەیی، بە هەمان سادەیی‌و ئاسانی گۆرانیەك بگێڕێتەوە !

**پیاو** کە دەست بە خوێندنەوەی ئەم جۆرە **چیرۆکە** دەکات بەرە بەرە زۆر شتی بیر دەکەوێتەوە، زۆر شتی لە یادگەدا زندوو دەبێتەوە، و ئەوەی تا ئێستا بەلایەوە ئالۆزو نا مەفهووم بووە، بۆی روون دەبێتەوە، تێی دەگات، لێی حاڵی دەبێت.

هەڵبەتە هۆیەکی دیکەش هەیە کە ئەم کتێبەی تۆی ئەوەندە لەلا شیرین کردووم: هەندێك کتێبان هەن هەرچەندە بە نرخن، گەورەن، بەلام بۆ پیاوی وەکو من قورسن، هەرچەند هەوڵ بدات لێیان تێناگات، سەریان لێدەرناکات، چونکە زۆر قووڵن...

بۆ نموونە تەمەشای من بکە، من کەسێکی زەین کوێرم، هەر بە تەبیعەت زەین کوێرم... لەبەر ئەوە ناتوانم کتێبی گەورەو قورس وەخوێنم... بەلام سەبارەت بەم کتێبەی کە تۆ بۆت ناردبووم، کە دەمخوێندەوە، دەتگوت بە خۆم نووسی بووم.

ریك وەکو ئەوە وابوو ئەزبەرم کردبێ، لە تۆ وایە نووسەرەکەی باسی دڵی من دەکات.

هەرچی لە **دڵی** مندایە بە وردی، وله هەموو رویەکەوەو وەکو خۆی بۆ خەڵکی باس دەکات: بەڵێ ئەم کتێبە، کتێبێکی ئاوهایە، تا حەز بکەی سادەیە.. لەوەیە منیش بمتوانیبایە شتی واهی بنووسم، باشە بۆچی منیش شتێکی وا نەنووسم؟

منیش هەمان ئەو هەستانەم هەیە، دەقاو دەق هەمان ئەو هەستانەی کە لەم کتێبەدا وەسف کراون، و هەندێجار رێك خۆم لە هەمان پێگەو هەلوێستی سامسون ڤیرین–ی کلۆل دا دەبینمەوە... زۆربەمان وەکو سامسون ڤیرینین.. خەلکانێکی میهرەبان‌و کلۆل! ئەلهەقی کاکی دانەر لێهاتووانەو زیرەکانە ئەم کتێبەی نووسیوە!

**ئازیزەکەم** کاتێ ئەو دیمەنەم دەخوێندەوە کە ئەم کلۆلە داماوە بەدبەختە، لە داخ‌و خەفەتدا، هێندەی دەخواردەوە تا ئاگای لە خۆی نەدەماو، بە درێژایی رۆژ خۆی بە ژێر پۆستینەکەیدا دەکردو بەسەر خەمە تالەکانیا کڕ دەکەوت، خەریك بوو فرمێسك لە چاوانم داباریێ..

داماوە هەولدەدا بە گریان‌و بە خواردنەوە، بە شێوەیەك کاتی خەم لە خۆی دوور بخاتەوە، بەسەری قۆلی چاکەتە چلکنەکەی، فرمێسکەکانی دەسرێت‌و هەمیشە لە بیری بەرخۆلە گوم بووەکەیدا، لە بیری دونیاشای کیژیدایە!

ئیدی ئەمە خودی ژیانە! جارێکی دی بیخوێنەوە، خودی ژیانە، کتێبێکی زندووە، کوتومت، خودی ژیانە..

من بە چاوی خۆم **ئەو** شتانەم دیتووە، دەوروبەرمان پڕە لە هەمان خەلکان‌و هەمان شتان. هیچ دوور مەڕۆ، تەمەشای تیریزا بکە، یەکێکە لەو نموونانە. یان ئەم کارمەندە داماوەی کە لە هەمان خانووی ئێمە کرێ نشینە.. ئەویش بۆ خۆی سامسون ڤیرینکە بە ناوێکی ترەوە: گۆرشکۆف، ئەمە چارەنووسی هاوبەشی هەموو خەلکیە ئازیزەکەم، ئەم بەلایە لەگینە بەسەر هەمووماندا بێ، لەوەیە **بەسەر** منا بێت...

تەنانەت لەوەیە بەسەر کۆنتێکی لوتبەرزی ئاکنجی بولواری نیڤسکی یان کەناری رووباری نیڤاش دا بێت، دوور نیە دووچاری هەمان چارەنووس بیێ، بەڵام رەنگە بە جۆرێکی دی دەربکەوێ، چونکە ئەو خەڵکانەش بە شێوازی خۆیان دەژین، بەڵام لەگینە ئەو جۆرە خەڵکەش هەمان شتی لێ بقەومێ، هەمان بەڵای بەسەر بێت..

لەوەیە هەمان بەڵا بەسەر منیشدا بێت. بەڵێ ئاوایە ئازیزەکەم، کەچی تۆ گەرەکتە برۆیت‌و ئێمە بەجێ بێڵی، هەست ناکەی ڤارینیکا گیان، لەوەیە تووشی گوناه ببم؟

تۆ خەریکە من‌و خۆتیش بەرەو نابووتی، بەرەو فەوتان دەبەی، ئاه ئازیزەکەم توبی توخودا ئەم بیرە یاخیگەریانە لە مێشکی **خۆت** دەربکەو بە خوت‌و خۆراپیی ئازارم مەدە.

تۆ پێم نالێی بالندە چکۆلەکەم، تۆیەک کە هێشتا پەڕو باڵت دەرنەکردووە، چۆن چۆنی چاودێری خۆت دەکەی؟

چۆن خۆت لە گومڕایی دەپارێزی؟ چۆن لە هەنبەر شەڕی شەڕەنگێزان داکۆکی لە خۆت دەکەی؟ واز بێنە ڤارینکا گیان، ئاقڵ بە ئاقڵ، چیتر گوێ لەو ئامۆژگاریە بێ مانایانە مەگرە، کە گوێتی پێ دەناخنن، گوێ بەو قسە تڕەهاتانە مەدە کە لە پاشملەی ئێمە بۆتی دەکەن. جارێکی دی کتێبەکەت بخوێنەوە، ئەمجارە بە وردیەکی زیاتر بیخوێنەرەوە، زۆر شتی لێوە فێر دەبیت، و خەمی دڵت دەڕەوێنێتەوە..

**باسی** (بەڕێوەبەری وێستگە)م بۆ راتازاییف کرد. گوتی ئەوانە ئەدەبیاتی کۆنن، رۆژگاریان بەسەر چووە، ئەو باوی ئەو کتێبانەیە کە پڕن لە وێنەو وەسف‌و روونکردنەوەی جۆراو جۆر.

پیاو راست بڵێ به باشی له مه‌به‌ستی حاڵی نه‌بووم،و نه‌مزانی باسی چ شتێك ده‌كات.

له ئه‌نجامدا گوتی پوشكین نووسه‌رێكی باش بووه‌و سه‌نگو ناوبانگێكی فره‌ی به روسیای پیرۆز به‌خشیوه‌،و هه‌ندێ شتی گشتی دیكه‌شی ده‌رباره گوت. به‌ڵێ ڤارینكا گیان، كتێبێكی یه‌جگار باشه‌، زۆرباشه‌، جارێكی دیكه **بیخوێنه‌وه**، به‌ڵام به وردی بیخوێنه‌وه. به گوێی من بكه‌، به گوێم بكه‌و دڵی پێره‌مێری به‌له‌نگازو داماو خۆش بكه‌. خوا دڵت خۆش بكات،و پاداشتی به‌خێرت بداته‌وه ئازیزه‌كه‌م، بێگومان خودا جه‌زای به‌خێرت ده‌داته‌وه.

*دۆستی دڵسۆزت*

*ماكار دیڤشكین*

**

*ریزدار ماکار ئالکسیوڤیچ- ی ئازیز* ٧/٦

ئەمڕۆ فیدورا پانزە ڕۆبڵی زیوی بۆ هێنام. **ئەم** بەلەنگازە چەند خۆشحاڵ بوو کە سێ ڕۆبڵم لەو پارەیە دایە!

بەپەلە ئەم نامەیەت بۆ دەنووسم. خەریکم ئێلەگێکت بۆ دەدروم، قوماشێکی زۆر چاکە، زەردێکی گوڵ وردە. کتێبێکت بۆ دەنێرم پڕە لە چیرۆکی هەمە جۆر.

هەندێکم لەم چیرۆکانە خوێندووەتەوە، چیرۆکێکی تیایە بە ناونیشانی (پاڵتۆ)، حەزدەکەم ئەو چیرۆکە بخوێنیتەوە. دەبینم سووری لەسەر ئەوەی کە پێکەوە بچین بۆ شانۆ، چوونە شانۆ پارەیەکی زۆری ناوێ؟ مەگەر بلیتی کورسی ڕاڕەوەکان بکڕین..

لە مێژە نەچوومەتە شانۆ. تەنانەت لە بیرم نەماوە دواچوونم کەی بوو. تاقە شتێ کە نیگەرانو دوودڵم دەکات ئەمەیە کە نەبا زۆر گران بوەستێ: تەنیا خەمی ئەوەمە. فیدورا هەر سەر با دەداتو دەڵێت کە تۆ خەرجیت لە دەرامەتت زیاترە، هەڵبەتە ئەمە ڕاستە، شتێکە منیش بە چاوی خۆم دەیبینم، بۆ نموونە ئەو هەموو مەسرەفەی کە بۆ منی دەکەی!.. هاوڕێم ئاگادار بە ئەمە کێشەو سەریەشەت بۆ دروست نەکات. فیدورا بە ئامارە و کینایە پێی گرتووم کە دەنگۆیەك هەیە گوایە تۆو خانمی خاوەن ماڵەکە لەسەر دراکەوتنی کرێی ژوورەکەت ئەرقەشەنان بووە. من زۆر نیگەرانی

تۆم. جارێ خودا حافیز، کارێکی بە پەلەم هەیە دەبێ فریای بکەوم: دەمەوێ نەواری کڵاوەکەم بگۆڕم.

پەراوێز: دەزانی وام بەبیرا هاتووە کە **ئەگەر** بڕۆین بۆ شانۆ، کڵاوە چکۆلەکەم لەسەر بکەمو شاڵە ڕەشەکەم بدەمە بە شانما.چۆنە بەلاتەوە، پێت وایە لێم جوانە؟

**

**خانمی ئازیز فرفارا ئالکسیوفنا** **٧/٧**

... دەگەڕێمەوە سەر باسەکەی دوێنێم، باسی **رابردووی** خۆم.

بەڵێ ئازیزەکەم، منیش ئەو زەمانە، شێتایەتی خۆم کردووە. هەر لە خۆوە شێتو شەیدای ئەو خانمە ئەکتەرە بوو بووم.

ئەمەیان هەر نەیسە، ئەوەی کە زۆر سەیر بوو من هەرگیز ئەوم نەبینی بوو،و تەنیا تاقە جارێك چوو بوومە شانۆ،وکەچی شێتو شەیدای ئەو ژنە بوو بوومو نێڵەنێڵ لە ئاگری ئەشقیدا دەسووتام.

**لەو** رۆژگارەدا پێنج لاوی خوێن گەرمو پڕ جۆش دراوسێی دیوار بە دیوارم بوون. تێکەڵاویم لەگەڵدا پەیداکردن، لە راستیدا نەمدەتوانی هاتو چۆیان نەکەم، وێڕای ئەوەش بەپێی توانا هەوڵم دەدا، بەڕێزو حورمەتەوە تۆزێك خۆمیان لێ دوور بگرم، هەڵبەتە بۆ ئەوەی لەوان دوا نەکەوم، لە هەموو شتێکدا چاوم لێدەکردنو بە گاڵیان دەکەوتم.

دایەی خوا باسی ئەم خانمە ئەکتەرەیان بۆ دەکردم!

هەر شەوێك کە دەرگای شانۆ دەکرایەوە هەر **هەموویان**، بێ ئەوەی پارەی نانو ئاویان هەبێ، دەچوون بۆ شانۆ، بلیتی ڕاڕەویان دەکڕی،و لە بالکۆندا دادەنیشتنو دەکەوتنە چەپڵە لێدانو فیکەو هوڕ بۆ ئەم خانمە ئەکتەرە، وەکو ئەوەی دەستیان لێوەشابێ،و بەردەوام بە ناوی ئەم ئەکتەرەوە هوڕایان دەکێشا!

که دەشکەڕانەوە بۆ ماڵ، ئیدی خەو نەبوو، بە درێـژایی شـەو هـەر بـاس باسی ئەم ئەکتەرە بوو، هەر کەسەو بە جۆرێ ناوی دەبرد، هـەموویان بـە ئەشقی خۆیـان دەزانـی، ئیـدی منیشـیان خسـتە سـەر کەڵکەڵـە، مـن لـەو ڕۆژگارەدا لـە هـەرەتی لاویـدا بـووم‌و بـە خۆیشـم نـازانم چـۆن ئێوارەیـەك بەگەڵیان کـەوتووم، کاتێـك بـەخۆم زانـی لـە بـالکۆنی چـوارەمداو دەگـەڵ ئەواندا لە شـانۆم. تـەنیا سوچێکی بچووکی پەردەکـەم لێـوە دیـار بـوو، بەڵام گوێم لە هەموو شتێك دەبوو.

ئـەم ئەکتـەرە چـکۆلەیە ئەلهـەقی دەنگێکـی خۆشـی هـەبوو، دەنگێکـی ناسك‌و خۆش لە تۆ وایە کەناری یەو دەخوێنێ!

هەر هەمووومان میناکی شێتان چەپڵەمان دەکوتاو بەدەنگی بەرز هورامـان دەکێشـا. تەنانـەت تووشـی کێشـەش بـووین‌و یـەکێکیان لـە هۆڵەکـە وەدەرنایین.

من کە گەیشتمەوە ماڵێ وەکو سەرخۆش وابـووم! تـەنیا تاقـە ڕۆبڵێکـی زیوم لە بەرکا مابوو، هێشتا دەدانە ڕۆژیشم بۆ وەرگرتنی مووچە مابوو. دەزانی بەم حاڵەشەوە چیم کرد حەیاتەکـەم؟ سـارەزێ، بـەر لـەوەی بـۆ دایەرە بڕۆم، خۆم بە موغازەیەکی عەترفرۆشیدا کرد،و دارو نەداری خـۆم دا بە شووشەیەك عەترو سابونێکی بۆنخۆش.

ئێستاشی دەگەڵ بـێ نـازانم بۆچـی ئـەو کـارەم کـرد. ئـەو ڕۆژە تـەنانـەت فراڤینشم نەخوارد، بەردەوام بە ژێر پەنجـەرەی ماڵەکـەی ئـەودا دەهـاتم‌و دەچووم.

ماڵی لە بولواری نیفسکی بوو،ئاپارتمانێك بوو لە قاتی چوارەم.

بە پەلە بۆ ماڵەکەی خۆم چوومەوە، ئیسراحەتێکی یەك دوو سەعاتیم کردو دووبارە بۆ بولواری نفیسکی گەڕامەوە، کەوتمەوە پیاسە بە ژێر پەنجەرەی ماڵەکەی ئەودا. تا یەك مانگ و نیوی خشت ئەمە کارو کردەوەی هەموو رۆژێکم بوو.

کون بە کون دوای خانم ئەکتەر **دەکەوتم**، دەگەڕام کام گالیسکە شیك و جوان بوایە، کام عەرەبانچییە بە مەزەندەی من خێراتر بوایە بە کرێم دەگرت و دوای خانم ئەکتەر بکەوە، بە بەر پەنجەرەی ماڵەکەیدا تێپەڕە بەڵکو سەرنجی بۆ خۆم ڕاکێشم و دڵی بە دەست بێنم، خۆمم خستە سەر ساجی عەلی، تا بینە قاقام لە قەرزا نوقوم بوو،وئەنجام لەم کارە ماندوو بوومو دڵم تۆرا!

ئەمەشا ڤارینکا گیان چۆن ئەکتەرێکی شانۆ دەتوانێ پیاوێکی سەلارو سەنگین بخاتە هەڵەکە سەما. بەڵام من ئەوساکە هەرزەکار بووم. هەرزەکارێکی چکۆلە !..

م. د.

**

***خانمی زۆر ئازیز فرفارا ئالکسیوفنا.*** ***٧/٨***

بەپەلە ئەو کتێبەت بۆ دەنێرمەوە کە شەش مانگ بە ئەمانەت بۆت ناردبووم.

**هەروەها** بەپەلە بۆچوون‌و باوەڕی خۆمت سەبارەت بەو کتێبە بۆ دەنووسم. هەق نیە ئازیزەکەم، هەق نیە تۆ من بخەیە ئەم گێژاوەوە.

ڕێم بدە باپێت بڵێم کە خودای بەرزو باڵا، هەر خۆی چارەنووسی هەموو کەسێك لەم دنیایەدا دیاری دەکات. هەر ئەوە کە فلان دەکات بە جەنەڕاڵ‌و فیسار بە فەرمانبەرو کارمەندێکی چکۆلەی گومناوی دەوڵەتی.

ئەمە ویستی خودایە. ویستی خودایە کە فلان فەرمانداربێ‌و فیسار فەرمان‌و دەستوری **ئەو** لە عاردی نەدات‌و بەڕادەیەك گوێڕایەڵ‌و فەرمانبەر بێ تەنانەت نەوێرێ لە بن لێوانیشەوە گلەیی‌و گازاندەیەك بکات. هەموو شتێك بە گوێرەی تواناو بەهرەو لیاقەتی بە شەران قەڵەمی لێدراوە، هەر کەسە تواناو لیاقەتی شتێکی هەیە، کەسێك توانای لە شتێك دا هەیە،وکەسێکی دی توانای لە شتێکی تردا هەیە، بەڵام ئەم تواناو بەهرانە خودادادین.

من ئێستا نزیکەی سی دانە ساڵە لە خزمەتی فەرمیدام. بە **باشترین** شێوە کاری خۆم ئەنجامداوە، کەس ناتوانێ لەم رووەوە گلەیم لێبکات،و رەفتارو هەڵسوکەوتم سەنگین بووە، هیچ رەفتارێکی خراپم نەبووە. نە ئالودەی بادە بووم‌و نە خۆم لە هەراو هەنگامەی سیاسەت

هەڵقورتاندووە. من دەزانم کە وەکو هاووڵاتیەك، کەموکوڕی خۆم هەیە، بەڵام هەندێ سوخەتو خەسڵەتی باشیشم هەیە.

بەرپرسانم ڕێــزم دەگرن، تەنانەت خودی حەزرەتی سەرۆکیش لە کاروکردەوەی من ڕازییە، ئەگەرچی تانهوو هیچ لوتفێکی تایبەتی دەرهەق بە من نەکردووە، بەڵام دەزانم،لە کاری من ڕازیە، من سەرم لەم کارەدا سپی کردووە، وتا ئێستا هەڵەیەکی گەورەی ئەوتۆم نەکردووە مایەی گلەیی و گازاندە بێ، ڕاستە هەندێ وردە هەڵەم لێ سادر بوون، بەڵام کەس هەیە وردە هەڵەی نەبێ؟ بەندەی بێ عەیب نیە، هەموو کەس وردە هەڵەی هەیە، تەنانەت تۆش ئازیزەکەم!

بەڵام هیچ کاتێك گوناح یان هەڵەیەکی گەورەم لێ سادر نەبووە، وەکو سەرپێچی لە ڕژێم، یان شێواندنی سیستەمی گشتی. نا، هەرگیز کاری وام لێ نەوەشاوەتەوەو کەس نەبووە ڕۆژێ لە ڕۆژان بتوانی شتی وام بداتە پاڵ...

تەنانەت لەزگ بوو میداڵێکیش وەربگرم. جا من ئەم قسانە بۆچی بۆ تۆ بکەم، بەچی دەچێ؟ دەبوایە تۆ بە خۆت وەکو ویژدان، وەکو واقیع ئەوەت بزانیبایە، وخودا خۆی ئەمەی لە چارە نووسیووم، ئەگەر تۆ بتەوێ ڕۆژێ لە ڕۆژان لە بارەی منەوە بنووسیت، دەبێ هەموو ڕووداوەکان بزانی.

نا، من چاوەڕوانی ئەوەم لە تۆ نەدەکرد، **قشتیلەکەم**، نا، ڤارینکا گیان! من چاوەڕوانی ئەوەم نەدەکرد، بە تایبەتی لە تۆ.

چ فەرتەنەو ئاژاوەیەکە! یانی پیاو بۆی نیە لە سوچێکا، ئیدی ئەو سوچە هەر چیەك و هەر چۆنێك بێ، کڕو کپو بێ سەروسەدا بژی، یانی

پیاو ناتوانێ وەکو دەڵێن "بێ لێڵ کردنی ئاوی دراوسێکەی" بۆ خۆی بژیو کاری بە کاری کەسەوە نەبێ، وخەڵکی ئازاری نەدەنو خۆ لە کاروباری هەڵنەقورتێننو سەر بە کونجو لانەکەیدا نەکەنو جاسووسی بەسەرەوە نەکەنو بزانن لە خەڵوەتگەو کونجەکەیدا چ دەگوزەرێ؟

بزانن ئاخۆ ئێلەکی تازەی هەیە یان نا، ئایا جلکی تەواوی لەبەرە یان نا، چەکمەی هەیە یان نا، وقەیتانی چەکمەکانی چۆنە،چی دەخوات، چی دەخواتەوە، چ دەقێك کۆپی دەکاتەوەو دەنووسێتەوە..

ئاخر خەڵکی هەقیان چیە **ئازیزەکەم**، کە من لەو شوێنانەدا شۆستەکان نا هەموارنو سەلبەند نەکراون، لەسەر نووکی پێیان دەڕۆم تا بنی پێڵاوەکەم نەسووێت؟ بۆچی دەبێ نووسەرێك بنووسێت فڵانە کەس تەنانەت پارەی تاقە چایەکی نیە بیخواتەوە؟ یانی چا ئەوەندە شتێکی زەروریە پیاو بیخواتەوە؟

**ئەگەر** من چاو دەبڕمە دەمی خەڵکی تا بزانم چی دەخۆن؟ تا ئێستا ئەم بێ حورمەتیەم بە هیچ کەسێك کردووە؟ نا، ڤارینکا گیان، شەرمە ئازاری خەڵکانێك بدەین کە هیچ خراپەیەکیان بۆ نەبووین، گوێ بگرە ڤرڤارا ئالکسیوڤنا، با نموونەیەکی ترت بۆ بێنمەوە: من کار دەکەم، رەنج دەدەم، بە دڵو گیان کار دەکەم، سەرانم لێم رازین، رێزم دەگرن (بمانەوێو نەمانەوێ رێزم دەگرن، گومان لەمەدا نیە)، کەچی لەولاوە یەکێك قوت دەبێتەوەو لە پیاو دەبێ بە مووی لووتو بە خوتو خۆڕایی، ناوم دەزڕێنێو دەمکات بە نوکتەی سەرزاران.

راستە منیش هەندێجار پالتۆیەکی **فەوێ** بەرادان دەدەم یان جووتێ پێڵاوی تازە دەکڕمو هێندەم کەیف پێیان دێ، کە لە خۆشیاندا تا بەیانی

ناخەوم، و لە کەیفاندا لەپێستی خۆم ناهێورم، بە راستی شتێکی خۆشە پیاو جووتێ پێڵاوی تازەی لە پێدا بێ. بەڕاستی بەلەزەتە. لێتی ناشارمەوە، من هەستم بەمە کردووە، ئەمە دروست وەسف کراوە!

بەڵام پێم سەیرە چۆن فیدورا فیودوروڤیچ-ی بەرپرسمان رێی داوە ئەم جۆرە کتێبە بڵاوببێتەوە، ئەمە غەفڵەتە، چونکە ئەم کتێبە لێدانە لەویش.

**راستە** کە فیودور فیودوروڤیچ، فەرمانبەرێکی پایە بەرزە، بەڵام هێشتا گەنجە، هەندێجار حەز دەکات هاوارمان بەسەردا بکات. یانی بۆچی نابێ هاوار بکات؟ بۆچی نابێ لە کاتی پێویستدا هاوارمان بەسەردا بکاتو سەرزەنشتمان بکات؟

هەر بۆ راگرتنی هەیبەتی دایەرەکەو چاوترساندنی کارمەندەکان ئەم کارە بکات، هەقی خۆیەتی ئەمە بکات.

دەبێ خەڵکەکە تەمبێ بکات، سەرزەنشتیان بکات، چونکە – هەر بەینی خۆمان بێ.

ئێمەی کارمەندان ئەگەر چاومان لێ سوور نەکرێتەوە،ئەگەر ترسمان نەبێ هیچ کارێك ناکەین.

هەر کەسەو خەمی خۆیەتی، **جگە** لە پێشکەوتنی خۆی بیر لە هیچ شتێکی دی ناکاتەوە. دەیەوێ لێرەو لەوێ ئاماژەی بکرێتێ، ستایشی بکرێ، بەڵام کە نۆرەش دێتە سەر کار، تا دەتوانێ خۆی دەدزێتەوە. جا چونکە کارمەندان پلەو پایەی جیاوازیان هەیە، هەندێکیان لە هەندێکیان گەورەترن، بۆیە هیچ سەیر نیە هەر پلەو پایەیەك بە زمانی تایبەتی

سەرزەنیشت بکرێ، تەبیعەتو سروشتی کاروبارەکان وا دەخوازێ!
ئەگینا دنیا دەشێوێ، ئاداری بەسەر پاداریەوە نامێنێ گیانەکەم.
ژیانی کۆمەڵایەتی وەستاوەتە سەر ئەو مەرزو چوارچێوانەی ئێمە بۆ یەکتری دادەنەین، **ئەگەر** وا نەبێ دنیای دەشێوێو ئاداری بەسەر پاداریەوە نامێنێ. زەبتو رەبتو زاکونی لە هیچ شوێنێ نامێنێ. بۆیە پێم سەیرە کە چۆن فیودور فیودوروڤیچ رێگە دەدا ئەم نامیلەکە تەوس ئامێزە، ئەم نامیلکە حەیا بەرەیە بەو ئاسانیە بڵاو ببێتەوە!.
نازانم چی ئەم نووسەرەی هانداوە کە ئەم شتانە بنووسێت؟ ئاخر ئەمە بە کەڵکی چی دێ؟ پێت وایە کەسێك کە ئەم چیرۆکە وەخوێنێ، پڵتۆیەکی تازەم بۆ دەنێرێ؟ یان جووتێ پێڵاوی تازەم بۆ دەکرێت؟
نەخێر ڤارینکا گیان، ئەو کەسە تەنیا چیرۆکەکە دەخوێنێتەوەو پاشان خوا خوایەتی پاشماوەکەی بڵاو ببێتەوە.
**پیاو** هەوڵدەدات تا دەتوانێ خۆی دوورە پەرێز بگرێ، خۆی بچووك بکاتەوە، ئەوپەڕی هەوڵبدات نەبێتە مایەی سەرنجی هیچکەسێك، لە هیچ شوێنێکەوە خۆی نیشانی کەس نەدات، تا بە خوتوخۆڕایی نەبێ بە بنێشتە خۆشەی ژێر دانی خەڵکی، خەڵکی وای لێهاتووە خۆ لە هەموو کاروبارێکی ژیانی تایبەتیو گشتی بەشەر هەڵدەقورتێنن، کاتێ بەخۆ دەزانی هەموو وردو درشتێکی ژیانت، بێ هیچ شەرمو شوەییەك، دوور لە هەر نەزاکەتو ئەدەبێك، بە ناوی ئەدەبیاتەوە خراوەتە ئەو گۆڕەو کەوتووەتە سەر زاری خەڵکی و بووی بە مایەی پێکەنینو تەوسو توانجی خەڵکی! دەتکەن بە پێکەنینۆك!

پیاو ناوێرێ لە هیچ کونێکەوە خۆی نیشان بدات، چونکە هەموو شتێکی هێندە بەوردی خراوەتە کتێبەوە کە خەڵکی هەر لە رێوەو لە ریکردنیا دەی ناسنەوە.

خۆ بەلای کەمەوە یارۆی **نووسەر** دەبوایە لە کۆتایی چیرۆکەکەیدا هەندێ دەست سووك بکات.

نووسەر دەیتوانی بۆ نموونە کاتێ کە قارەمانی چیرۆکەکە لەلایەن هاورێکانیەوە کاغەز باران دەکرێ، ئەوەشی بگوتبایە، کە ئەم پیاوە مرۆڤێکی سەلارو ئابرومەندە، هاوولاتیەکی باشە، شایستەی ئەوە نیە کە لەلایەن هاوکارەکانیەوە بەو جۆرە رەفتاری دەگەڵ بکرێ.

دەبوایە بیگوتایە گوێڕایەڵو فەرمانبەرداری سەرانی خۆی بووە (نووسەر دەیتوانی لێرەدا نموونەیەکی باش بێنێتەوە).

و بە عەمراتی کەسی ئازار نەداوە، باوەڕی بە خودا هەبووەو کە مردووشە (مادامێکی نووسەر هەر سوور بووە لەسەر ئەوەی بیمرێنێ).

**هەموو** خەڵکی بۆی بە داخ بوونو بۆی گریاون، هەڵبەتە باشتر وابوو ئەم کلۆڵە نەمرێنێ، بەڵکو کارێکی کردبا کە پلتۆکەی بدۆزێتەوە، یان فیدۆر فیدۆروڤیچ بانگی کردبا.. نا... ئەوە چ دەڵێم؟

مەبەستم ئەوەیە ئەو ئەفسەرە (جەنەراڵ) دوای ئەوەی پەی بە گوێڕایەڵیو خزمەتگوزاری ئەو دەبرد بانگی کردبا بۆ دایەرەکەیو پلەو پایەی دابایەو مووچەکەی بۆ زیاد کردبا. هەنگێ هەموو شتێك بە باشی دەبڕایەوەو پیاو خراپ بە سزای خۆی دەگەیو پیاوی باش پاداشتی خۆی وەردەگرت، هاوەڵەکانیشی خەجاڵەت دەبوونو تەریق دەبوونەوە.

ئەگەر من ئەم چیرۆکەم نووسیبوایە، بەو جۆرەم دەنووسی.

ئاخر ئەم چیرۆکە بە کەڵکی چی دێت، چ سوودێکی هەیە؟ چ جوانیەکی ناوازەی تیایە؟ تەنیا واریڤاتێکی سواوی پواوی نەگبەتیو بەدبەختی ژیانی رۆژانەی گێڕاوەتەوە!

نازانم **ئازیزەکەم** چۆن بە بیرتا هاتووە ئەم کتێبە بۆ من بنێری؟ ئەمە بە غەرزەوە نووسراوە ڤارینکا گیان، چیرۆکێکی ناواقیعیە، چونکە کارمەندی لەو جۆرە نیەو نابێت. نا، نا... لێبڕاوم سکاڵای لەسەر قەید بکەم ڤارینکا، سکاڵای لەسەر قەید دەکەم.

*خزمەتکاری دڵسۆزت*

*ماکار دیوشکین*

**

*ڕێزدار ماکار ئالکسیوڤیچی ئازیز.* *٧/٢٧*

کارو نامەکانی ئەم دواییەت نیگەرانو پەشێویان کردووم.
باش بوو لەو دواییەدا فیدورا هەموو شتێکی بۆ گێڕامەوە. هەموو شتێکم لەوەوە زانی.
بۆچی بەم ڕادەیە خۆت نقومی نا ئومێدی کردووەو خۆت بە گێژاو سپاردووە، پێم نالێی ماکار ئالکسیوڤیچ؟
بەڵگەو بیانوەکانت قەناعەتیان پێ نەکردووم، نە هەقم بوو کە ئەوساکە سوور بووم لەسەر ئەوەی ئەو کارە باشەی کە بۆیان پێشنیاز کردبووم، قەبوڵ بکەم؟
پێت وا نیە هەق بە من بوو؟ بەڕاستی دوا ڕەفتارت نیگەرانی کردووم. کە دڵنیات دەکردم ئەوەی بۆ منی خەرج دەکەیت لەو پاشەکەوتانەیە کە بۆ تەنگانەت هەڵگرتوون، هەستم دەکرد چەند قەرزاربارى تۆم...
بەڵام ئێستا بۆم دەرکەوتووە کە هیچ پاشەکەوتێکت نەکردووەو نەبووە. کە لەلاوە بە وەزعی نالەباری دارایی منت زانیوە بەزەییت پێدا هاتومەتەوەو بڕیارت داوە مووچەی چەند مانگێکت پێشوەختەو وەکو سلفە وەربگریتو لەو پارەیە یارمەتی من بدەیت.و تەنانەت کاتێ کە نەخۆش بووم، جلو بەرگی خۆتت بۆ فرۆشتووم.
کە ئێستا ئەم ڕاستیانەم بۆ دەرکەوتووە، زۆرم لەبەر گرانە، ئەوەندەم لە لا ناخۆشە نازانم چۆنی لێک بدەمەوە، نازانم چی بڵێم. ئاخ، ماکار ئالکسیوڤیچ! تۆ دەبوایە لە چوارچێوەی ئەو چاکانەی کە لە سەرەتاوە

دەرهەق بە منت کردبوون دەرنەچیت، ئەو چاکانەی کە زادەی سۆزو مەحەبەتی خزمایەتی بوون،و پارەکانت بەو شتە نا پێویستانەی دوایی، لە ڕای مندا بەفیڕۆ نەدابا.

ماکار ئالکسیوڤنا تۆ خیانەتت بە دۆستایەتیمان **کردووە**، چونکە راستیت لێ شاردومەتەوە. جا ئێستا کە دەبینم دوا پارەو پولتان بۆ من داوە بە جلو بەرگی جوان، شیرینیو گەڕانو پیاسە،وبلیتی شانۆو دیارییو کتێبان، هەست بە پەشیمانییەکی زۆرو عەزابی ویژدان دەکەم (چونکە من هەموو ئەو شتانەم لە تۆ قەبوڵ کردووە، بێ ئەوەی وەزعو حاڵی تۆ ڕەچاو بکەم). هەموو ئەو کارانەی کە تۆ بۆ شادیو دڵخۆشی منت کردوون، ئێستا لێم بووە بە عەزابو جۆرە پەشیمانیەکی بێهودەی لە دڵو دەروونم دروستکردووە.

دەمێکە خەمینو نائومێد دەتبینم، هەرچەندە لە دڵی خۆدا دەترسام ڕووداوێکی ناخۆشت بەسەر بێت، بەڵام هەرگیز، بەخەویش چاوەڕێی ئەمە نەبووم. ئەمە **چییە**؟ چۆن دەشێت بەو ڕادەیە خۆت بە نائومێدی بسپێریت ماکار ئالکسیوڤیچ؟

ئاخر ئێستا خەڵکی، دۆستو ئاشنا چی دەڵێن؟

سەبارەت بە تۆ چ دەڵێن؟ تۆیەك کە منو هەموو خەڵکی لەبەر میهرەبانیو بێ فیزیو بەردەباریت ڕێزمان دەگرتیت، چۆن دەبێ خۆت بخەیتە گێژاو کێشەیەکەوە کە کەس تا **ئێستا** شتی وای لێ نەدیوی.

دەزانی کە لە فیدورام زانی گوایە بە مەستی لە شەقاما هەڵیانگرتوویتەوەو پۆلیس بۆ ماڵەوەی بردویتەوە چیم بەسەر هات! باوەڕ بکە ئەقڵم وەستا، بە جارێ حەپەسام. لە جێی خۆم وشك بووم!

هەرچەندە پێشوەختە چاوەڕوانی ڕووداوێکی نا ئاسایی بووم، چونکە چوار ڕۆژ بوو نەچوو بوویت بۆ دەوامو غایب بوو بووی. باشە ماکار ئالکسیوڤنا هیچ بیرت لەوە کردووەتەوە ئەگەر بەر پرسەکانت بەهۆی ڕاستەقینەی ئەم دەوام نەکردنەت بزانن چ دەڵێن؟

تۆ بە خۆت دەڵێی هەموو خەڵکی گاڵتەت پێدەکەن، پێت پێدەکەنن؟ بەخۆت دەڵێی هەمووان بە دۆستایەتی ئێمەیان زانیوەو دەروودراوسێکانتان تەشەرت لێدەدەنو سەبارەت بە من قسەی بە تەوسو توێکڵاَن دەکەن. تکایە ماکار ئالکسیوڤیچ گوێ بەو قسانە مەدە، بۆ خاتری خوا جڵەوی خۆت بگرە.

من نیگەرانو ناڕەحەتی ئەو بەرخوردەتم کە دەگەڵ ئەو ئەفسەرانەدا بووتە، شتێکی لا بەلام دەربارەی ئەو بەرخوردو ڕەفتارە بیستووە.

تکایە پێم بڵێ ئەم بەرخوردە لەسەر چی بوو؟ لە نامەکەتدا نووسیوتە ترساوی بەڕاشکاوی قسە دەگەڵ مندا بکەی، لەوە ترساوی ئەگەر ڕێکو ڕاست قسە دەگەڵ مندا بکەی دۆستایەتیەکەمان بشێوێو تێك بچێت.

و لە کاتی نەخۆشیەکەی مندا، زۆر نائومێد بوویت، چونکە نەتزانیوە چۆن وەهانای منەوە بێیتو یارمەتی من بدەیت،و ئیدی هەرچیت هەبووە فرۆشتووتە تا بتوانی یارمەتی من بدەیتو بۆ نەخۆشخانەم ببەن،و ئەوەندەی توانیوتە قەرزوقۆڵەت کردووە،و هەموو ڕۆژێك دەگەڵ خاوەن خانووەکەتدا دەمبۆڵەو قەرقەشەت بووە.

بەلاَم تۆ بەو کارەت، کە ڕاستیت لە من شاردووەتەوە، زۆر خراپت کردووە، هەڵەت کردووە. بە هەرحاڵ من ئێستا هەموو شتێك دەزانم، تۆ نە تویستووە من بە شتەکان بزانمو هەست بکەم کە من مایەی ئەم وەزعو

حاڵە ناڵەبارو نا هەنجارەی تۆ بووم، بەڵام ئێستا ئەم رەفتارەی تۆ زیاتر خەمباری کردووم‌و پتر عەزابم دەدات. هەموو ئەمانە پەریشان‌و نیگەرانم دەکەن ماکار ئالکسیوفیچ، ئاه'هاوڕێکەم! کڵۆڵی پەتایە، نەخۆشیەکی گیرۆیە، بۆیە دەبێ کڵۆڵان‌و هەژاران لێکدی دوور بکەونەوە، پارێز لە یەکتر بکەن، تا کڵۆڵیەکەیان بۆ یەکتر نەچێت. من کوێرەوەری‌و کڵۆڵیەکم بەسەر تۆ هێناوە کە بە عەمرانتت لە ژیانی هەژارانەو گۆشەگیری خۆتا نەت دیتبوو. هەر هەموو ئەمانە عەزابم دەدەن‌و خەریکە لە داخ‌و خەفەتا دەمرم.

تکایە رێک‌و ڕاست بۆم بنووسە کە چیت بەسەر هاتووەو چۆن ئەو رەفتارەت کردووە. ئەگەر دەکرێت دڵنیاو ئاسوودەم بکە.

**هەڵبەتە** من لە خۆپەرسیتەوە داوای ئاسوودەیی لە تۆ ناکەم، بەڵکو لە رووی دۆستایەتیەوە، لە رووی دڵسۆزی‌و خەمخۆریەوە، لە رووی خۆشەویستی تۆوە ئەم داوایە دەکەم،کە هیچ شتێك ناتوانێ لە لاپەڕەی دڵمیا بسڕێتەوە. چاوەڕوانی وەڵامی تۆم. ماکار ئالکسیوفیچ تۆ هێشتا من باش ناناسیت.

*هاوڕێی دڵسۆزو راستەقینە*

*ڤرڤارا دوبروسیلوڤا.*

**

*فلارا ئالكسيوفناى ئازيزو گرانقەدرم* *٧/٢٨*

زۆرباشە، ئێستا کە هەموو شتێك تەواو بووەو شتەکان بەرەبەرە رەوتی جارانی خۆ وەردەگرنەوە، منیش ئەمە بە تۆ دەڵێم حەیاتەکەم:
تۆ خەمی ئەوەتە کە خەڵكی چ گومانێکم لێدەکەن‌و چم دەربارە دەڵێن، بۆیە بەپەلەو بەراشکاوی پێت دەڵێم فرفارا ئالکسیوفنا، من قەدرو حورمەتی خۆمم لە **هەموو** شتێکی دیکەی ئەم دنیایە، بەلاوە گرنیگترە.
جا سەرباری هەموو ئەو بەدبەختیەی بەسەرم هات‌و ئەو گێژەنگو گێژاوەی تێی کەوتووم، حەز دەکەم ئاگادارت بکەم کە هیچ یەکێك لە بەرپرسەکانم هیچیان دەربارەی ئەم واریقاتە نەزانیوەو ئەگەری ئەوەش لە ئارادا نیە رۆژێ لە رۆژان پێی بزانن، بۆیە وەکو جاری جاران بەرێزو حورمەتەوە رەفتارم دەگەڵ دەکەن.
من تەنیا لە یەك شت دەترسم: لە دوو زمانی، لە بوختان‌و ئیفتیرا.
راستە خاوەن خانووەکەمان شەڕی پێ دەفرۆشتم، قرەقرى دەكرد، بەلام لەوەتای بە کۆمەکی ئەو دە رۆبڵەی تۆ بۆت ناردم، هەندێ لە قەرزەکانیم داوەتەوە، ئەویش هێوربووەتەوەو مەگەر لە بن لێوانەوە خوتەخوتێك بکات.
دەربارەی خەڵکەکەی تر، **هیچ** گلەییەکم لە دەستیان نیە، ئاکارو رەفتاریان لەگەڵمدا باشە. تا داوای قەرزیان لێ نەکەی، هەقیان بەسەرتەوە نیە.

له کۆتایی دا حەزدەکەم ئەوە بزانی کە ئەو ڕێزو حورمەتەی تۆ لە منی دەنەی، بەنرخترین شتی ئەم دنیایەیەو بۆ ئەم وەزعو حاڵە پەریشانەی ئێستای من مایەی تەسەلایە.

شوکو بۆ خوا ئەو هەورو هەلایە ڕەوییەوە، یەکەمین جەزرەبەی ئەم کارەساتە لە چاو خۆیا بە سەلامەتی تێپەڕی.و بەوەت لێك نەدایەوە کە من دۆستو هاوڕێیەکی درۆزنو خۆپەرست بمو تەنیا لەبەر ئەوە حەزم کردووە لە نزیکی من وەمێنیو بۆ هیچ شوێنێکی دی نەڕۆی چونکە توانای دووری تۆم نەبووەو تۆم وەکو فریشتەیەکی چکۆلەی خۆم خۆش دەوێ.

من ئێستا بەوپەڕی جدیەت گەڕاومەتەوە سەر کارو بە باشترین شێوە **هەموو** ئەرکێکی ڕۆژانەی خۆم ئەنجام دەدەم.

تەنانەت (ئوستاف ئیڤانوڤیچ)ش کە دوێنی بەلایا ڕەتبووم تاقە وشەیەکی لە دەم دەرنەهات.

لێتی ناشارمەوە ئازیزەکەم، کە قەرزەکانو شڕوشەپڕێوی جلەکانم زۆرم ئازار دەدەن، بێتاقەتم دەکەن، بەڵام ئەمەش هیچ نیە، تکات لێدەکەم ئازیزەکەم خەفەت بەمە مەخۆ. ڤارینکا نیو ڕۆبڵی دیکەت بۆ ناردوم، بەڕاستی ئەم پەنجا کوپیکە وەکو خەنجەرێکە بە دڵمدا کرابێ.

تۆ تەمەشا، شتەکان چۆن ئاوەژوو بووەتەوە! ئێستا من کۆمەکی تۆ ناکەم، کە پیرەمێرێکی گەوجو کەودەنم...

بەڵکو تۆ، تۆی هەتیوی بەلەنگازی بێنەوا، بەهانای منەوە دێیو یارمەتیم دەدەی! دەبێ مەمنونی فیدورا بین کە توانی هەندێ پارە پەیدا بکات.من بەش بە حاڵی خۆم ئێستا هیچ ئومێدێکم لەو بارەیەوە نیە، هیچ

شتێك شك نابەم، هەر كاتێك دەرگای ئومێد كرایەوە، هەنگێ نامەت بۆ دەنووسمو لە هەموو شتێكت ئاگادار دەكەم.

بەلاّم دادوبێداد لە دەست بەد زمانیو بوختان، هیچ نامكوژێ دوو زمانی نەبێت.

خودا حافیز فریشتە چكۆلەكەم. دەستە جوانەكانت ماچ دەكەم، هیوادارم زوو چاك بیتەوە. لەوەی پترت بۆ نانووسم، چونكە پەلەمە، دەبێ بڕۆم بۆ سەر كارەكەم، دەمەوێ بە كردەوە هەڵەو كەمو كوڕیەكانم پڕ بكەمەوە، بەڵكو لە دایەرە غایب بوونەكەم لە بیر بكەن. ئێوارە كە هاتمەوە بە دوورو درێژی باسی هەموو ئەو واریقاتانە،وبەرخوردمت دەگەڵ ئەفسەرەكاندا، بۆ دەنووسم.

*لەگەڵ ئەو پەڕی رێزو*
*خۆشەویستی ماورێتدا*
*ماكار دیوشكین.*

**

٧/٢٨

**ئاخ ڤارینکا**. ڤارینکا، ئەمجارەیان تۆ گوناحکاری! تاوان، تاوانی تۆیە!
بە نامەکەت گێژو کاست کردووم‌و بەلانست تێکداوم..
ئێستا، ئێستا کە بەکاوەخۆ خۆ بە قوڵایی دڵمدا دەکەم‌و گۆشە پەنهانەکانی دڵم دەپشکنم. دەزانم کە من لەسەر هەق بووم، بە تەواوەتی هەق بەمن بووە.
باسی مەستی یەکەم ناکەم ( واز لەوە بێنە، بەسە، بەسە جارێکی دی مەچۆوە سەری حەیاتەکەم!) بەڵکو باسی خۆشەویستیم **بۆ** تۆ دەکەم، خۆشەویستیم بۆ تۆ کارێکی شێتانە نەبووە، هەرگیز شێتانە نەبووە.
تۆ هەموو شتێك لەمبارەیەوە نازانی **فریشتەکەم**. ئەگەر بتزانییا بۆچی ئەم رووداوە روویدا، بۆچی من هیچ چارێکم نەبوو جگە لە دڵبەندی تۆ، رەنگە ئەو قسانەت نەکردبایە. هەموو ئەو قسە مەنتیقی‌و ئامۆژگارییە ئەقڵانیانەی بۆ منی دەکەی، قسەی ئەقڵی تۆن، دڵنیام قسەی دڵت شتێکی ترە.
حەیاتەکەم من بە خوێشم بە تەواوەتی نازانم‌و بە باشی نایەتەوە بیرم ئەو شتەی بەینی من‌و ئەفسەرەکان **چۆن** رووی دا. بەلام دەبێ دان بەوەدا بنێم فریشتە چکۆلەکەم، کە من لەو کاتەدا، یەجگار پەرێشان بووم، حالم حال نەبوو. بە خۆت دەزانی من بە درێژایی مانگی پێشوو بە حاڵ بە پێوە بەند بووم، لە ئان‌وساتا بوو بکەوم، هەرەس بێنم.

وەزعێکی یەجگار نالەبارم هەبوو. هەموو شتێکم دەتەپاندە دڵمەوەو نە تۆم دەبینیو نە هیچ کەسێك لە هاوماڵەکانم دەبینی، هەوڵم دەدا کەس نەمبینێ، بەڵام خاوەن ماڵەکە هەر شاتەشاتی بوو.

ئەگەر ئەم شاتەشاتو بۆڵەبۆڵەی لە کاتێکی تردا بووایە هەر گوێم نەدەدایە. با هەر بۆخۆی ڕێسابای، هاواری کردبا. بەڵام ئەو یەکەم حەیای منی برد، خەجاڵەتی کردم،و دووەم نازانم چۆن بە هاوڕێیەتیو دۆستایەتی منو تۆی زانی بوو، پڕاو پڕی ماڵەکەو لە بەردەمی هەموو هاوماڵەکاندا هاواری دەکردو ئەم دۆستایەتیەی ئێمەی لە قاو دەداو شتی وا ناشرینی دەگوت لە تاوا هەر بەنج بوومو هەردوو گوێی خۆم گرت تا گوێم لە قسە قۆڕەکانی نەبێ.

لێ مەخابن خەڵکەکەی دی نەك هەر گوێیان دانەخست بەڵکو تا توانیان کردیانەوەو گوێیان هەڵخست...

وام لێهات گیانەکەم نەمدەزانی لە کوێ خۆم وەشێرم... جا فریشتە چکۆلەکەم، هەر هەموو ئەم نەگبەتیە جۆراو جۆرە ترسناکانە بەسەرمدا کەڵەکە بوو بوونو بە جارێ لە پەلوپۆیان خستبووم.

ئەوجا کوتوپڕ شتێکی سەیرم لە فیدورا بیست:

گوایە کەسێکی خوێڕی هاتووەتە بەردەرگاو بەپێشنیازە بێ شەرمانەکانی سوکایەتی بە تۆ کردووە،و تانەو تەشەری لێداویو دڵی یەشاندووی، مەگەر هەر من سوێی ئەو تانەو تەشەرانە بزانم، چونکە بە خۆم بە سەرم هاتووە. لەو دەمەدا، گیانەکەم، ڕێك لەو دەمەدا، پەستو پەریشان کۆنترۆڵی **خۆم** لە دەست داو جڵەوم لە دەست بەربوو، ڤارینکا گیان تۆڕە بوونێکی شێتانە سەراپای داگرتمو بەلەز لە ماڵ وەدەرکەوتم.

دەمویست بڕۆمو یەخەی ئەو پیاوە خۆێڕیو بودەڵەیە، ئەو بێ ئابڕووە بگرم، نەمدەزانی گەرەکمە چی بکەم، ئەوەندە دەزانم لێبڕابووم نەیەڵم کەس سووکایەتی بە تۆ بکات. فریشتە چکۆلەکەم مەگەر خوا بزانێ چەند خەمبار بووم!

لە چ وەزعێکی نالەباردا بووم!

باران بە خوڕزم دەباری، قوڕوچڵپاو دەگەییە چۆکان، ڕۆژێکی یەجگار گرژو مۆنو خەمین بوو. خەریك بوو لە نیازو بڕیارەکەم ژێوان ببمەوەو بۆ ماڵ بگەڕێمەوە، ئیدی گیانەکەم ئەوەی کە نەدەبوو ببێ بوو.

تووشی ئیمیل بووم، مەبەستم (ئیمیلین ئیلیچ)ـە کە کارمەندی دایەرەکەی خۆمە، نە، جاران کارمەندی ئەوێ بوو، **چونکە** ئێستا کارمەند نیە، لە دایەرە دەریانکرد. نازانم ئێستا چی دەکات، دیارە لێرەو لەوێ بە دوای ناندا وێڵە. بە هەر حاڵ تووشی ئەو بووم لەگەڵیا کەوتمە ڕێ. پاشان ئەوەی رووی دا...

بەڵام ڤارینکا گیان باوەڕ ناکەم تۆ بە خوێندنەوەو بیستنی ئەو نەگبەتیانەی بەسەر دۆستەکەتدا هاتوون، بەو کارەساتەی لێی قەوماوە، بەو عەزابو رەنجەی کێشاویەتی خۆشحاڵ ببی. ئێوارەی ڕۆژی سێیەم ئیمیلین دنەی دام:

**چووم** بۆ لای ئەو ئەفسەرەی بێ وێڵی دەرهەق بە تۆ کردبوو، ئەدرەسەکەیم لە دەرگاوانی ئاپارتمانەکەی خۆمان وەرگرت.

ئەوی راستی بێ گیانەکەم، من لە مێژ بوو تاقیبی ئەم مێردەکەم(بۆرە پیاو) دەکرد، دەمناسی، ماوەیەك لە هەمان ئاپارتمانی ئێمە ژووری بەکرێ گرتبوو.. بە هەرحاڵ ئێستا دەزانم کە زۆر خەتام کرد، چونکە لەو

کاتەدا کە لە چوونی منیان ئاگادار کردبوو، من ئاگام لە خۆ نەبوو، ئاسایی نەبووم. جا ڤارینکا گیان پێویست ناکا درۆت دەگەڵ بکەم، هیچ لەبیرم نیە چی رووی دا، تەنیا ئەوەندەم لەبیر ماوە کە ماڵەکەی جمەی دەهات، پڕ بوو لە ئەفسەر، یا لەوەیە چاوانی من یەکی بە دوو بینی بێ...

مەگەر هەر خوا ئەمە بزانێ... و بیرم نایەت چیم گوت. بەشەرەفم تەنیا **ئەوەندەم** لەبیرە زۆرم رێسا، زۆرم قسەی ناشیرینو بێ تام کرد، جنێوم دا. هەنگێ ئەوانیش یەخەیان گرتمو لە قاڵدرمەکانەوە هەڵیاندامە خوارێ...

نا، هەڵیان نەدامە خوارێ، تەنیا دەڵەکیان دام. ئیدی بە خۆت پاشماوەکەی دەزانیت، دەزانیت چۆن گەییشتمەوە ماڵێ. ئەمە هەموو رووداوەکە بوو. هەڵبەتە من بەم کارە خۆم سووک کرد، کەرامەتی خۆم لە دەست دا، هەیبەتی خۆم بەفیڕۆ دا. بەڵام هیچ کەسێك بەمەی نەزانیوە. کەواتە وەکو ئەوەیە هیچ شتێك رووی نەدابێ.

تۆش پێت وا نیە ڤارینکا؟ بە هەرحاڵ ئەوەی من سوور دەیزانم ئەمەیە پار لەدایەرەکەی خۆمان ئوکسنتی ئوسیپوڤیچ هێرشێکی لەو بابەتەی کردەسەر شەرەفو حەیسێتی شەخسی پێوتەر پتروڤیچ، بەڵام لە پەناوە ئەم کارەی کرد، کەس پێی نەزانی، بردیە ژووری پاسەوانەکە، و من لە درزی دەرگاکەوە سەیرم دەکردن.

ئیدی ئەوەی کرد کە **پێویستە** لەو حاڵەتانەدا بکرێ، بەڵام بەشێوەیەکی مەردانە، چونکە جگە لە من کەسی تر نەی بینی. جا با بشی بینم؟

من هەقم چیە؟ دەکەمە چی؟ مەبەستم ئەمەیە کە واریقاتەکەم بۆ کەس نەگێڕایەوە. ئیدی لەوە بە دواوە پیوتەر پتروڤیچ و ئوکسنتی ئوسیپوڤیچ تانەوتەشەریان لێکدی نەدا.

بەخۆت دەزانی، پیوتەر پتروڤیچ پیاوێکە زۆر **بە** خۆی دەنازێ، ناوو ناوبانگی خۆی خۆش گەرەکە، بۆیە هیچی بۆ کەس نەگێڕایەوە، تا ئێستاش سڵاووچاك وخۆشیان لە بەیندا هەیەو لە بەر چاوی خەڵکی تەوقە دەکەن. ڤارینکا گیان من لێتی **ناشارمەوە**، ناتوانم نکۆڵی لەوە بکەم کە زۆریان سووکایەتی پێکردم، زۆر شکامەوە، لەوەش خراتر ئەوەیە کە لە بەر چاوی خۆیشما شکامەوە، لەبەر چاوی خۆیشم کەوتم، هیچ ئیحتوبارێکم نەما. دیارە لە ئەزەڵەوە ئەمە بەختی من بووە، بێگومان ئەمە قەدەروچارەنووسی منە، کەس نیە لەم دنیایەدا بتوانێ لە چارەنووس هەڵێت، بەخۆت ئەمە دەزانیت.

ئیدی ڤارینکا گیان ئەمە بوو ئەو نەگبەتیو بەڵایانەی **بەسەرم** هاتن.. کە دەکرێ نەی خوێنیتەوە، تازە کە هەموو شتێك بڕایەوە، خوێندنەوەی بۆ چیە؟

ڤارینکا **گیان**، هەستدەکەم حاڵم زۆر باش نیە، ماندوو بێتاقەتم، خۆشیو شادیەکەی جارانم لە دڵدا نەماوە. بۆیە لە کۆتایی دا هەمان ڕێزو حورمەتو خۆشەویستی جارانی خۆمت بۆ دووپات دەکەمەوە، وهەر خزمەتکارە گوێڕایەڵو دڵسۆزەکەی جارانم.

*خزمەتکاری گوێڕایەڵت*

*ماکار دیوشکین*

*مێژا ماکار ئالکسیوڤیچ—ی ئازیز:* *٧/٢٩*

هەردوو نامەکەتم خوێندەوە، زۆرم پـێ سـەیر بـوو! گـوێ بگـرە هـاوڕێی ئازیزم، یان ئەوەتا شتێکم لێ دەشاریتەوەو تەنیا بە شـێکی ئـەو رووداوە ناخۆشـەی بەسـەرت هـاتووە دەگێڕیتـەوە، یـان هێشـتا هـەر نیگـەران‌و پەرێشانی ماکـار ئالکسـیوڤیچ... نامـەکانت ئـەوە نیشـان دەدەن.. تـوبی توخودا ئەمڕۆکە سەرێکم لێ بدە، گوێ بگرە، وەرەو شـێو لەگـەڵ ئێمـەدا بخۆ، زۆرمان پێ خۆش دەبێ.

من نازانم وەزعت چۆنە، ئایا دەگەڵ خاوەن خانووەکەدا پێکهـاتووی یـان نـا، تـۆ هیچـم لەمبارەیـەوە بـۆ نانووسـیت، دڵێـی بـە ئانقەسـت شـتێك دەشاریتەوە.

جارێ بە دوعا هاوڕێم، تکات لێدەکەم کە ئەمڕۆ بێی بۆ لامان، هـەر دەبـێ بێی. باشترین شت ئەوەیە کە **هەموو** رۆژێك بێیـتو شـێو دەگـەڵ ئێمـەدا بخۆی. فیدورا کابانێکی زۆر چاکە، ئاشپەزە نە گڵتە. خودا حافیز.

*دڵسۆزت*

*ڤرڤارا دوبروسیلوڤا*

**

فرفارا ئالکسیوفنای ئازیزم ٨/١

خەنی لە خۆت دایکەلیٚ، کە خودا فرسەتی بۆ رەخساندوویت بە چاکە چاکە بدەیەوە،و سوپاسگوزاریو منەتباری خۆتم بۆ بسەلمێنی.

مـن ئەمـە دەزانم ڤارینکا گیـان، دەزانم چەند دلێ میهرەبانی، دلـی فریشتەت هەیە، ئەمەم بۆ ڕیا نیە، بۆ ئەوەم نیە چاکەم بدەیەوە. بەلاَم وەکو جاری پێشوو ئەوەم بیرمەخەوە، ئەوەم بە چاوا مەدەوە کە بەسەری پیری پارەکانم بە فیڕۆ دەدەم، رەفتاری شتێتانە دەکەم. ئەگەر سووری لەسەر ئەوەی هەلەم کردووە، خەتام کردووە، بەلێ هەلەم کرد، هەلەم کردووە... ئەو کارەی من هەلەیە...

بەلاَم دۆستە چکۆلەکەم، دایکەلیٚ.. زۆرم لەبەر گرانە ئەو شتانە لەزاری تۆوە بژنەوم. نابێ لەم قسەیەی من تورە بی، لێم مەگرە دایکەلیٚ، دلم ئەنجن ئەنجە، یەکپارچە دەردو ئازارە.

**خەلکی** هەژار بە تەبیعەت هەلچوون، ئەمە جاری یەکەم نیە کە هەست بەمە دەکەم. هەژار کەسێکی هەمیشە توندو بەدگومانە، گۆشەنیگایەکی تایبەتی بۆ جیهان هەیە، بە دزیەوە دەڕوانێتە هەر ڕێبوارێك، **بە** نیگایەکی نیگەرانو گوماناوی دەڕوانێتە دەوروبەر، گوێ بۆ هەر وشەیەك هەلدەخات: ئاخۆ باسی ئەو دەکەن؟ گالتە بە رێکردنە خوارو خێچو پێکەنیناویەکەی دەکەن؟ ئایا دەیانەوێ هەستەکانی بخوێننەوە؟

لە هەموو لایەکەوە، لە راستو لە چەپەوە بەر نیگای دەدەن، تا بیچمو سەرو سەکوتی هەڵسەنگێنن، **چونکە** دەزانن، کە خەڵکی هەژار لە پەلاسە کۆنێکیش بێ نرخترە،و هەرگیز چاوەڕوانی ئەوە نیە لەلایەن خەڵکییەوە رێزی بگیرێ، ئیدی ئەم نووسەر یان ئەو قەڵەم بەدەست هەرچیەك دەڵێو دەنووسێت، بۆ خۆی دەڵێتو دەنووسێت! سەری دای لە بەرد!

**ئاخ** لە دەست ئەو نووسەرە چەنە بازانە! ئاخ لە دەست ئەوانەی هەر خەریکی کاغەز رەشکردنەوەن! چەند لە رێزکردنو رازانەوەی دەستەواژەو رستەدا وەستابن، مرۆڤی هەژار لە هەوەڵەوە چۆن بووە هەروا دەبێت، وناگۆڕێت.

بۆچی ئەم مرۆڤە هەژارە وەکو خۆی دەمێنێو ناگۆڕێ؟ **چونکە** بە بۆچوونی ئەو خەڵکانە، مرۆڤی هەژار دەبێ لە سڵق رووت تر بێ، هەموو شتێکی بە بەرچاوەوە بێ، هیچ نهێنیو شتێکی شاراوەی نەبێت، و هیچ شانو شەوکەتو کەرامەتێکی نەبێت..

ئەوەی لێ حەرامو قەدەغەیە!

تۆ تەمەشای ئەم نموونەیە: ئیمیلین ماوەیەك لەمە پێش بۆی گێڕامەوە کە خەڵکانێك هەرەوەزی پیتاکیان بۆ کردووە، هەموو ئەوانەی کە پیتاکیان پێداوە هەقی خۆیان بووە تەحقیقێکی نیمچە فەرمی بکەنو کەسایەتی ئەو بناسن، نهێنییەکانی ژیانی بزانن، کە گوایە چاکەی دەگەڵ بکەنو بە چەند پولێك یارمەتی بدەن، **بەلام** ئەوەی راستی بێ، ئەو پولەیان لە رووی خێرخوازیو چاکەکارییەوە نەداوە، ئەمە نرخی دیتنی کابرایەکی هەژار بووە. کابرا نمایشی هەژاری بۆ کردوون، تەنانەت چاکەو

خێرخـوازیش لـەم رۆژگـارەدا بەشـێوەیەکی سـەیرو نـا ئاسـایی ئـەنجام دەدریێ دایکەلیێ..

**بەڵام** رەنگە هەمیشەو لە هەموو رۆژگارەکانا ئەمە وا بووبێ، کێ دەزانێ ! جا ئەمە بۆ دوو شت دەگەڕێتەوە، یان ئەوانە نازانن چۆن چاکە بکـەن، یان وەستاو کۆنەکارن لەو مەیدانەدا، نازانم ئەمیانە یان ئەویان.

رەنگە تۆ ئەمە نەزانی، بەڵام ئێستا بیزانە ! من لە هـەموو شـتێکدا گێـلو نەزانم، بەڵام لەم مەیدانەدا پسپۆرم. رەنگـە لـێم بپرسـیت بۆچـی خـەڵکی هەژار ئەمە دەزانن؟

بەو شێوەیە بیر دەکەنەوە؟ ئەمە هـەمووی ئەزموونـە **ئازیزەکەم** ئـەزموون، چونکە هەموو شتێك تاقی دەکەنەوە.

بۆ نموونە دەزانێ ئەو نەجیمزادەیەی کە بـەلایا تـێ دەپـەڕێو دەچـێ بـۆ خوارنگەیەك، لە دڵی خۆیدا دەڵێت: "دەبێ ئەم کارمەنـدە شـرۆڵەیە، ئـەم رووتەیە ئەمرۆ چی بخوات.

مـن داوای نەفـەرێك بـرژاو دەکـەم، بـەڵام ئـەو رەنگـە ساواری بـێ رۆن بخوات".

بەڵام ئەو هەقی چیە کە من دەمەوێ چی بخۆم؟

ئێدی ڤارینکا گیان، دایکەلێ، خەڵکانێکی لـەو جـۆرە هـەن، هـەموو کـاتی خۆیان بەو جۆرە بیرکردنەوانە بەسەر دەبەن.

**ئێـــدی** ئـەو خەڵکانـە، ئـەو نووسـەرە بـێ شـەرمو لاسـارانە، کـە بـە شەقامەکاندا دەگەڕێنو دەڕۆن، هەموو خەمێکیان ئەوەیە بزانن کـە ئـاخۆ فـلان کـەس وەخـتێ رێدەکات پێـی تـەخت لەسـەر عـاردی دادەنـێ، یـان لەسـەر نـووکی پـێ دەڕوات، حـەز دەکـەن بـزانن کـە پێڵاوەکـانی فـلان

کارمەندی بچووکی فلان دایەرە، دڕاوە، نووکی پێی لێ هاتووەتە دەرەوە یان نا. ئایا قۆڵی چاکەتەکەی دڕاوە، ئانیشکی لێ هاتووەتە دەرەوە؟ هەموو ئەم سەرنجانە لە هزری خۆدا تۆمار دەکەن و پاشان دەچنەوە ماڵێ و چیرۆکێك لەمبارەیەوە دادەڕێژن و ئەم شتە تورەهات و قێزەونانە چاپ و بڵاودەکەنەوە!

بەوان چی کە قۆڵی چاکەتەکەم دڕاوە؟

بمبورە ڤارینکا **گیان**، ئەگەر ڕێگەم بدەی پێ لەبەرەی خۆ درێژتر دەکەم و دەڵێم پیاوی هەژار لەم رووەوە هەمان شەرم و حەیای لایە، کە تۆ وەکو کیژێك لەلاتە و هەستی پێدەکەی. مەبەستم ئەمەیە کە – تکایە بمبورە کە ئەم نموونە قورسەم هێنایەوە– بێگومان تۆ حەز ناکەی ولەبەر چاوی خەڵکی جلەکانت داناکەنی. جا خەڵکی هەژاریش بە هەمان شێوە، حەز ناکات کەس خۆی لە کاروباری هەڵقورتێنێ و بزانێ چۆن دەژی. بۆیە نەدەبوو ڤارینکا گیان جاری پێشوو سووکایەتی بە من بکرێ و لایەنی ناحەزانی من بگیرێ کە پەلاماری غروورو شەرەفی من، کە پیاوێکی ئابڕوومەندم، بدرێ.

ئەمڕۆکە لە دایەرە دانیشتبووم، زۆر پەست و شڵەژاو بووم، هەستم دەکرد زۆر بچووکم، میناکی ژیژێك چووبوومە قاوغەکەی خۆم، یا وەکو چۆلەکەیەکی پەڕوپۆ کراو هەڵکورما بووم.

**شەرم** لە بنی پێمەوە تا تەوقی سەرم تێم ئاڵا بوو، لە گیانی خۆم بێزار بووم ڤارینکا گیان. ئاخر چۆن پیاو شەرم ناکات و ناپەشۆکێ کە ببینێ ئانیشکی لە قۆڵی دڕاوی چاکەتەکەیەوە هاتووەتە دەرێ و دوگمەو قۆپچەی چاکەتەکەی بە ئاستەم بە داوێکەوە بەندەو تەکەتەکێتی؟

ئەمرۆ هەموو شتێکم هەر پەشێوو پەرێشان بوو، سەرمێزەکەم قەرەباڵغو پەشێو بوو، دەتگوت بە ئانقەست وای لێکراوە، پیاو لەو حاڵەتانەدا دەپەشۆکێو ورە بە دەدا.

ئیدی چ بکەم؟.. ئەوجا ستیڤان کارلوڤیچ بەخۆی **گەوتە** قسان دەربارەی کارەکەم، هەر گوتیو گوتیەوە، تا لە ئەنجامدا بەسەرسامی هاوارێکی کرد: "ئاە، ماکار ئالکسیوڤیچ، پیرەمێردی بەلەنگاز!...

" ئیدی پاشماوەی قسەکەی قووت دایەوە، تەواوی نەکرد، بەڵام من یەکسەر تێ گەییشتم، بە جۆرێ تەریق بوومەوە کە سەرە کەچەڵەکەشم سوور هەڵگەڕا، ئەگەرچی پێدەچوو ئەم هاواری سەرسامیە هیچ نەبێو شتێکی رەوتەنی بێ، بەڵام بە هەرحاڵ نیگەرانی کردم. خستمیە گێژاوی بیرکردنەوەیەکی بێ بنەوە.

تۆ بڵێی لە دایەرەدا بە واریقاتەکەیان زانیبێ؟

**خودایا** دەغیل، ئەگەر پێ بزانن چی بکەم؟ لێتی ناشارمەوە گومانم لە یەکێکە، ئەم خوانەناسو ئەشقیاو ملهوڕانە سۆزو بەزەییان لە دڵدا نیە!، خەبەرم لێدەدەن، ئاشکرام دەکەن، هەموو نهێنییەکانی ژیانم بە پولێک دەفرۆشن.. هیچ شتێك لای ئەوان رێزو حورمەتو بایەخی نیە.

ئێستا دەزانم کێ لێی کردووم بە قاو.

بەڵێ، کاری راتازاییفە. بەڵێ، کارمەندێکی دایەرەی ئێمە دەناسێت، دیارە بەدەم قسانەوەو بە شێوەیەکی رەوتەنی شتەکەی بۆ گێڕاوەتەوەو پێم وایە ئەویش لە خۆیەوە هەندێ شتی تری پێوەناوەو لقوپۆپی زیادەی لێناوە. یان ئەویش لە دایەرەکەی خۆی گێڕاویەتیەوەو ئیدی

دەنگۆکـــە لـــە وێنـــدەرەوە پەرپوەتـــەوە بـــۆ دایەرەکـــەی خۆمـــان و بڵاوبووەتەوە..

هەر هەموو خەڵکی خانووەکەمان بە وردو درشتی ئەو چیرۆکەیان زانیوە، و پەنجە بۆ پەنجەرەکەی تۆ رادەکێشن، دوێنێ کە هـاتبووم شـێو دەگـەڵ ئێـوەدا بکـەم، هـەموو سـەریان لـە پەنجەرەکانیانـەوە هێنـابووە دەرێ، خـاوەن خانووەکـە گوتبـووی شـەیتانێك دەوروخـونی منـداڵێکی بێگـەرد دەدات، پاشان جنێوێکی ناشیرینی بە تۆ دابوو.

بەڵام هـەر هـەموو ئەمانـە لـە چـاو نیـازی نامەردانـەی راتـازاییف دا هـیچ نییـە، کـە بـە تەمایـە مـن و تـۆ بخاتـە نـاو چـیرۆك و ئەدەبیاتـەوەو تەوسـنامەیەکی باشمـان دەربـارە بهۆنێتـەوە، بـە خـۆی ئەمـەی بـە مـن گوتووە، و هەندێ لە هاوماڵە شەریفەکانیشـم پێیـان گوتـووم. کـە ئەمـەم بیست چاوم پەرپنە تەوقی سەرم، مێشکم تێکچوو، نازانم چـی بڵـێم و چـی بکـەم. پێویسـت ناکـات ئـەو لـە خـۆ بشـارینەوە کـە ئێمـە بـە هەڵـەو گوناحەکانمان خوامان تووڕە کردووە ئەی فریشتە چکۆڵەکەم!

پێشنیازت کردبوو کتێبێکم بۆ بنێری، تـا خـۆمی پێـوە سـەرگەرم بکـەمو بێتاقەت نەبم. پیف لەم کتێبە! دوای کتێـب ببڕێتـەوە! کتێبم نـاوێ، لـە کتێبان بێزار بووم!

هیچـی هـیچ نیـە، هـیچ نـرخ و بایـەخێکیان نیـە.. بـڕیتین لـە کۆمەڵـە چیرۆکێکی ناماقول، کۆمەڵێك ئەفسانەی ناواقیعی!

رۆمان کۆمەڵە قسەیەکی تـڕو تووڕەهاتـە، کـە نووسـەرەکان لـەبێ کاریـدا نووسیویانەو مەگەر هەر خەڵکی بێ ئیش و کار بیانخوێنێتـەوە! بـاوەڕ بـە قسەکانم بکە ڤارینکا گیان، ئەم قسانەم لە ئەزموونەوەیـە! ئـەزموونێکی

دووروودرێژ! ئەگەر هاتوو باسی شەکسپیریشیان بۆ کردی باوەڕ مەکە! — وا دیارە لە ئەدەبیات دا کەسێك بەو ناوەوە هەیە— دڵنیابە کە شەکسپیریش هیچ نەبووە، ئەویش لە تورەهات تورەهاتتری نووسیوە! هەر هەموو ئەو درۆو دەلەسانە لە کتێباندا کۆکراوەتەوە، بۆ گاڵتە کردن و تەوس کردن بەم و بەو، بە خەڵکی.

*دڵسۆزت*

*ماکار دیوشکین*

**

رێزدار ماکار ئالکسیوڤیچ-ی ئازیز: ٨/٢

نیگەرانی هیچ شتێك **مەبە**، بە پشتیوانی خودا هەموو شتێك دێتەوە تایمی خۆی.

فیدورا دنیایەك کاری بۆ هەردووکمان، بۆ خۆم و خۆی گرتووە، زۆر چالاکانە دەستمان بەکار کردووە.

لەوەیە بتوانین هەموو کێشەو کۆسپەکان تەخت بکەین، فیدورا پێی وایە کە ئانافیودورڤنا سووسەیەکی ئەم وەزع و حاڵە نالەبارەی ئەم دواییەی ئێمەی کردبێ.

بەڵام من ئێستا ئەمەم بەلاوە گرینگ نیە.

هەستدەکەم ئەمڕۆکە دڵم خۆشە. گوایە بە تەمای پارە قەرز **بکەی**! کاری وا نەکەی ئامان! چونکە قەرز دانەوەی دەوێ، هەنگێ تووشی گێچەڵ و سەریەشە دەبی. باشتر وایە لە جیاتی ئەوە زیاتر لە ئێمە نزیکە ببیتەوە، زوو زوو سەرمان بدەی. گوێ بە قسەو قسەلۆکی خاوەن خانووەکە مەدە. دەربارەی ناحەزان و بەدخواکانی دیکەت، من دڵنیام کە خۆت بە گومانی نابەجێ سپاردووە، وبە خوت و خۆڕایی خۆت ئازار دەدەی ماکار ئالکسیوڤیچ! ئاگاداری خۆت بە! جاری پێشووش پێم گوتیت کە قسەکانت نیگەرانی و پەریشانیەکی زۆریان پێوە دیارە، جارێ خودا حافیز، ئەمڕۆ چاوەڕوانتم. دەبێ **هەر** بێی.

*دڵسۆزت*

ف. د

*فریشته ژیکه‌له‌که‌م فرفارا ئالکسیوفنا* *٨/٣*

زۆرم پەلەیە، چاوەکەم، روناکی ژیانم، پێت رابگەیەنم کە هەندێ هیواو ئومێدی تازەم لەلا پەیدا بووە. بۆت نووسیوم فریشتە چکۆلەکەم، کە نابێ قەرز بکەم.

**بەڵام** کۆترەکەم من ئێستا ناتوانم بەبێ قەرز هەڵبکەم، ژیانم بەڕێوە بەرم، من حاڵم زۆر باش نیە، حاڵم خراپە، خۆ ئەگەر خودا نەخواستە لە پڕێکا تۆ شتێکی خراپت بەسەر هات، کە دوور نیە، هەنگێ من چی بکەم؟

مەبەستم ئەوەیە کە تۆ کەسێکی بێ جورمو لەڕو لاوازی، بۆیە بۆم نووسیوی دەبێ قەرز بکەمو هیچ چارێکی دیکەم نیەو دەبێ بەردەوام بم لەسەر هەوڵی قەرز کردن.

ڤرڤارا ئالکسیوڤنا، من لە دایەرەدا، رێك لە مێزەکەی تەنیشت ئیمیلین ئیڤانوڤیچ دا دادەنیشم، ئەمە ئەو ئیمیلینە نیە کە تۆ دەیناسیت، ئەمە یەکێکی دیە، وەکو من کارمەندە، ئەوو من کۆنترین دوو کارمەندی هەموو دایەرەکەین.

ئێمە کۆڵەکەی دایەرەکەین. **پیاولکی** باشە، کەم دووە، دوورەپەرێزو گۆشەگیرە. بەڵام کارامەو ئەهلی کارو کاسبیە، دەستو خەتێکی ئینگلیزی زۆر جوانی هەیە !

پیاو هەق بڵێ دەستو خەتی ئەم پیاوە لە رووی جوانیەوە هاوتای دەستو خەتی منە. تاکو ئێستا پەیوەندیەکی ئەوتۆمان لە نێواندا نەبووە، لە سڵاوو خودا حافیزی تێ نەپەڕیوە، ئەگەر هەندێجار پێویستم بە قەڵەمتەراش ببێ دەچمە جەم ئەو: "بێ زەحمەت قەڵەمتەڕاشەکەتم بدەیە ئیمیلین ئیڤانوڤیتچ".. بە کورتیەکەی پەیوەندیمان، لە چوار چێوەی دایەرەدا، پەیوەندی کارەو هیچی تر.

ئەمڕۆکە، لای بەیانی کوتوپڕ لێی پرسیم: "ماکار ئالکسیوفیتچ چیتە، ئەم رۆژانە بیرو حەواست پەرتە؟" زانیم کە نیازی خراپ نیە، بۆیە پێم گوت: "وەڵڵا ئیمیلین ئیڤانوڤیتچ، حاڵ لەمە حیکایەت لەوەیە.

" ملبەتە هەموو شتێکم بۆ نەگێڕایەوە. من هیچ کاتێک هەموو شتێك ناگێڕمەوە، چونکە دەترسمو زات ناکەم. تەنیا هەندێ شتی لاوەکیم بۆ گێڕایەوەو پێم گوت بێ پارەمو... هتد، گوتی: "کە حاڵت وایە قەرز بکە، بچۆ بۆ لای پیوتەر پتروفیچ، کابرایەکە قەرز بە قازانج دەدا.

من بە خۆم قەرزم لێکردووە، قازانجەکەشی زۆر نیە، پێت دەدرێتەوە".

ڤارینکا گیان کە گوێم لەو قسانە بوو دڵم داخورپا. لە دڵی خۆدا گوتم، بەڵکو رەحمی خوا بکەوێتە دڵی ئەم پیاو چاکەکارە، دڵی ئەم پیوتەر پتروفیتچ-ـە نەرم ببێتو قەرزێکیش بە من بدات.

ئیدی کەوتمە حیسابی ئەوەی کە چۆن دەتوانم قەرزی خاوەن خانووەکە بدەمەوە، کۆمەکێکی تۆ بکەم، وچۆن دەتوانم کەمێك خۆم پۆشتەو پەرداخ بکەمەوە.

بڕاستی جلکەکانی ئێستام رووی ناو مەجلیسیان نیە.

و لە دایەرەدا زۆر بە خۆما دەشكێمەوە، ئەمە جگە لە پێكەنین و تەشەری خەڵكانی بەدخوا كە خوا خوای بیانوویەكیانە تا بە خەڵكی پێ بكەنن و رابوێرن. ئەمانە هەر نەیسە، دەتوانم گوێیان نەدەمێ. بەڵام لەوەیە حەزرەتی بەرپرس، سەرۆك، هەندێجار بەلامانا تێپەڕێ، كە ئەمە لەگینە، جا خوا نەخواستە ئەمە رووی داو حەزرەت بەم جلوبەرگەوە بمدینێ، قوڕی كوێ بەسەری خۆدا بكەم، چونكە حەزرەت پاكو خاوێنی و جلوبەرگو قیافەی رێك و پێكی لە هەموو شتێ بەلاوە گرینگترە.

رەنگە هیچ نەڵێت، بەڵام من لە شەرما دەبم بە قەترەیەك ئاو، ئیدی ئەمە وەزع و حاڵی منە. بۆیە زاتم وەبەرخۆ ناو شەرم و شورەییم خستە گیرفانە دڕاوەكەمەوەو لێبڕام بڕۆم پیوتەر پتروڤیتچ ببینم، لە هەمان كاتدا هەم بە ئومێد بووم، هەم نیگەران، بەڵام ڤارینكا گیان ئاواتەكەم نەهاتە دی! ریسەكەم بووەوە بە خوری! لەو كاتەدا مژول بوو، دەگەڵ فیدوسی ئیڤانوڤیچ دا قسەی دەكرد.

لەلایەكەوە لێی چوومە پێشەوە، قۆڵی چاكەتەكەیم راكێشاو گوتم: "پیوتەر پتروڤیچ، پیوتەر پتروڤیچ!" ئاوڕی دایەوەو نیگای كردم، منیش كەوتمە باسی ئەوەی كە زۆرم پێویست بە بڕی سی رۆبڵە. هەوەڵجار لە مەبەستم حاڵی نەبوو، جارێكی ترو لە نووكەوە شتەكەم بۆ گێڕایەوە، تەنیا خەندەیەكی كردو هیچی تری نەگوت.

داواكاریەكەم لێی دووبارە كردەوە، هەنگێ گوتی: "هیچ بارمتەیەكت هەیە؟" ئەوسا گەڕایەوە سەر كاغەزەكانی بەردەستی و هەر نووسی و نووسی، بێ ئەوەی تاقە نیگایەكی من بكات. پەشۆكام، زمانم چووە كلیلە، پاشان گوتم:

"نەخێر جەنابی پیوتەر پترۆڤیچ، هیچ بارمتەیەکم نیە.

" بۆم روون کردەوە هەر کاتێ مووچەکەمم وەرگرت، **یەکسەر** قەرزەکەی دەدەمەوەو، بۆ یەك سات دوای ناخەمو ئەوە بە ئەرکی پیرۆز دەزانم. لەو ساتەدا کەسێك بانگی کرد، رۆیی بۆ لای. چاوەڕێم کرد، کە هاتەوە کەوتە دادانی قەڵەمەکەی، دیار بوو حەواسی لای من نیە. دیسان هەڵمدایەو گوتم: "پیوتەر پترۆفیچ، هیچ چارێك نیە؟ هیچ تەگبیرێك ناکرێ؟

" هیچی نەگوت، وای دەنواند کە گوێی لە من نیە.

ماوەیەکی دیکەش **بە** دیاریەوە وەستام. بڕیارم دا، دوا هەوڵی خۆم بدەم، جارێکی دی چمکی قۆڵی چاکەتەکەیم راکێشا، مینگە مینگێکی کرد کە هیچی لێ حاڵی نەبووم. دادانی قەڵەمەکەی تەواو کردو کەوتەوە نووسین، منیش بەجێم هێشت و وەدەرکەوتم. دەبینی دایکەلێ!

رەنگە ئەمانە خەڵکی بەرێز و شایستە بن، **بەڵام** یەجگار خۆپەسندو قۆرەدەماخن، بەڵام ئێمە هەقمان چیە؟ بۆچی بیری خۆمان بەوانەوە مژوڵ بکەین، ڤارینکا گیان؟ ئێمە لە چاو ئەواندا خەڵکی بچووکین.

هەر لەبەر ئەمەش ئەم هەموو شتەم بۆ نووسیوی.

کە شتەکەم بۆ ئیمیلین ئیڤانوفیچ گێڕایەوە سەری باداو پێکەنی. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا تۆزقاڵە هیوایەکی پێ بەخشیم. ئەم ئیمیلین ئیڤانوڤیچە پیاوێکی باشە، پیاوێکی پیاوانەیە. بەڵێنی داومەتێ کەسێکی ترم پێ بناسێنێ.

**ئەم** پیاوەی تر ڤارینکا، لە گەڕەکی ڤیبورگ دادەنیشێت و ئەویش قەرز بە سووت و قازانج دەدات. کارمەندێکی بچووکی پلە چواردەیە.

ئیمیلین ئیڤانوفیچ دەڵێت ئەو پیاوە قەرزم دەداتێ. سبەینێ دەچم بۆ لای، تۆ چ دڵێی فریشتە چکۆلەکەم؟ هەقی خۆم نیە؟ خۆ ئەگەر قەرز نەکەم سەریشەو کێشەیەکی زۆرم بۆ دروست دەبێت. خاوەن خانووەکە لێم بێزار بووەو دەرم دەکات، چیتر شێوو فراڤینم ناداتێ. باسی پێڵاوەکانم هەر مەکە دایکەلێ! چاکەتەکەم دوگمەی پێوە نەماوە... پێویستم بە هەموو شتێکە! ئاخر ئەگەر یەکێك لە بەرپرسەکان بەو شڕیو شپرێویە بمدێنێ چی دەڵێ؟ بێگومان تووشی کێشە دەبم ڤارینکا، ئەوە بۆ خۆی کارەساتێکە لەو گوڕە، بەڕاستی کارەساتە.

*ماکار دیوفشکین*

**

بيكه به خاترى خوا، تا زووه پارەيەك قەرز بكە.

هەرگيز به تەماى **ئەوە** نەبووم لەم بارودۆخە نالەبارەدا داواى يارمەتى و كۆمەك له تۆ بكەم. بەلام تۆ نازانى گيرۆدەى چ وەزع و حلێك بووم!

مەحالە بتوانين چيتر لەم ملە وەمێنين، شتێكى زۆر خراپم بۆ پێشهاتووه، تەسەور ناكەى حالى حازر چەند پەريشان و نيگەران و پەشێوم!

تەسەور بكە هاوڕێم، ئەم بەيانيه كابرايەكى **بێگانه**، نەناس، پياوێكى بە تەمەن، بگرە پير، كۆمەڵێك ميدالْ و نيشانانى بە بەرۆكەوه بوو، هاتە ديدەنيمان، هاتنەكەيم يەجگار بەلاوه سەير بوو، نەمدەزانى دەبێ ئەم كابرايە چ كارێكى بە ئێمە هەبێ.

فيدورا، لەو كاتەدا بۆ شت كڕين چوو بووه دەرێ، ئيدى كابرا گەنم گەردى بە دەمرێژى پرسياران دايگرتمەوه:

چۆنم، چۆن دەژيم، چ كارێك دەكەم، ئەمجا بێ ئەوەى چاوەڕوانى وەلامى **من** بێ، پێى گوتم مامى ئەو ئەفسەرەيە، وزۆر لەو رەفتارەى بێزارە كە بەرانبەر بە من كردوويەتى و لەلاى دەرودراوسێكان ناوى زڕاندووم، پاشان گوتى برازايەكەى كەسێكى هەرزەو ئەقلْ منالانەو لە خۆباييه، ئەوجا گوتى حەز دەكات بمخاتە ژێر بالى خۆى و ئامۆژگارى كردم كە گوێ بە قسەكانى ئەو خوێريە هەرزەيە نەدەم، وگوتى وەكو باوكێك دلى بۆ من دەسووتێ و هەستێكى باوكانەى بەرانبەر بە من هەيەو ئامادەيه له هەموو شتێكدا يارمەتيم بدات.

دەموچاوم سوور هەڵگەڕاو تیا مابووم کە چ وەڵامێکی بدەمەوە، کاتێکم زانی بە تۆبزی دەستی **گرتم**، دەستی بە گۆناکانمدا هێناو گوتی کە کیژێکی جوانم، و ئەو دوو چاڵەی سەر رووومەتەکانم چەند لێ دێن (مەگەر هەر خوا بزانێ چی تری گوت!) لە ئەنجامدا ویستی ماچم بکات، بەو بیانووەی کە پیرەمێرێکی بێ وەیە (کە بنیادەمێکی قێزەون بوو!) لەم ساتەدا فیدورا وەژوورکەوت. بە هاتنەوەی فیدورا کەمێك پەشۆکاو ئەوجا دووپاتی کردەوە کە لەبەر نەجابەتو پاکیم لە رەفتاردا، رێزی زۆرم دەگرێتو هیواداره **متمانەی** پێ بکەمو لێی نەترسمو دەستی خۆشەویستی ئەو رەت نەکەمەوە.

ئەوجا فیدورای بردە سوچێکەوە وهەوڵی دا بە بیانووی سەیر سەیرەوە بڕێك پارەی بداتێ. هەڵبەتە فیدورا ئەو پارەیەی لێ وەرنەگرت.

کابرا ئەنجام کابرا بەر لەوەی بڕوات، قسەکانی دووبارە کردەوەو بەڵێنی دا کە جارێکی دیکەش سەر بداتەوەو جووتێ گوارەم بۆ بێنێ (پێدەچوو شپرزە بووبێ)و ئامۆژگاری کردم کە بۆ ئاپارتمانێکی دیکە بگوازمەوە، و ناونیشانی خانوویەکی بۆ هەڵدام دەیگوت خانوویەکی زۆر چاکەو دەتوانێ بە نیمچە بەلاشێك بۆم بگرێ.

گوتی بۆیە منی **خۆش** دەوێ چونکە کیژێکی ئابڕومەندی پاکڕەوشتم، وئامۆژگاری کردم کە خۆ لە لاوانی هەڵەو هەرزەو بەدناکار دوور بگرم. لە کۆتاییدا گوتی فیدورڤنا دەناسێتو لەسەر راسپاردەی ئەو هاتووەتە دیدەنیمو بە خۆیشی بەو زووانە سەری دەدات. هەنگێ هەموو شتێکم بۆ روون بووەوە. زۆر تورە بووم، وەکو شێتو هارم لێهات. یەکەمجارم بوو

تووشی ئەو حاڵەتە ببم. لە تووڕەییدا ئاگام لە خۆم نەما بوو. بە تووڕەیی بە ڕوویا هەڵشاخیم، بە تەواوەتی تەریقم کردەوە.

فیدوراش لەو دەمەدا بە هانامەوە هات. ئیدی بە دوو قۆڵی بە نیمچە دەرکردنێك لە ماڵەکە وەدەرم نا. ئیدی هەردووکمان قەناعەتمان کرد کە ئەمە ئۆینی فیدورۆڤنایە، دەنا ئەو لە کوێ ئێمە دەناسێت!.

جا ئێستا ماکار ئالکسیوڤیچ، تکات لێدەکەم فریامان بکەوە، یارمەتیمان بدە. تۆبی توخوا بەم حاڵەوە بە تەنیا جێمان مەهێڵە! شتێك پارە، با کەمیش بێ قەرز بکە، چونکە ئێمە پارەی گواستنەوەمان نیە، مەحاڵیشە چیتر لەم ئاپارتمانەدا هەڵبکەین.

فیدوراش هەمان بۆچوونی هەیە.

بەلای کەمەوە بیست و پێنج ڕۆبڵمان پێویستە. هەــن ئەو پارەیەت دەدەمەوە، کار دەکەم و ئەو پارەیە دەردێنم.

فیدورا لەم چەند ڕۆژەدا کاری زیاتر دەگرێ، خەمی زۆری قازانج و سووتی قەرزەکەت نەبێ، ئێمە دەتوانین بیدەینەوە، هەموو مەرجێك قەبوڵ بکە. من ئەم پارەیەت بۆ دەگێڕمەوە، تۆبی ئەو خوایە فریامان بکەوە، پشتمان تێ مەکە.

زۆرم لەبەر گرانە کە لەم هەلومەرجەدا، لەم تەنگانەیەدا کە خۆت تێی کەوتووی، زەحمەتت دەدەم. بەڵام تۆ تاقە هیوامی، لە تۆ زیاتر کەس شك نابەم. بە دوعا ماکار ئالکسیوڤیچ، بیرێك لە حاڵم بکەوە، فریام بکەوە، خودا سەرکەوتووت بکات و پاداشتت بداتەوە!.

***کۆترەکەم، ڤرڤارا ئالکسیوڤنا*** ***٨/٤***

ئەم جەزرەبە چاوەڕوان نەکراوانە، بەڕاستی وردو خاشیان کردووم!
ئەم نسیبەتو بەڵا ترسناکانە دڵو روحیان وێران **کردووم**! ئەم مێملانە، ئەم هەرزە پیرانەی کە شەرم لە سەری سپی خۆ ناکەن، هەر تۆ خەمبارو دڵتەنگ ناکەن، ئەی فریشتە قشتیلەکەم، بەڵکو منیش بەداخو کەسەرەوە دەکوژن، دیقی مەرگم پێ دەکەن، بە تەواوەتی دەمفەوتێنن.
جا ئەو مێملانە بە ئاواتی خۆ دەگەن، دڵنیات دەکەم بە مرازی خۆ دەگەن! تۆ بە خۆت دەزانی **من** مردنی خۆمم پێ خۆشترە لەوەی کە نەتوانم وەکو پێویست یارمەتی تۆ بدەم! ئەگەر نەتوانم بە هاناتەوە بێم، فریات
بکەوم، ئەمە بۆ من هاوتای مردنە ڤارینکا گیان، مردنی تەواوەتی، مردنی راستەقینە. خۆ ئەگەر یارمەتیشت بدەم، هەنگێ، باڵندە چکۆلەکەم، لە شەقەی باڵ دەدەیو دەڕۆی بۆ دوور، وەکو باڵندەیەك کە بایەقوشو سیسارکە کەچەڵان گەمارۆیان دابێو بە نیازی خواردنی بن، دەفڕیو هێلانە چکۆلەکەت بەجێدێڵی. ئەمەم زۆر لەلا ئەستەمە دایکەلێ، ئاخ **ڤارینکا**، تۆش بێ رەحمی، ئەم بێ رەحمیەت لەپای چی؟
ئەمە چ ئەقڵێکە بۆ تۆ؟
چەوساندوویانیتەوە، سووکایەتیان پێکردووی، سەربارەی ئەوەش، باڵندە چکۆلەکەم، خەفەت دەخۆیو گلەیی لە خۆت دەکەی کە گوایە، زەحمەتی من دەدەی. پاشان بەڵێن دەدەی کە ئەوەندە کار بکەی تا

قـەرزەکان بدەیتـەوە، دیـارە ئـەم بڕیـارە، بـەو جەسـتە بـێ جـورمو لاوازەتەوە، بەو لەش بەباریەتـەوە، هـەر بـۆ ئـەوەی قـەرزەکان لـە کـاتی خۆیدا بدەیتەوە، وەکو ئەوەیە بە کردەوە خۆت بکوژی.

ڤارینکا گیان تۆ هیچ بیرت لەو قسانەی خۆت کردووەتەوە؟

**بۆچی** دەبێ خۆت بە دیار تەقەڵو درومانـەوە پـیر بکـەی، خـۆت مانـدوو بکەی، روحی خۆت بەو شتانەوە عەزاب بدەی، و چاوە جوانەکانت ماندوو بکەیت، و هێندەی دی خۆت نەخۆش بخەی؟

ڤارینکا گیان، تەمەشا کۆترەکەم، راستە من بە کەڵکی هـیچ نایـەم، **بەلام** بە هەرحاڵ، هەوڵ دەدەم شتێکت بۆ بکەم! هەموو ئەم کۆسـپو کێشـانە تـەخت دەکـەم، دوای دەوام کـارێکی دی دەگـرم، کتێـب بـۆ نووسـەران دەنووسمـەوە، بـە خـۆم دەچـمە لایـان، ناچـاریان دەکـەم کـارم بـدەنێ، ئەوانیش پێویستیان بە خەڵکانی دەسـتوخەت خۆشـە کـە بەرهەمـەکانیان بۆ بنووسێتەوە.

بەلام نایەڵم تۆ خۆت بکوژی، هەرگیز رازی نـابم ئـەم پرۆژەیـەت جێبـەجێ بکەی، ئەگەر مردووم ئەو پارەیە قـەرز دەکـەم **فریشتە** چـکۆلەکەم. بـۆت نووسیووم کە گوێ بـە زۆری سـووتەکە نـەدەمو قەرزەکـە بکـەم. نـا، مـن گوێ بە زۆری سووتەکە نادەم قشتیلەکەم، ئێستا لە هیچ ناترسم، باکم لە هیچ نیە، داوای چل دانە رۆبڵی ئەسـکەناس دەکـەم، ئەمـە پارەیـەکی زۆر نیە ڤارینکا گیان، وا نیە؟ تۆ چ دەڵێی؟ پێت وایە بەو ئاسانیە چـل رۆبڵـم بە قەرز بدەنێ؟ بڵێی هەر وا زوو بە زوو متمانەم پێبکەن؟ ئاخۆ دەتـوانم، مەبەستم ئەوەیە تۆ پێت وایە دەتوانم بەم قەدو قەلافەتو جـلو بەرگـەوە متمانەیان بە دەست بێنم؟

ئایا ئەوەی بەم شێوەو دیمەنەوە بمدیێنێ، خۆشی پێما دێت؟ بۆراستی کە ئەو پرسیارە لە خۆ دەکەم، جۆرە ترسێکم لێدەنیشێت، پیاو راست بڵێ هەست بە جۆرە ترسێکی نەخۆشانە دەکەم!

جا لەم چل رۆبڵە بیست و پێنج دانەی بۆ تۆ دادەنێم **ڤارینکا گیان**، ئەوجا دوو رۆبڵی زیویشی لێدەدەم بە خاوەن خانووەکە. باقیەکەشی بۆ خۆم، بۆ پێویستییەکانی خۆم خەرج دەکەم. هەڵبەتە هەقە، وبگرە زەروریشە زیاتر بە خاوەن خانووەکە بدەم، بەڵام تۆ خۆت حیساب بکە، دایکەڵێ، حیسابی هەموو پێویستییە کانی من بکە، ئەوجا دەزانی مەحاڵە بتوانم لە دوو رۆبڵی زیو، پتری بدەمێ.

هەر ماقولیش نیە ئەمە بکەم، باشتر وایە باسی نەکەین. جووتێ پێڵاو بە رۆبڵێکی زیو دەکڕم، هەر ناکرێ من سبەینێ بەم پێڵاوە شڕانەوە بۆ دایەرە بچم، لەوەیە هەر بەرگەش نەگرن. پێویستم بە بۆینباخێکیشە، یەك ساڵی ڕەبەقە ئەم بۆینباخەم لە ملە، کۆنی کۆن بووە، بەڵام چونکە تۆ بەڵێنت داومەتێ لە بەر کۆشەکەی خۆت نەك بۆینباخێك بەڵکو ئێلەکێکیشم بۆ دروست بکەی، ئیدی پێویست بەوە ناکات بیر لە کڕینی بۆینباخی تازە بکەمەوە.

بەم حیسابە دەبم بە خاوەنی جووتێ پێڵاوی نوێو بۆینباخێکی تازە. ئێستا با بێینە سەر مەسەلەی دوگمەکان ئازیزەکەم، پێم وایە تۆش **لەگەڵ** مندابی کە بنیادەم ناتوانێ جلی بێ دوگمە لەبەر بکات. پتر لە نیوەی دوگمەی جلەکانم کەوتوون! کە بیر لەوە دەکەمەوە ئەگەر حەزرەتی سەرۆك بەم جلانەوە بمدینێ، دەبێ چ بڵێ!

لەرزم لێدێ. هەرچەندە من گوێم لە قسەکانی نابێت، چونکە لەم حاڵەتەدا من دەمرم، بەڵێ یەکسەر دەمرم، لە شەرمو شەرمەزاریدا دەمرم!

ئاە ڤارینیا **گیان**! دوای هەموو ئەم مەسرەفانە، سێ ڕۆبڵم بۆ دەمێنێتەوە، ئەم سێ ڕۆبڵەش خەرجی پێویستییەکانی ترم دەکەمو نیو کیلۆ تووتنیشی لێدەکڕم، چونکە فریشتە قشتیلەکەم من بەبێ جگەرەکێشان هەڵناکەم،و ئەوە تۆ ڕۆژی تەواوە بۆ تاقە جارێك سەبیلم لە زار نەناوە.

خۆ دەمتوانی، بێ ئەوەی بە تۆ بڵێم توتن بکڕم، **بەڵام** هەنگێ هەستم بە گوناح دەکرد. یانی تۆ بەم کوێرەوەرییە بژیتو ئەم هەموو ڕەنجە بدەیت،وخۆت لە هەموو شتێك مەحروم بکەیتو من بچم زیادە مەسرەف بکەم؟

بۆیە ئەمەم پێگوتیت تا گیرۆدەی عەزابی ویژدان نەبم. جا ڤارینکا گیان با ڕێكو ڕاست پێت بڵێم کە ئێستا لە وەزعو حاڵێکی زۆر خراپدام، بە عەمراتم وەزعوحاڵی واخراپم بە خۆوە نەدیتووە.

خاوەن **خانووەکە** دەمبوغزێنێ، کەس ڕێزم ناگرێ. لەو پەڕی دەستکورتی دام، قەرزارم، هەر قەرزو قەرز. وەزعو حاڵم لە دایەرە- هەرچەندە لەوە پێشیش فەرشی سووریان بۆ ڕانەدەخستم- زۆر خراپتر بووە ڤارینکا گیان.

نامەوێ کەس بمدینێ، خۆم دوور دەگرم، بەدزییەوە دەچم بۆ دایەرە، لە هەموو کەسێك سڵ دەکەمەوە. تۆ تاقە کەسی کە دەتوانمو دەوێرم ئەم شتانەت بۆ باس بکەم... باشە ئەگەر ئەم قەرزەیان نەدامێ چ بکەم؟ نا..

نا.. باشتر وایە ڤارینکا گیان بیر لەمە نەکەمەوەو بەم بیرانە ورەی خۆم نەڕوخێنم. بۆیەش ئەم نامەیەت بۆ دەنووسم تا بیر لەمە نەکەیتەوەو بەو جۆرە بیرانە خۆت عەزاب نەدەی.

خودایا، خودایا! لەو حاڵەدا چمان بەسەر دێ؟ ئەگەر ئەو قەرزەم نەدەنێ چمان بەسەر دێت؟ ڕاستە تۆ ناتوانی لەو ئاپارتمانە بگوازیتەوە، لە منەوە نزیك دەبیت... بەلام.. نا.. ئەگەر لە هەوڵەکەمدا ناکام ببم ئیدی ناتوانم تەنانەت بۆ ماڵەکەی خۆیشم بگەڕێمەوە.

لە شوێنێکدا خۆم دەفەوتێنم، دەمرم. ئاه درێژەم بە نامەکەم دا. دەبێ بچم تەراش بکەم. پیاو تەراش بکات باشترە، بەشەخسیەت تر دەنوێنێ، خودا پشتو پەنامان بێ! نوێژێ دەکەمو دەکەومە ڕێ.

م. دیوڤشکین

*مێژا. ماکار ئالکسیوڤیچی هەرە ئازیز!* *٨/٥*

**خۆزگە** بەو شێوەیە ملت بۆ نائومێدی نەدەدا !
بەو جۆرە خۆت ئەزیەت نەدەدا، یانی کوێرەوەریو بەد بەختییەکەی خۆمان بەس نیە، تا ئەم عەزابەش لە خۆت باریکەی؟ سی رۆبڵی زیوت بۆ دەنێرم، لەوە پترم لە تواناداد نیە.
شتە هەرە پێویستەکانی خۆتی پێ بکڕە. **بەڵکو** بتوانی خۆت بگەیەنیتە سبەینێ. تەقریبەن هیچ شتێك بۆ خۆمان نەماوەتەوە،و نازانم سبەینێ چی دەبێت.. بەڕاستی وەزعێکی خەمناکە ماکار ئالکسیوڤیچ! بەلام تۆ خەم مەخۆ، پێویست بەم هەموو خەمە ناکات: کە قەرزت دەست نەکەوتووە، گرینگ نیەو ئیدی ئەوە وەزعەکەیە، چار چیە.
فیدورا دەڵێت ئەمە کارەساتو لێقەومانی تەواو نیە، دەڵێت دەتوانین جارێ تا ماوەیەکی دیکەش لێرە وەمێنین، گواستنەوەش بۆ شوێنێکی دی زۆر دادمان نادات، چونکە ئەگەر بیانەوێ لە هەر شوێنی بین دەماندۆزنەوە. بەلام لەگەڵ ئەوەشدا پێم باشە لێرە بڕۆین. بەهەرحاڵ زۆر خەمبارو دڵتەنگم دەنا زیاترم لە مبارەیەوە بۆ دەنووسیت. بەڕاستی تۆ تەبیعەتێکی سەیرت هەیە ماکار ئالکسیوڤیچ!
زیاد لە پێویست **خەمی** خەڵکی هەڵدەگریت، هەر بۆیەش هەمیشە زۆر پەستو غەمگینی. لە هەموو کەسێك غەمگینتری. من هەر هەموو نامەکانت زۆر بەوردی دەخوێنمەوە، دەبینم لە هەر هەموویاندا ئەوەندەی

نیگەرانی منی، ئەوەندەی لە خەمی منداڵی، ئەوەندە لە خەمی خۆتدا نیت.

هەموو خەڵکی دەڵێن کە تۆ **پیاوێکی** چاکو دڵاوا میهرەبانی، بەڵام بە بۆ چوونی من زیاد لە پێویست میهرەبانی.

جا ڕێم بدە با دوو قسەی دۆستانەت بۆ بکەم ماکار ئالکسیوڤیچ. من سوپاسگوزاری تۆم، زۆر سوپاس بۆ هەموو ئەوکارانەی کە بۆ منت کردوون، لەمبارەیەوە یەجگار منەتباری تۆم. تۆ بە خۆت تەمەشا بکەو حوکم بدە:

من زۆرم بەلاوە ناخۆشە، دوای **ئەو** هەموو کارەساتو بەڵایانەی بەسەرت هاتوون، کە من بەبێ ویستی خۆم بوومەتە مایەی ئەوەی بەسەرت بێن، دەبینم هێشتا هەر بۆ من و لە پێناوی مندا دەژی، وەکو ئەوەی ئەم دنیایە جگە لە منو خۆشیو ناخۆشی من هیچی تری تیا نەبیت. خۆ ئەگەر مرۆڤ ئەوەندە بەخەمی خەڵکی ترەوە بێ، خۆی بکات بە مامەخەمەی هەموو کەسێك، هەرگیز شادیو خۆشی بە خۆیەوە نابینێ. ئەمڕۆ کە لە دوای دەوامەوە هاتی بۆ لای منو وەژوور کەوتی، زۆر ترسام: ڕەنگ زەرد، شپرزەو نائومێد، شڕو شەپڕێو، دیمەنێکی ترسناکت هەبوو.

هەر هەمووشی لەبەر ئەوە بوو کە دەترسایت پێم بڵێی لە هەوڵەکەتدا ڕێوی بووی، چونکە دەترسیت من **خەمبار** و نیگەران ببم.

بەڵام کاتێ کە دیتت من ئاساییمو نیگەران نیم، یەکسەر سیمات گۆڕاو گەشایتەوە ماکار ئالکسیوڤیچ! ئەوەندە خۆت ئازار مەدە ماکار ئالکسیوڤیچ، بەو ئاسانیەش مل بۆ نائومێدی مەدە، تۆزێ هۆشت بێ،

تکات لێدەکەم، لێت دەپاڕێمەوە. بەری تەنگانە کورتەو دنیا بە ئومێد خوراوە، خەمت نەبێ هەموو شتێك بەخێرو خۆشی تێدەپەڕێ. ئەگەر هەندێ گەشبین نەبی، ناتوانی بژی، و خەمی خەڵك هەرگیز بەرۆکت بەر نادات. بە دوعا **هاوڕێم**، جارێکی دی تکات لێ دەکەم ئەوەندە نیگەرانی من مەبە.

ف. د

*کۆترەکەم، ڤارینکای ئازیز* *٨/٥*

باشە، زۆر باشە! مادامێکی تۆ ئەمە بە کارەسات نازانی کە من قەرزم دەست نەکەوتووە، ئەمە زۆر باشە. بۆیە لەسەر داوای تۆ دڵم ئاسوودەیەو هیچ خەمم نیە.

تەنانەت خۆشحاڵم بەوەی کە ئیدی لێم دوور ناکەویتەوە، لەمن پیرەمێردی بێنەوا دوور ناکەویتەوە، لەمماڵەی ئێستاتدا دەمێنییەوە.

**پیاو** راست بڵێ کە هەموو ئەو قسە جوانانەم خوێندنەوە کە لە نامەکەتدا دەربارەی من نووسیبووتن،وسەیرم کرد چەند بە باشی لە هەستو سۆزو دڵسۆزی من دەرهەق بە خۆت حاڵی بووی، لە کەیف وخۆشیان لە پێستی خۆم نەدەهێوریم. بۆیە ئەمە دەڵێم چونکە خۆی لەخۆیدا بەڵگەیە کە تۆ چەند دڵسۆزی منی، چەند بە تەنگی دڵی منەوەی. زۆر چاکە، هەستو سۆزو دڵودڵسۆزی بەجێی خۆی، تۆ دایکەلێ، داوام لێدەکەی بە ورەبم، ئەوەندە دڵناسك نەبم.

بەڵێ فریشتە **قشتیلەکەم**، خۆم زۆر چاك دەزانم کە دڵناسکی شتێکی باش نیە، بەڵام تۆ خۆت داوەر بە دایکەلێ، **من** سبەینێ بۆ دایەرە چی لە پێ بکەم، بەکام پێڵاوەوە بڕۆم!؟

کێشەکە لێرەدایە ڤارینکا.

ئاخر ئەمە شتێکە پیاو دەکوژێت، بە جارێ وێرانم دەکات، لەگەڵ ئەوەشدا من خەمی خۆمم نیە، خەفەت بۆ خۆم ناخۆم. من زۆر گوێ نادەمێ، دەتوانم بەو پەڕی سەرماو سەهۆڵبەندان، بەبێ پاڵتۆ

وەدەربکەومو بێ پێڵاو هەڵبکەم، راستە زۆر زەحمەتە، ناخۆشە، بەڵام لەگەڵیا ڕادێمو هەر بەخەیاڵیشمدا نایەت. من کەسێکی ساکارو سادەم، **مرۆڤێکی** بچووکم. بەڵام خەڵکی چ دەڵێن؟ ناحەزانی من، ئەو هەموو زمانە درێژو ژەهرداارانە، کە من لە دەرەوە بەبێ پاڵتۆ ببینن چ دەڵێن؟ خۆ هەر چیەك بێ، بنیادەم لەبەر خەڵکی پاڵتۆ لەبەر دەکات، پێڵاو لە پێ دەکات. پیاو لەبەر لۆمەی خەڵکی ئەو شتانە دەکات.

واتە من، ئازیزەکەم، دایکەڵێ، روحەکەم، لەبەر لۆمەی خەڵکی، بۆ پاراستنی ئابروو ناوی خۆم پێویستم بە جووتێ پێڵاوە. باوەڕ بکە ڤارینکا بەم پێڵاوە شڕانەوە حەیاو ئابڕوم دەچێت.

باوەڕم پێ بکە **ئازیزەکەم**، من کابرایەکی پیری بە ئەزموونم، دنیاو خەڵکیو ژیانم دیوە، تاقیم کردووەتەوە. باوەڕ بە قسەکانی من بکە، نەك بەوانەی لە خۆڕا کاغەزان ڕەش دەکەنەوەو دەکەونە نوکتەبازیو پێیان دەگوترێ نووسەرو ئەدیب. ڤارینکا گیان، بۆم نەگێڕایتەوە کە دوێنێ چیم بەسەر هات.

بە راستی زۆرم ئازار چەشت، ئەو بەیانیە بە ئەندازەی یەك دانە ساڵی خشت عەزابم چەشت،و خەفەتم خوارد، هەر مەپرسە چ بەڵایەکم بەسەر هات، لە گێڕانەوە نایەت.

ئەمە حاڵو حیکایەتەکەیە: سپێدە زوو لە خەو ڕابووم، تا ئەو لە ماڵەوە بگرمو پاشان بێ ئەوەی دوابکەوم، فریای دەوامی دایەرەش بکەوم. بارانێك بوو ئەمما باران. ڕێگەو شەقامان یەکپارچە قوڕو چڵپاو بوو! پیرە پاڵتۆم لەبەر هەڵکێشاو کەوتمە ڕێگەو بە شەقامەکاندا خۆم بکێش دەکردو لەبەر خۆوە دەمگوتەوە:

"خودایا، لە گوناهم خۆش بە،ونائومێدم **مەکە**!" کە بە بەر کڵێسای "ن"دا ڕەت دەبووم، ئیشارەتێکی سەڵیبم کێشا، لە خوا پاڕامەوەو تۆبەیەکی بەهەقم کرد، لە دڵی خۆدا بیرم لەوە کردەوە کە نابێت مامڵە دەگەڵ خودا بکەم، من شایستەی ئەوە نیم خودا بدوێنم.

لە دنیای خۆمدا بووم، سەیری هیچ شتێکم نەدەکرد، ملی ڕێگەم گرتبووو بێ ئاگا بووم لەوەی بۆ کوێ دەڕۆم. شەقامەکان چۆڵوکپ بوون، ئەو تاکو تەرایانەی بە جادەو شەقامەکانەوە بوون، هەموو ماتومەنگومڕۆل، چووبوونە قاوغی خۆیانەوە.

هیچیش سەیر **نەبوو**، چونکە کێ لەم کاتەداو لەم تۆفاو بارانەدا بۆ پیاسەو گەڕان دێتە دەرێ؟ تووشی دەستەیەك کرێکاری شڕپۆشی پیسو چەپەڵ هاتم، بەدەم ڕێکردنەوە، بەر شانیان دام، ترسم لێ نیشت، دڵم داخورپا، کە خەڵکێکی زبرو ناقۆڵا بوون!

ئەوی ڕاستی بێ نەترەم بەردا، بەڕادەیەك ترسم لێ نیشت، نەمدەویست هەر بیریش لە قەرزکردن بکەمەوە.

خەریك **بووم** لە پردی (ڤاسکرۆسنسکی) دەپەڕیمەوە کە بنی تاکێك لە پێڵاوەکانم بەربوو، خەریك بوو بە تەواوەتی لە پێڵاوەکە دەبووەوە، ئیدی نازانم چۆن باقی ڕێگاکەم بڕی! ڕێك لەم کاتەدا (ئیرمولایف)م بینی، کە کارمەندێکی بچووکی دایەرەی ئێمەیە.

بەرەو من دەهات.

لەبەردەممدا وەستا، پشتی ڕاست کردەوە، نیگا پەریشانو شپرزەکانی تێبڕیم، وەك ئەوەبوو داوای تۆزێك پارەم لێ بکاتو بچێ ڤۆدگاکەی پێ بخواتەوە. لە دڵی خۆدا گوتم: "ها، هاوڕێ، ڤۆدگا؟ ئاخر لێرە لە کوێ

ڤۆدگات دەست دەکەوێ؟" یەجگار ماندوو بووم. وەستام، ساتە پشوویەکم دا،وکەوتمەوە ڕێ. لە شتێك دەگەڕام مێشکی خۆمی پێوە مژول بکەم، تا کەمێك هێور ببمەوەو بێمەوە سەرخۆ. بەڵام بیرم بە هیچ کوێ ڕانەگەیی. مەحاڵ بوو بیرم لەسەر شتێك بگیرسێتەوە. بەڕادەیەك لە قوڕو چڵپاودا هەڵکشا بووم کە شەرمم لەخۆم دەکرد. ئەنجام لە دوورەوە کوخێکی دارینی زەردم بەدی کرد، کە هەشتیو بالکۆنێکی لە پێشەوە بوو.

لە دڵی خۆدا گوتم: "خۆیەتی، هەمان ئەو ماڵە یە کە ئیمیلین ئیڤافوڤیچ بۆی وەسف کردووم، ماڵەکەی مارکۆفە." (ئەم مارکۆفە، ئەو پیاوەیە کە پارە بە سوو دەدات ڤارینکا گیان). لەو ساتەدا کەمێك گێژوکاس بووم، هەموو شتێکم بیر چووەوە.هەرچەندە دەمزانی ئەمە ماڵەکەی مارکۆفە، بەڵام بۆ ئەوەی بە تەواوەتی دڵنیابم لە دەرگاوانەکە نزیك بوومەوەو پرسیم: "سەرکار ئەمە ماڵی مارکۆفە؟" بەڵام دەرگاوانەکە کابرایەکی بێ ئەدەب بوو. زۆر بە ڕەقیو زبری وەڵامی دامەوە، دەتگوت قسە بە پارەیە، دەتگوت لە یەکێك توڕەیە، لە بن لێوانەوە گوتی: "ماڵی کێیە؟ ماڵی مارکۆفە". ئەم دەرگاوانانە چەند سەیرن، چەند توڕەو تڕۆو بێ هەستن.

جا من هەقم بە دەرگاوانەوە چییە؟

هەرچەندە هەقم بە دەرگاوانەوە نەبوو، بەڵام زۆری پەست کردم. پیاو لە هەر وەزعو حاڵێکی دەروونیدا بێ، شتێکی لەو بابەتەی دێتە ڕێ، وەهەمیشە هەر وابووە.

سێ دانە جار بە بەر ماڵەکەدا **سوڕامەوە**، جار لە جار پتر نەترەم بەردەدا، لە دڵی خۆدا گوتم: "نا، نەخێر، قەرزم ناداتێ، یەکەم من بابایەکی بێگانەمو نامناسێت، دووەم سەروسیمامی ناچێتە دڵەوە".
ئەنجام قیروسیام کردو گوتم:
ع دەبێ بابێ، من هەوڵی خۆم دەدەم، کردە پەشیمان نەك نەکردە پەشیمان. هەوڵێکەودەیدەم، خۆ نامکوژێ، سیروان لێشت نەدەم هەر دەمبەی".ئەنجام لێبڕام بە ئەسپایی دەرگاکە بکەمەوە.
هەرکە درزم خستە پیرە دەرگا، بەلایەکی ترم لێ نازڵ بوو: سەگێکی چکۆلەی دڕ، حەیوانێکی گەوجی کەودەن، لێ تورە بوو، وێپما هەڵشاخی، تامێز لە گەرووێدا بوو دەوەڕی، خەریك بوو زنجیرەکەی پارچە پارچە بکات، بۆ تاقە ساتێك لە حەپە نەدەکەوت!.. کە سەگێکی پیس بوو!..
جا ئەم وردە ڕووداوانە، زۆر جار پیاو دەمری دەکەن، بە جۆرێ قەڵس‌و پەستی دەکەن، کە لە گیانی خۆی بێزاربێت‌و بە جارێ ورەی بڕوخێ و نەترە بەربدات! **بۆیە** وەکو نیوە گیانێك خۆم وەژوورا کرد، لێرەشا بەلایەکی دی یەخانگیرم بوو. ئاستانەی دەروازەکە هێندە تاریك بوو، هیچ شوێنێکم نەدەبینی، لەبەر دەرگای ژوورەکەدا، نوچێکم داو کەوتم بە سەر ژنە دێهاتیەکدا، بەڵێ ژنە دێهاتیەك کە سەتڵە شیرێکی بە دەستەوە بوو ولە دەفرانی دەکرد. سەتڵەکەی لە دەست کەوتوو شیرەکە رژا.
ژنەی گەوج کەتە هاتو هاوار: "ئەوە تۆ کوێری کابرا، نابێ چاوت لەبەر پێی خۆت بێ. چدەکەی لێرە مەیموون؟"ودەمرێژێکی تری جنێوی سەر بە کۆڵکەی بەسەرا کرد، هەنگێ لە هۆڕژنی گریانی داو هەر

نەیدەبڕییەوە. **بۆیە** ئەمەت بۆ دەگێڕمەوە ڤارینکا گیان، چونکە دایمە لەو جۆرە شوێنانەدا، ئەو جۆرە واریقاتەم دێنە پێش.

هەردەڵێی لە چارەم نووسراوە کە ئەم جۆرە ڕێکەوتەم بێتە ڕێ. پیرەژنێکی قژ ماش‌و برنج کە گوێی لە هاواری بوو، هات بەلایەوە، دیار بوو خاوەن ماڵە، یەکسەر خۆم گەیاندێ‌و پرسیم: "ئاغای مارکۆڤ لێرەیە؟" گوتی: "نا." ئەوجا لەبنی پێمەوە تا تۆقی سەری بەرنیگا دام، دوای تۆزێك گوتی: "مارکوفت بۆ چیە؟"

مەبەست‌و مەرامەکەی خۆم **پێگوت**... گوتم ئیمیلیان ئیڤانوڤیچ ناردوومی... هتد. "کارێکم پێی هەیەو دەمەوێ قسەی لەگەڵ بکەم".

پیرەژن کیژەکەی گازکردو –کچێکی گەورە بوو، پێی پەتی بوو– گوتی: "بڕۆ بابت گاز بکە، لەلای کرێچیەکانی ڤاتی سەرەوەیە".

هەنگێ رووی کردە من‌و گوتی: "فەرموو ژوورێ".

وەژوورکەوتم، ژوورێکی باش بوو، کۆمەڵێك تابلۆ بە دیوارەکانەوە هەڵواسرا بوون کە هەموویان پۆرترێتی جەنەراڵان بوون، قەنەفەیەك‌و مێزێکی خڕ، وچەند گوڵدانێك گوڵەخەنەی تیا بوو.

کە بە تەنێ لە ژوورێ مامەوە، لە دڵی خۆدا بیرم لەوە کردەوە بۆچی یەکسەر نەڕۆمەوە؟" باوەڕم پێ بکە ڤارینکا گیان بە من بوایە پێ وەغارێوە بنەم‌و ئەوێندەر بەجێ بێڵم! لە دڵی خۆدا گوتم: "ولچاکە بڕۆم‌و سبەی بێمەوە. ڕەنگە کەش‌و هەواش خۆشتر بێ.

واچاکە سەبرۆکەیەك بکەم، وادیارە ئەمڕۆ لە من نیە، سەتڵە شیرەکەم ڕشت،وچارەی ئەم جەنەراڵانەش، کە بە دیوارەکەوە هەڵواسراون گرژو مۆنە..

**چاکتر** وایە سبەینێ بێمەوە". خەریك بوو بەرەو دەرکە دەچووم کە بڕۆم، پیاوێکی ئەندام وردیلەی قژ ماشو برنجی، چاوچکۆلەی گێلۆکە، کە ڕۆبێکی چلکنی پڕ پەڵەی چەوری لەبەر بوو، ناو قەدی بەپەتێك بەستبوو، خۆی بە ژووراکردو پرسی کە بۆچی هاتووم، پێم گوت ئیمیلیان ئیڤانوفیچ ناردوومی بۆ لای، وپێویستم بە چل ڕۆبڵەو هاتووم لەو بارەیەوە قسەی دەگەڵ بکەم...

بەڵام نەیهێشت قسەکەم تەواو **بکەم**. لە چاویا ئەوەم خوێندەوە کە هیچ ئومێدێك نیە. گوتی: "پێویست بە هیچ قسەو ڕوونکردنەوەیەك ناکات، پارەم نیە، ئایا هیچ بارمتەیەکم هەیە دای بنەم؟"

وەڵامم دایەوە کە هیچ بارمتەیەکم نیە، بەڵام ئیمیلیان ئیڤانوفیچ... خۆلاسە تێم گەیاند کە زۆرم پێویست بە پارەیە.

کە گوێی لە هەموو قسەکانم گرت، گوتی: "ئیمیلیان چی گوتووە یان نەگوتووە ئەمە گرینگ نیە، مەسەلە ئەوەیە کە پارەم نیە..

مەسەلەکە تەنیا بێ پارەییەو هیچی تر..." لە دڵی خۆمدا گوتم: "ئەمگوت، مەزندەکەی خۆم دەرچوو، لە هەوەڵەوە دەمزانی کە وا دەبێ. پێشوەختە دڵم خەبەری دابوو."

ئاه ڤارینکا، لەو ساتەدا حەزم دەکرد زەوی شەق ببا و قووتم بدات. هێندەم سەرما بوو بوو، لاقەکانم بوو بوون بە تەختە، بڕبڕەی پشتم مێروولەی دەکرد. تەماشایەکم کرد، دیتم ئەویش **تەمەشای** من دەکات وەك ئەوەی بڵێ: "برادەر چاوەڕوانی چیت؟ بۆ ناڕۆیت؟ بە تەمای هیچ مەبە".

ئەگـەر لـە وەزعو حـاڵێکی ئیـدا ئەمـەم بەسـەر هاتبـا، لـە تـەریقیو شەرمەزاریدا هەر لەویٚ دەمردم. کابرا لەپڕ لێی پرسیم: "ئەم پارەیەت بۆ چیە؟" (ئەو پرسیارەشی لـیٚ کـردم ڤارینکـا گیـان!) بـۆ ئـەوەی گێلۆکـە نەنوێنم دەمم کردەوە قسان بکەم، بەڵام نەیویست هـەر گوێشـم لێبگـریٚ، دووبارەی کردەوە کە:

"نا، نا پارەم نیە، ئەگـەر هەمبوایـە بەسـەر چـاو". هەوڵمـدا قەناعـەتی پێبکـەم، زۆرم گـوت کـە ئەمـە پارەیـەکی زۆر نیـە، لـە کـاتی خۆیـدا دەیدەمـەوە، بگـرە زووتـریش دەیدەمـەوە، پـێم گـوت سوودەکەشـی هەرچـەند بـیٚ دەیـدەم، وسـوێندم بـۆ خـوارد کـە هـەر هـەمووی بـۆ دەگێڕمەوە.

لەو ساتەدا تۆم بیر کەوتەوە ڤارینکا گیان، کە لـە تەنگانەیەکدای، لـە چ عەزابێکدای، تووشی چ کوێرەوەریەك بوویت، ئەو نیو ڕۆبڵەم بیرکەوتـەوە کە بۆت ناردبووم. بەڵام کابرا گوتی: "نا، نا، پێویست بـە باسـی قـازانجو سووت ناکـات، ئەگـەر بارمتەیەکیشـت هەبوایـە هـەر نەیسـە، بـەڵام بـەبیٚ بارمتە هەر نەو....بە هەرحاڵ پارەم نیە، بە زاتی خوا پـارەم نیـە.. دەنـا خوا شایەدە حەزم دەکرد قەرزت بـدەمیٚ.." ئـەم دزە بـە خوتوخـۆڕایی، بیٚ هیچ شەرمێك سوێندی دەخواردو خوای بە شایەت دەگرت!.

بەڵیٚ ئازیزەکەم، ئەمـە حاڵوحیکایەتەکـە بـوو، لـە بـیرم نیـە چـۆن لـەویٚ هاتمە دەریٚ، چۆن لە شەقامی فیبورگ پەڕیمـەوەو خـۆم گەیانـدە پـردی فاسکروسنسـکی، یـەجگار شـەکەتو مانـدوو بـووم، سـەرما گـەیی بـووە مـۆخی ئێسـقانەکانم، سـەعات دە گەییمـە سـەر ئیشـەکەم، ویسـتم لـە ڕاڕەوەکـەدا کـەمێك جلـەکانم بتـەکێنمو قوڕەکـەی لـیٚ ببێتـەوە، بـەڵام

سنگیریوڤ خەفەر ڕێگەی نەدام، گوتی: "سەرکار، فلچەکە خراپ دەبێت، بە خۆت دەزانی فلچەی دەوڵەتە،" دایکەلێ، ئێستا هەر هەموویان بەو شێوەیە ڕەفتارم دەگەڵ دەکەن، بەلای ئەوانەوە من ناکەمە ئەو پارچە پەڕۆیەی کە پێڵاوەکانیانی پێ پاك دەکەنەوە.

من ئەم ڕەفتارانە، دەمکوژێت **ڤارینکـــا گیـــان**. من دەسکورتی و بێ پارەیی نامکوژێت، بەڵکو ئەم بێزکاڵی، چپەچپ، ژارخەندانە دەمکوژێ. حەزرەتی سەرۆك مەگەر بە ڕێکەت ناوێکی من بێنێ، ئاه ڤارینکا، ڕۆژە جوانەکان، ڕۆژانی زێڕینی من بەسەر چوون. ئەمڕۆکە دووبارە هەموو نامەکانم خوێندیتەوە. مەگەر خوا بزانێ چەندیان خەمبار کردم ئازیزەکەم.. کە بەشەرێکی نەگبەتم! بە دوعا ئازیزەکەم، خودا پشت و پەنات بێ!.

م. دیوشکین

پەراوێز: ویستم کێشەکانت بە شێوازێکی گاڵتەئامێز بۆ بگێڕمەوە. بەڵام لەو ساتەدا بوم نەهات. ویستم بە گوێی تۆ بکەم. دێموەدەتبینم ئازیزەکەم، سبەینێ بە مسۆگەری دێم.

*ڤرڤارا ئالکسیوڤنا! کۆترەکەم،* ١١/٨

دایکەلێ! تازە حیسابم ڕۆیی، **حیسابی** هەردووکمان ڕۆییشتووە، تازە لێ بووینەوە، منیش و تۆش لێبووینەوە، هیچ چارێکیش نیە. ناوم، ناوبانگم، ئابڕوم، کەرامەتم هەمووی ڕۆیی.

کۆتاییمە، کۆتایی تۆشە ڤارینکا گیان، هەردووکمان پێکەوە تیا دەچین! هیچ ئومێدێکی ڕزگاربوونیش نیە، من تۆم گەیاندە ئەم ڕۆژە، من ئەم بەڵایەم بەسەر تۆدا هێنا! ڤارینکا گیان ئەمانە ئازارم دەدەن، عەزابی ڕوحم دەدەن، دەمبوغزێنن، دەمکورهێنن، پێم پێدەکەنن، گاڵتەم پێدەکەن..

خاوەن خانووەکە بێ لە ڕوودامان، **قسەم** پێ دەڵێ، هەر قسەیەکی ناشرینی بەزاردا بێت نایگێڕێتەوە، لەم بەیانییەوە لە یەکبینە هاوارم بەسەردا دەکات، کردوومی بەبنێشە خۆشەی ژێردانی خۆی.

ئێوارێ لە ژوورەکەی ڕاتازاییفدا، یەکێك بە دەنگی بەرز، ڕەشنوسی یەکێك لە نامەکانی منی بۆ تۆ، دەخوێندەوە، نازانم چۆن لە گیرفانم کەوتبوو. ڤارینکا گیان مەگەر هەر خوا بزانێ چ بەزمێکیان لەسەر ئەمە ناوەتەوە! چەندیان گاڵتە پێکردووین، چ ناوو ناتۆرەیەکیان لە تۆو لە من ناوە، چۆن قاقا پێدەکەنین، ئەوەی دەیانگوت، ئەیان دەگوتەوە، خاینانی بودەڵە! چووم بۆ ژوورەکەیان، یەخەی ڕاتازاییفم گرت، تەریقم

کردووه، گلەیم لێکرد کە ئەمە خیانەت بە دۆستایەتیە، ئەمە شەرتی دۆستایەتی نیە.

بەڵام راتازایف قەرزاریاری کردم، پێی گوتم تۆ خاینی کە ژێراوژێر خەریکی (( فەتحی تازە))ی. گوتی: " تۆ حەقیقەتت لە ئێمە شاردووەتەوە، تۆ کابرایەکی خاپینۆکی! " ئێستا هەموویان بە (( خاپینۆك)) ناوم دەبەن، هەر بەو ناوەبانگم دەکەن! دەزانی فریشتە چکۆلەکەم، دەزانی؟ ئێستا هەموو شتێك دەزانن، هەموو راستیەکانیان لەبەر دەستدایە.

هەموو شتێك دەربارەی تۆش دەزانن دۆستی ڤازیز، هەموو مەسەلە شەخسەیەکانی تۆ دەزانن، هەر هەموویان دەیزانن! تەنانەت فالدونی خزمەتکاریش لەوێ بوو، و گوێ بە گوێی ئەوان بە ئێمەی رادەبوارد. ئەمڕۆ داوام لێکرد تا دوکانی بەقاڵەکە بچێ و شتێکم بۆ بکڕێت و نەچوو، بیانووی ئەوە بوو کە کاری هەیە و مژوڵە.

کە پێم گوت: (( تۆ لەسەرتە بچیت)). گوتی: (( نەخێر بۆ تۆ لە سەرم نیە، تۆ کرێکەی خانمت نەداوە، کەواتە لەسەرم نیە بە گوێت بکەمو بچم.)) هەر لەمەم کەم بوو کە دێهاتیەکی بێ تەربێت سوکایەتیم پێبکات، بۆیە کە پێم گوت کابرایەکی گەوجی، بێ سێ و دوو وەڵامی دایەوە: "ئەگەر من گەوج بم، تۆ گەوجتری" مەستم کرد مەستە بۆیە ئەو قسە سووکەی بە من گوت، بۆیە گوتم: "سیارە مەستی، دێهاتی! " ئەوەیش وەڵامی دامەوە: "مەستم بۆ خۆم مەستم، خۆ بە پارەی تۆ نەمخواردووەتەوە. تۆ پارەی پێکێکی بچووکیشت نیە.

هەرجارەی چەند کوپێکێك لەم ژنو لەو ژن سوالّ دەکەی." لە سەری ڕۆیی: "ئاخر تۆ پیاوی!" تەمەشا ڤارینکا گیان کار گەییوەتە کوێ؟ شەرم لە مانی خۆم دەکەم ڤارینکا! دڵێی تاوانبارێکمو هەر بۆ عیبرەتو ناوزڕان بە عامودێکیانەوە بەستووم. بووم بە تەریدەو سەرگەردانێکی بێ پەساپۆرت! بەڕاستی کارەساتێکی ترسناکە! تەواو لێ بوومەوە، بە تەواوەتی لێ بوومەوە،دوا دواییمە! بە یەکجارەکی تیا چووم!.

م. د

*ماکار ئالکسیوڤیچی گرانقەدرو مەرە ئازیز ٨/١٣*

نەگبەتی خۆشە، قۆرتەکانی ناخۆشە، بەلاّ هەر دەڵێی دەرباریّ، یەك لە دوای یەك.

وام لێهاتووە خۆیشم نازانم چی **بکەم**! تۆ چ دەکەی، چیت بەسەر دێت؟ من بەش بە حاڵی خۆم، ناتوانم شتێکی ئەو تۆت بۆ بکەم.

وەزعم زۆرباش نیە، ئەمڕۆ دەستی چەپم بە ئوتو سووتاند، ئوتوەکەم خست، کەوت بە دەستمدا، هەم کوتایو هەم سووتاندی. ئێستا ناتوانم کار بکەم. فیدوراش سێ دانە ڕۆژە نەخۆشە. یەجگار نیگەران و پەرێشانم. سێ دانە کۆپیکی زیوت بۆ دەنێرم، باوەڕبکە هیچمان بە دەستەوە نەماوە، خودا شایەدە زۆرم حەز دەکرد لەم تەنگانەیەدا فریات بکەوم و یارمەتیت بدەم.

لە داخی ئەوەی کە هیچ دەسەلاّتێکم نیە **گریانم** دێ. گریانم بۆ بێ دەسەلاّتی خۆم دێت! خودا حافیز دۆستی بەرێز! ئەگەر ئەمڕۆ سەرمان بدەی، فەرامۆشیەکی گەورە دەبێت بۆ من.

ف.د

*ماكار ئالكسيوڤيچ!* *٨/١٤*

تۆ پێم نڵێی بۆ وات بەسەرهاتووە؟ ئاخر چی روویداوە؟
وا دیارە تۆ لە خواش ناترسیت؟ بەڕاستی خەریکە شێتم دەکەی، شەرم لە خۆت ناکەی؟ تۆ خەریکە خۆت دەفەوتێنی. بیرێك لە ئابڕوی خۆت، لە سومعەی خۆت ناکەیەوە؟ ئاخر تۆ **پیاوێکی** ئابڕومەند، سەر بەرز،و نەفس بەرزی. ئاخر ئەگەر خەڵکی بەم کارانەت بزانن، چ دەکەی؟ هەر لە تەریقیو شەرمەزاریدا دیق دەکەیو دەمریت! بەزەییەکت بە پۆڕی سپیتا بێتەوە، لە خوا ناترسیت؟ فیدورا دەڵێت لەمڕۆ بە دواوە هیچ یارمەتیەکت نادا،و منیش تاقە پولێکت بۆ نانێرم.
تەمەشا چیت بە **سەری** مندا هێناوە، ماکار ئەلکسیوڤیچ! لەوە دەچێت وا بزانی من ئەم کرێتکاریانەی تۆم لا ناخۆش نیە، تا ئێستاش نازانی من بە هۆی تۆوە چ زوخاوێك دەچێژم! وام لێهاتووە زات ناکەم بە قاڵدرمەکانی ماڵەکەدا سەرکەومو دابەزم، هەموو دەرودراوسێکان مۆڕەم لێدەکەنو قامکم بۆ ڕادەکێشن،و قسەی قۆڕم دوو دەخەن، ڕێكو ڕاستو بێ پەردە دەڵێن کە من ئاشقی ((ئارەقخۆرێکی ئالودە)) بووم.
و لە رێم دەرکردووە، پێت وایە ئەم قسانە خۆشن؟
کە بە مەستیو **سەرخۆشی** بۆ ماڵت دەهێننەوە،وهەموو دەرو دراوسێکان لچت لێ هەڵدەقورتێننو بە تەوسەوە شان هەڵدەتەکێننو دەڵێن: (( تەمەشا، دیسان بەسەرخۆشی هێنایانەوە!))بە ڕاستی بەمە

شەرمەزار دەبم،لە جیاتی تۆ تەریق دەبمەوەو نازانم چی بڵێم. بەزاتی خوا دەڕۆمو چیتر لێرە نامێنم. دەڕۆم، کارەکەریو جلشۆری ماڵان دەکەمو لێرە نامێنم. بۆم نووسیت، تکام لێکردی کە بێیتە دەیدەنیم، بەڵام نەهاتی، بە گوێت نەکردم.

وا دیارە ئاهو حەسرەتو فرمێسکەکانی من بە هیچ نازانی ماکار ئالکسیوڤیچ!

پارەی خواردنەوەت لە کوێ پەیدا کرد؟ بۆ خاتری **خوا** ئاگات لە خۆت بێ! خۆت دەفەوتێنی، لە پێناوی هیچدا خۆت دادەنەی!

بەڕاستی شەرمە بۆ تۆ کە دوێ شەو خاوەن ماڵەکە ڕێی نە داوی بچیتە ژوورەوەو ناچار شەوت لە ڕاڕەوەکەدا ڕۆژ کردووەتەوە.

من هەموو شتێك دەزانم. **تۆ** نازانی کە ئەو شتانە دەبیستمەوە چەند هەست بە داماوی دەکەم! چەندم لە دڵ گرانە. ماکار ئەلکسیوڤیچ وەرە سەردانی ئێمە، با تۆزێ سەرو دڵت بکرێتەوە. دادەنیشینو پێکەوە شتێك دەخوێنینەوە،و یادێکی رابردوو دەکەینەوە. فیدوراش باسی حەجو زیارەتەکەی خۆیمان بۆ دەکات.

تکات لێدەکەم هاوڕێم، لەبەر خاتری من، خۆتو من بەو جۆرە مەفەوتێنە. چاك بزانە من ژیانم بەبێ تۆ ناوێ، بۆ تۆ دەژیم، ڕەحمێ بە خۆتا بکە، تۆزێ سەبرت هەبێ، ورە بەر مەدە، بەری تەنگانە کورتە. وەکو دەڵێن: هەژاری شەرم نیە.

ئیدی ئەم نائومێدیەت لە پای چی؟ **ئەمە** شتێکی ڕەوتەنییە، پشت بەخوا بە ئاسانی دەگوزەرێو هەموو شتێك دۆخی خۆی وەردەگرێتەوە.

بەلاّم دەبیّ جاریّ سەبر بکەین. وابیست کۆپیکت بۆ دەنیٚرم، بۆ خۆت کەمیٚك توتنی پیّ بکڕە یا هەر شتیٚك ئیشتیات لیٚیە، بەلاّم بیکە بە خاتری خودا خواردنەوەی پیّ مەکڕە! وەرە دیدەنیمان، لە بیرت نەچیّ هەر دەبیّ بیٚیتە دیدەنیمان.

رەنگە شەرم بکەیتو نەتەویّ بتبینین. ئەمە شەرمکردنیٚکی نا بەجیٚیە. ئەوەندەت بەسە تۆبەیەکی جدی بکەی. تەوەکەل بە خوا بکەی، خوا بە خۆی خیٚرو خۆشیت دیٚنیٚتە ریٚگە.

م. د

*ڤرڤارا ئالکسیوڤنا، ژیکەلەکەم* *٨/١٩*

من جەجاڵەتم، بڵندە جوانەکەم، ڤرڤارا ئەلکسیوڤنا، یەجگار شەرمەزارم. بەڵام ئاخۆ ئەوەی من کردوومە، زەرەری بۆ کەس بووە؟ چ شتێکی نا ئاسایی تێدایە؟ بۆچی حەرامە پیاو جار جارێ بای بلێك بداتو خەمی دڵ بە با بداتو خۆی ئاسودەو **شادمان** بکات؟ من کە دەخۆمەوە، ئیدی بیر لە پێڵاوەکانم، لە بەریوونی بنی پێڵاوەکەم ناکەمەوە. چونکە بنی پێڵاو شتێکی هیچەو هەتا هەتایەش هەر بە هیچی دەمێنێتەوە.

خودی پێلاویش هیچ نیە! زانایانو فەیلەسوفانی یونان پێڵاویان لە پێ نەدەکرد، ئیدی بۆچی رووتەیەکی وەکو من ئەوەندە بایەخ بەو شتە هیچیانە بدات، و لەسەر بڕوات؟ بۆچی لەسەر ئەمە ئیرادم لێدەگرن، دەم بوغزێنن؟ ئاه، ڤارینکا **گیان**، دایکەلێ، لە نامەکەتدا زۆر نیگەرانی ئەمەیت! سەبارەت بە فیدورا، بە زمانی منەوە پێی بڵێ کە ئافرەتێکی تووڕەهاتو شەڕانیە، خوا خوای قسەیەکێتی بیکات بە قاو، جگە لەمەش بنیادەمێکی گەوجە، لە گەوجێتیدا بەشی کەسی نەهێشتووەتەوە!

سەبارەت بە سەری سپیم، لەمەشدا بە هەڵەچووی ئازیزەکەم، چونکە ئەو پیرە نیم کە تۆ وێنای دەکەی. ئیمیلیان سڵاوت لێدەکات. لە نامەکەتدا نووسیوتە زۆر خەمبار بوویتو گریاوی، بەڵام بزانە کە منیش زۆر خەمبار بوومو منیش گریام، لە کۆتاییدا هیوای بەختەوەری و سەلامەتیت بۆ دەخوازم. سەبارەت بە من، منیش بەختەوەرو سەلامەتم، هەر دۆستەکەی جارانتم، فریشتە چکۆلەکەم.

*ماکار دیوشکین*

*خانمی هەژی و دۆستی ئازیزم ڤرڤارا ئالکسیوڤنا* *٨/٢١*

هەست بە تاوان **دەکەم**، هەست دەکەم دەرهەق بە تۆ گوناحم کردووە، پێم وایە ئەم ئیعترافەی من هیچ سودێکی نیە دایکەلێ، ئیدی تۆ هەرچیەك بڵێی! تەنانەت پێش ئەم رەفتارە کرێتەش هەستم بەمە دەکرد. بەلام هەنگێ لە کێشماکێشێکی دەروونی دا بووم، ئەقڵ دەیگوت **ئەمە** هەڵەیە مەیکە، دڵ دەیگوت بیکە. ڤارینکا گیان من بنیادەمێکی بەدو بەدخوا نیم.

دڵرەق نیم، کەسێك بتوانێ دڵە چکۆلەکەی تۆ برەنجێنێ، دەبێ بەورێکی خوێنخۆرو درندەبێت، بەلام من دڵی بەرخۆلانم هەیەو، وەکو دەزانیت هیچ مەیلێکی دڕندایەتی و تەماعکاریم نیە.

بەم پێیە، **فریشتە** چکۆلەکەم، من بە تەواوەتی لەم رەفتارە کرێت و دزێوە بەرپرس نیم، نە دڵ و نە ئەقڵم بەرپرس و تەخسیرکار نین، ئەگەر لە من بپرسیت ئەدی کێ تەخسیرکارە؟

دەڵێم ئەوەی راستی بێ نازانم، شتەکە ئالۆزە، چیرۆکێکی رەشە، ئالۆزە ڤارینکا گیان! سی کۆپیکی زیوت بۆ ناردبووم، دوای چەند رۆژێکی دیکە بیست کۆپیکی ترت بۆ ناردم: کە روانیمە ئەو دراوانەی هەتیوێکی هەژار بە خێری خۆی بۆی ناردووم، دڵم گوشرا، دەستە چکۆلەکەت سووتاندووە، بە خۆشت پەکت دەکەوێ، برسی دەبی.

كەچی بەو حاڵەشەوە دەگریتو داوام لێدەكەی بچم بۆ خۆم تونی پێ بكرم. باشە لەم حاڵەدا دەبێ چبكەم؟

یانی رازی بم وەكو هەر دزێكی رێگر بێ ئەوەی ویژدان عەزابم بدا تۆ رووت بكەمەوە، تۆی هەتیوی بێكەس تالان بكەم؟

بەراستی ئەم بیرە روحی داغانكردم ڤارینكا **گیان**، ورەی روخاندم، لە هەوەڵەوە، بێ ئەوەی لە دەسەڵاتی خۆمدا بێ، هەستم كرد كە بۆ هیچ باش نیم، بە كەڵكی هیچ نایەم، بایەخی بنی تاكێك لە پێڵاوەكانم نیە، بۆیە سەیرم كرد نەك هەر بە كەڵكی هیچ نایەم بەڵكو پیاوێكی نادروست و بێ شەرەفم. ئیدی وەختێ هیچ رێزێكی خۆم نەگرت، عیزەتی **نەفسم** لە دەست دا، زانیم یەجگار تورەهاتم، هیچ سەنگێكم نیە، مایەی شەرمەزاریم، بە جارێ داڕوخام! ئەمەش حوكمی قەدەرەو هیچ تەخسیرێكی منی تیا نیە. لە ماڵ وەدەركەوتم تا پیاسەو تەبدیل هەوایەك بكەم. بەڵام ئەو رۆژە هەموو رێكەوتەكان بەرەو نەگبەتیان دەڵەك دەدام.

سروشت پەستو غەمگین بوو، دنیا سارد بوو، باران دەباری، لە رێگا تووشی ئیمیلیان بووم... هەرچیەكی هەبوو بە بارمتە دایینابوو، وقەرزێكی پێ وەرگرتبوو، هەر هەمووی خەرج كردبوو.

كە تووشی بووم دوو دانە رۆژ بوو، زەوادی لە زار نەنا بوو، بیری لەوە دەكردەوە ئەو شتانەی تری بخاتە بارمتەوە كە بۆ بارمتە نەدەبوون.

باشە دەتەوێ لەم حاڵەتەدا **چی** بكەم ڤارینكا گیان؟ من ناچار لە رووی بەزەیی‌و مرۆڤدۆستییەوە تەسلیم بووم، نەك لەبەر ئارەزوو وەیلی دڵی خۆم. ئیدی بەو جۆرە تووشی ئەو هەڵەیە بووم دایكەلێ!

بە دوو قۆڵی گریاین، باسی تۆمان کرد. مرۆڤێکی باشە، دڵێکی هەیە یەکپارچە زێڕە، یەکێك لە پیاوە بەسۆزو هەستەکانە .من باش لەمە تێدەگەم، چونکە بە خۆشیم هەستیارم، هەر لەبەر ئەمەشە، ئەو هەموو بەلایەم بەسەر دێت...

من دەزانم کە چاکەیەکی زۆرت بە سەرمەوەیە، زۆرت قەرزاریارم **کۆترەکەم**. لەوساوە کە تۆم ناسیوە، توانیومە بەرە بەرە خۆشم باشتر بناسم، لەوساوە رۆژ بە رۆژ پتر تۆم خۆش ویستووە. بەر لەوەی تۆ ببینم، فریشتە چکۆلەکەم، من کەسێك بووم تەنیاو گۆشەگیر، کەسێك بووم نەدەژیام، وەکو خەوتوو وابووم، هەر دەتگوت لەم دنیایەدا نیم. هەموو ئەوانە، هەموو بەدخوایانی **من**، بە کەللەپووتیان دەزانیم، بە بڵحو رەزا قورسو توڕەهاتیان دەزانیم، بەڕاشکاوی گاڵتەیان پێ دەکردم، لێم بێزار بوون، وام لێهاتبوو بە خۆیشم رقم لە خۆم دەبوروەوە.

دەیانگوت کەسێکی کەودەن و ئەبلەم، خۆیشم باوەڕم پێدەکردن، **بەلام** کە تۆ پەیدا بووی تووشی تۆ بووم، سەراپای ژیانی تاریکت رۆشن کردمەوە، دڵو روحم ئاواو روونـاك بووەوە، ئارامی و ئۆخژنێکی وام لە دڵو دەروون گەڕا، کە هەستم کرد کە هیچم لە خەڵکی تر کەمتر نیە، تەنیا تیشکێکی دەرەکی و ئۆزێك پرشنگو کەمێك نموودم گەرەکە، بەڵێ من کەسێکی بەهرەدارو بە توانا نەبروم، بەلام لەگەڵ هەموو ئەمەشدا، بەشەر بروم، وەکو هەر کەسێکی دی هزرو هەستی خۆم هەبوو. بەلام ئێستا هەستدەکەم چارەنووس تاقیبم دەکات.

دەمبوغزێنیێ، باوەڕم بە خەسلەتە باشەکانی خۆم نەماوە، دەردو بەلا بڕستیان لێبڕیبوم، ئەترەم بەرداوە، وجا ئێستا ڤارینکا گیان کە هەموو

**شتێکت زانی، و بۆت روون بووەوە کە ئەو کارە چۆنی روویداوە، بە چاوانی پڕ لە فرمێسکەوە تکات لێدەکەم، چیتر لەو بارەیەوە پرسیارم لێ مەکە، دڵم بە بەریەوە نەماوە، هەست بە خەمو پەژارەیەکی یەجگار قورس دەکەم.**

**دڵنیابە وەکو جاران لە لام ئازیزو بەڕێزیو هەر دۆستە ئەمەکدارەکەی جارانتم.**

***ماکار دیڤشکین***

٩/٣

نامەکەی پێشووم تەواو نەکرد ماکار ئالکسیوڤیچ، **چونکە** یەجگار غەمگین بووم، نەمدەتوانی لەسەر نووسین بەردەوام بم.

هەندێ سات حەزدەکەم بە تەنیا بم، بە تاقی تەنیاو بێ ئەوەی کەس بمدینێ خۆم بدەم بە دەم خەم و پەژارەکانمەوە. ئێستا ڕۆژ بە ڕۆژ ئەو ساتانە زیاتر بە سۆراخمەوە دێن، هەندێ شتم لە یادگەو خەیاڵدایە کە بۆم لێك نادرێتەوە، نایەتە شرۆڤەکردن، بە جۆرێك رامدەکێشن ناتوانم مقاوەمەیان بکەم.

**هێندە** بەهێزن کە بە سەعاتان هەموو شتێك فەرامۆش دەکەم و ئاگام لە دەورو بەرم دەبڕێت، بە تەواوەتی زەمەنی ئێستام لە بیر دەچێتەوە.

هەر هەموو هەستێکی ژیانی ئێستام، ئیدی خۆش بێ یان ناخۆش و بە ئازار بێ. ڕۆژگاری منداڵیم، ڕۆژگاری زێڕینی منداڵیم وەبیر دێنێتەوە.

دەمباتەوە ڕۆژگاری منداڵیم. ئیدی زۆرجار خەون و خەیاڵ دەمباتەوە، بەڵام هەرکە ئەم خەون و خەیاڵە تەواو دەبێت، دڵم پڕ دەبێت، هەست بە ماندووبوونێکی بەترەف دەکەم. یەجگار لاوازو بێ تاقەت بووم، ڕۆژ بە ڕۆژ کەسیرەتر دەبم، خۆم لە خۆمدا نەبووم ئەم خەون خەیاڵانەشی هاتە سەر.

ئەم بەیانیە، ڕۆژەکەی خۆشە، دنیا ڕوناك و تازەیە، تیشکی زێرینی هەتاو پرشنگ دەدات، یەکێکە لەو بەیانیانەی کە بە دەگمەن لە پایزی ئێرەدا دەبینرێ، بە ڕاستی ئەمە ئۆخژنی خستە دڵ و دەرونمەوە،

بوژانمیەوە، هەرکە لە جێگە هاتمە دەرێ دڵم خۆش بوو. ئیدی پایز هات! کە لە لادێدا حەزم لەم وەرزەی ساڵ بوو!

هەرچەندە ئەوسا منداڵ بووم، بەلام هەستم بە شادیو خۆشیەکی سەیر دەکرد! ئێوارانی پایزم لە بەیانیانەکەی پێ خۆشتر بوو.

ئێستاش بیرمە، لە نزیکی ماڵەکەمان، لە بناری گردێك دا، دەریاچەیەك هەبوو. دەریاچەیەکی هێندە جوان بوو، ئێستاش، لەبەر چاومە، دەریاچەیەکی گەورە، سافو زوڵاڵ، رۆشن دەتگوت بلورە!

هەر کاتێ بای نەبوایە، بە تایبەتی ئێواران، یەجگار هێدیو مەنگ دەبوو، تەنانەت دەنگی خشە خشی گەڵای درەختانی دەوری دەریاچەکەش نەدەهاتە گوێ، ئاوەکەی وەکو ئاوێنە ساف بوو. جا چەند پاکو زوڵاڵ، چەند ساردو تەزی!

ئاونگ دەکەوتنە سەر پەلکی گیا. تیشکی روناکی لە کوخەکانی کەنار دەریاچەکەوە چاوشارکێیان دەکرد، گاگەل بەرەو ماڵان دەبوونەوە.

ئا لەو کاتانەدا بە دزییەوە لە ماڵ وەدەردەکەوتم بەدەم تەمەشای دەریاچەکەوە نوقمی هەزارو یەك بیرو خەونو خەیالات دەبووم.

رێك لە قەراخی ئاوەکە، ماسیگران ئاگرێکیان دەکردەوە کە روناکییەکەی دەگەییە دووری دوور، دەگەییە ئەو بەری ئاوەکەو روناکی بڵێسەکەی لە رووی ئاوەکەدا رەنگی دەدایەوە.

ئاسمان سارد دەنوێنێ، شینی شینە، لە دەمی ئاسۆدا سووریەکی ئاڵی ئاگرین دەیبڕی کە بەرە بەرە کاڵ دەبووەوە. هەیڤ لە ئاسمان دەردەکەوت، دنیا هێندە کپ بوو، ئەگەر لە پڕ چۆلەکەیەك هەڵفڕیبا، یان

چڵە نەیجەیەك بەدەم شنەیەکی سازگارەوە جوڵابا، یان ماسیەك لە ئاوەکەدا هەڵپلابا، بە ئاسانی گوێت لە دەنگی دەبوو.

چرە مژێکی ناسكو ڕۆشن لەسەر ئاوە شینەکەوە هەڵدەستا، وشتە دوورەکان نقومی تاریکی دەبوون، لە تۆ وایە هەموو شتێك لە تەمومژەکەدا نقوم دەبێت. بەڵام شتە نزیکەکان هێندە جوانو بەرجەستە دەهاتنە بەرچاو لە تۆ دایە بەقەڵەم داتاشراون: بەلەمێکی چکۆلەی فەرامۆشکراو لە ڕەخی دەریاچەکە، دوڕگەی کپو بێدەنگ، پەرتو بڵاو لێرەو لەوێ، بۆشکەیەکی باش کە لە کەنارەکەدا بەجێیان هێشتبوو، کە ناو بەناو بەدەم شنە بایەکەوە بەرزو نزم دەبووەوەو ئاوەکەی دەشڵەقاند، یان لقە بییەك گەڵا زەردەکانی لە نەیجەی نەیجەزارەکە دەسوو، هەنگێ باڵندەیەکی دەریایی لە پۆل بەجێماو لە پڕ لە شەقەی باڵی دەداو بەرز دەبووەوەو هەندێجار بۆ ناو ئاوەکە دادەکشاو دیسان هەڵدەستایەوەو لە تەمومژەکەدا ون دەبوو.

من لە فکران ڕادەچووم، خۆم دەدایە دەم خەیاڵەوەو گوێم هەڵدەخست. هەستم بە خۆشیو شادیەکی زۆر دەکرد!

هەنگێ من کچۆڵەیەکی چکۆلە بووم.. زۆرم حەز لە وەرزی پاییز دەکرد، درەنگانێکی پاییز کە جووتیاران بەرو بومیان هەڵدەگرتو کار لە مەزاریان تەواو دەبوو،وخەڵکی لە کوختەکانیاندا لە دەوری یەکدی کۆ دەبوونەوەو هەموو چاوەڕوانی هاتنی وەرزی زستانیان دەکرد، لەو وەرزەی ساڵدا هەموو شتێك دەگۆڕا، تەبیعەت ڕەنگی تاریکی دەگرت، هەوری تاریك بەری ئاسمانی گرژو مۆنی **دەگرت**، گەڵای زەردی خەزان دەرژانە سەر یەكو باریکە ڕێگاکانی لێرەوارەکانیان دادەپۆشی،

لێرەوارەکان سەرەتا شین دەچوونەوەو پاشان بەرەو تاریکی دەچوون، بە تایبەتی دەمەو ئێواران، کە تەمومژێکی شێدار هەموو لایەکی دادەگرت و درەختەکان وەکو تاپۆو شەبەنگی زەبەلاح و دێو ئاسا، لە دیمەنێکی ترسناک داو لە ناو جەرگەی تەمومانەکەوە سەریان قوت دەکردەوەو دەردەکەوتن.

هەندێجار کە بۆ پیاسەو **گەڕان** لە دەرەوە بام، لە گەڕانەوەدا، پێم قورس دەکرد، لەوانی دی دوا دەکەوتم، بە تەنیا پیاسەم دەکرد، لە پڕ ترسم لێدەنیشت، پیم هەڵدەگرت، وەکو گەلای بەر با دەلەرزیم، هێندە دەترسام، وام دەزانی لە پڕێکاو لە پەنای قەدی ترسناکی درەختەکانەوە دێوێکی زەبەلاحم لێدەردەکەوێ و پەلامارم دەدات.

بە درێژایی ئەم کاتە بایەکە بەگڤ و هۆڕو ناڵەناڵ خۆی بەنێو درەختەکاندا دەکردو هەمهەمەیەکی کڕو کپ دەکەوتە نێو لێڕەوارەکەو پاشان هەمهەمەکە بەرە بەرە سەرانسەری لێڕەوارەکەی دەگرتەوە،و ئاهو ناڵەیەکی خەمناک و ئالۆز لە هەموو لایەکەوە هەڵدەستا. بایەکە خۆی بە لق وپۆپی درەختەکاندا دەداو گەڵا وشکەکانی دەستە دەستە دەوەراندو بە توڕەیی لە شێوەی گێژەلوکەدا بە ئاسمانیا دەبردن.

پۆلی مەلان، شپرزەو ترساو بەدەم جوکە جوک و قاوقیژەوە بەگەڵ گەڵا با بردەڵەکان دەکەوتن و بەری ئاسمانیان دەگرت و وەکو پەڵە هەور ڕەش دەچوونەوە.

خودایا لەو کاتانەدا چەند دەترسام! وام هەستدەکرد یەکێك بە **گوێمـدا** دەچپێنێ:

"هەڵێ کیژێ، هەڵێ، لێرە مەمێنە، ماکا شتێکی مەترسیدار بقەومێ!"

ترس چوار پەلی دەشکاندم، دڵم دەکەوتە لێدان، ئەوسا تا هێزم لە لاقیدا بوو پێم وەغارێوە دەنا. بە هانکە هانك خۆم دەگەیاندە ماڵەوە، ماڵەکە پڕ بوو لە هەراو زەناو خۆشیو شادی، هەر منداڵەو کارێکی لە قەد توانای خۆی پێ دەسپێردرا.

یەکێ نۆکی پاك دەکرد، یەکێك سەوزەی پاك دەکرد، **یەکێک** چڵ وچێوی لە داری تەڕ دەکردەوە و لە سوپای داویشت و بە تریق و تۆق دەسووتا. دایکەش بە شادیەوە سەرپەرشتی کارەکانی دەکردین.

ئولیانای دایەنی پیرمانیش باسی ڕۆژگاری کۆنی بۆ دەکردین، یان نەقڵ و حیکایەتی ترسناکی جادووکاران و گەڕانەوەی ڕوحانی ئەو دنیای بۆ دەکردین.

ئێمەی منداڵیش لێو بەخەندە، وەکو ئەوەی هەست بەجۆرە ئاسوودەیی و دڵنیاییەك بکەین، خۆمان دەخزاندە پاڵ یەکدی.

دوایی لە پڕ هەموومان کرکپ دەبووین، بە نیگەرانیەوە: "وس... ئەو دەنگە چییە؟ دەڵێی یەکێك لە دەرگا دەدا!". بەڵام چ دەنگێك لە گۆڕێ نەبوو، **دەنگی** خەڕەکەی فلوروفنا بوو، لە دوورەوە دەهاتە گوێ،و کە بەمەمان دەزانی هەر هەموو لە قاقای پێکەنینمان دەدا! زۆر جاریش ڕێك دەکەوت کە شەو تا بەیانی لە ترسانا یان لەبەر خەونی ناخۆش خەو نەدەچووە چاوانمان.

هەندێجاریش لە نیوەشەودا خەبەرمان دەبووەوە و نەدەوێراین لە نێو جێگاکانمان بێینە دەرێ و تا بەیانی لە ترسان هەڵدەلەرزین. کەچی بەیانی وەکو گوڵی بێگەردو تەڕوتازە هەڵدەستاین.ل

ە پەنجەرەکەوە دەمانڕوانیە دەرێ: دەشت ودەرو مەزراکان یەك پارچە بەستبووی، چلورە سەهۆڵی ئاسکی پاییزی بە لقی رووتی درەختەکاندا شۆڕ بوو بووەوە، توێژێك شەختەی ئاسك وتەنك رووی دەریاچەکەی داپۆشی بوو وبوخارێکی سپی لێ هەڵدەستا، پۆلی کێشکەو مەلان پۆل پۆل بە ئاسماندا، بەدەم خوێندنی شادەوە دەفڕین.

**تیشکی** درەخشانی هەتاو دەیدا لە هەموو شتێكو بەرە بەرە ئەو توێژڵە شەختە تەنکە شووشە ئاسایەی دەشکاندو دەتواندەوە. هەموو شتێك رۆشن،درەخشان، وجوانو دلگیر بوو! دیسان ئاگری سۆپایان دەکەوتە تریقو تۆق، هەموو لە دەوری پیرە سەماوەر دادەنیشتین، وپولکان، سەگە دەمولمبۆز رەشەکەمان، کە شەوی لە دەرێو لەبەر سەرماکەدا گوزەراند بوو، بەدەم کلکە سووتێیەکی دۆستانەوە لە پەنجەرەکەوە تەماشای دەکردین،وئێمەش پێی پێدەکەنین، جووتیارێك بە سواری ئەسپو عەرەبانە، بە بەر پەنجەرەکەماندا بەلەز، بەرەو جەنگەڵ تێدەپەڕی، تا دارو چیلکان کۆ بکاتەوەو بیهێنێتەوە. هەموو هەر شادو بە کەیف وخۆشحاڵ بووین!... تەحا کە **سەردەمی** منداڵیم خۆش بوو!.

. بەرو بووم مشە بوو، خەرمانی گەنم لە کێڵگەکاندا، لەبەر تیشکی هەتاودا دەبریقایەوە. پەحا کە دیمەنی ئەو خەرمانانە جوانو لەزەتبەخش بوو، مرۆڤ هەنگێ هەست بە ئارامی و ئاسوودەییو دڵنیایی و شادی دەکات، خودا رزقو رۆزیەکی باشی بە هەر کەسێك داوە.

هەموو دەزانن کە ئەم زستانە لە نانیان کەم نابێت، جووتیاری بچووك دەزانێ کە ژنوماڵو منداڵەکەی لە رۆژگاری سەختو دژواری سەرمای بەترەفدا برسی نابن. بۆیە **گیـژان** تا حەوت نیوە شەوانیان لە کۆڕو

شەوكۆڕان بەدەم گۆرانیوسترانی لە پەستاو بیّ بڕانەوەدا بەسەر دەبردو زۆر جاریش لە پەرێز وەزراکاندا، بە دەم گۆرانییەوە دەکەوتنە هەڵپەڕکیّو رەقسینی بیّ وچان. هەر بۆیەش رۆژانی یەك شەممووان ولە کڵێسادا بە دەم شوکرانەبژێری پەروەردگارو بەخشش و نیعمەتەکانی پەروەردگارەوە چاوان تەژی روندك دەبوون...

پەحا کە ئەو سەردەمە زێڕینەی منداڵەیەتیم سەردەمێکی جوان بوو!

ئەمێستا **وەکو** منداڵان، کەوتوومەتە گریانو لە بیرەوەریەکانمدا نوقوم بووم. هەموو رابردووم وەکو شریت، روونو ئاشکرا لەبەر چاوم زندوو بووەتەوە. کەچی ئێستام تاریكو نوتەك، بیّ جیلوەو رەونەق، تروسکەی تیا بەدی ناکرێت...

ئاخۆ کەی ئەمە کۆتایی دیّت؟ **کەی** دەبڕێتەوە؟ دەزانی هەندێجار، جۆرە هەستێکم لەلا پەیدا دەبێت، بەڵکو جۆرە یەقینێکی خەون ئاسام لەلا پەیدا دەبێت کە ئەم پایزە دەمرم. ئەوەی راستی بیّ زۆر زۆر نەخۆشم. زۆر بیر لە مردن دەکەمەوە، بەڵام نامەویّ لێرە بمرم، لەم خاکە رژدەدا بنێژرێم.

نازانم، رەنگە جارەکی دیکەو بەو زووانە وەکو بەهاری ئەمساڵ، لە جێگەدا بکەومەوە، هەرچەندە هێشتا بە تەواوەتی چاك نەبوومەتەوە. حاڵی حازر هەست بە بێتاقەتیەکی فرە دەکەم.

فیدورا لە **بەیانیەوە** بە ئیشێکی تایبەتی خۆی لە ماڵ وەدەرکەوتووە. بە تاقی تەنیا لە ماڵەوەم. وام لێهاتووە ماوەیەکە لە تەنیایی دەترسم. هەست دەکەم کەسێکی دیکە، بیّ ئەوەی بیدینم، لە ژوورەکەدایە، لە نزیکەوە قسەم دەگەڵ دەکات، بە تایبەتی لەو کاتانەدا کە خەیاڵ

دەمباتەوەو لە پڕێکا دەگەڕێمەوە ناو واقیع. لەو کاتانەدا خەمو پەژارەیەکی قورس دامدەگرێت، ترس بە سەرمدا زاڵ دەبێت. هەر بۆیەش ئەم نامە دوورو درێژەم بۆ نووسیویت.

کاتێ کە **دەنووسم** ئەو ترس و دڵەڕاوکێیەم دەڕەوێتەوە. جارێ خودا حافیز، کۆتایی بەم نامەیەم دێنم، چونکە نە کاغەزم هەیە و نە ئەو وەختەشم هەیە لەسەری بڕۆم. لەو پارەیەی کە لە ئاکامی فرۆشتنی جلەکانم و کڵاوە چکۆلەکەم هاتبووە دەستم، تەنیا یەك ڕۆبڵی زیوم پێ ماوە.

زۆر چاکت کردووە کە دوو ڕۆبڵت بە خاوەن خانووەکە داوە، هەر نەبێ بۆ ماوەیەك بێدەنگ دەبێت. پێویستە تەگبیرێکی خۆت بکەیت و تۆزێ پاڵتۆکەت چەكوپینە بکەی. خودا حافیز. یەکجار ماندوو و بێتاقەتم. نازانم بۆچی ئەوەندە بێتاقەت بووم. هەر بجوڵێمەوە ماندوو دەبم. ئەگەر کارێکم دەست بکەوێ چۆنی بکەم؟ ئەم بیرە خەریکە دەمکوژێت، داغانم **دەکات**.

ف.د

*ئازیزەکەم ڤارینکا، کۆترەکەم.* ٩/٥

ئەمڕۆ، **فریشتە** چکۆلەکەم، زۆر شتم بینی، یەکەم بە درێژایی ڕۆژەکە ژانە سەر بەری نەداوم. جا بۆ ئەوەی کەمێك ئاسودەبم و سوکناییەك بە دڵ و دەروونم ببەخشم، چووم بۆ کۆڕنیشی فونتانکا تا پیاسەیەك بکەم.

ئێوارەیەکی تاریك وشێدار بوو. هەر لە سەعات پێنجەوە بوو بە شەو. راستە باران نەدەباری، بەڵام چڕە تەم و مژێکی وەهابوو هەزار خۆزگە بە باران.

پەڵە هەوری گەورەی لاکێشەیی بەری **ئاسمانی** گرتبوو. ئاپۆرایەکی فرە بە کەناری فونتانکا دا دەهاتن ودەچوون. خەم و پەژارەیەکی ترسناك بە سیمای هەر هەموویانەوە دیار بوو، ئەمە هێندەی دی پیاوی پەست و غەمگین دەکرد، جووتیارانی مەست، ژنانی لووت فسی چەنەبازی، چەکمە لە پێی سەر رووت، کرێکاران، عەرەبانچی... و خەڵکانی دیکەی میناکی من کە هەر یەکەیان بە کارێ هاتبوونە دەرێ.

کوڕیژگەی خواروو ژوور، شاگردێکی قفڵساز بە جلی کارەوە، بە رواڵەت شپرێو و نەخۆش، سەروچاو یەکپارچە پەڵەی گریس و چەوری، قفڵێکی بە دەستەوە بوو. ئەوجا سەربازێکی خانەنشینی لە ندەهۆری نێو ئاسا، چاوەڕوانی دەرفەتێك **بوو** کە گوێزانێك یان موستیلەیەکی برونز بە یەکێك لە رێبوارەکان بفرۆشێت. بەڵێ ئەو جۆرە خەڵکانە. لە کەنارو کۆرنیشەکە

بوون. ئەو وەختەی کە من بە نیازی پیاسە لە ماڵ وەدەرکەوتم، وەختێك بوو هەر ئەو جۆرە کەسانە لە ماڵ وەدەردەکەوتن. بە هەرحاڵ فونتانکا کەناڵێك بوو بۆ کەشتیرانی، هێندەی بەلەم تێدایە، پیاو سەری سوڕ دەمێنێ کە چۆن لەو بستە شوێنەدا جێیان بووەتەوە...

ژنە دێهاتیان لەسەر پردەکە بەدیار شیرینی وسێوە سیسەڵەکانیانەوە دانیشتبوون و چاویان لە دەستی کڕیار بوو، هەر هەموو ژنەکان پیس وچەپەڵ، سەراپایان تەڕو قوڕاوی بوو. پیاسە کردن بە کۆرنیشی فونتانکادا، نەك هیچ لەزەتی نیە، بەڵکو دڵیش دەگوشێت. شۆستەکە تەڕە، لە هەردوو بەریشەوە خانووبەرەی بەرز، لە دووکەڵا رەش هەڵگەڕاو چووە بە ئاسماندا. تەمومژ سەرو خواری گرتووی. ئێوارەیەکی خەمناکی تاریك و ناخۆشە و دڵ دەگوشێت.

کە بەرەو شەقامی گوروخوفیا پێچم کردەوە، **دنیا** تەواو تاریك بوو بوو، کەوتنە داگیرساندنی فانۆسەکان. دەمێ بوو ڕێم نەکەوتبووە شەقامی گوروخوفیا. کە شەقامێکی قەرەباڵغ وجەنجاڵ و پڕ هەراو زەنایە ! یەکپارچە موغازە وکۆگاو فرۆشگاو کۆشك وتەلاری جوان وبەرزە ! هەموو شتێك دەدرەوشێتەوە:

**قوماش** وکوتاڵ، گوڵی پشت جامخانەکان. شەپقەی چکۆلەی ئۆیەدار. پیاو وا دەزانێ ئەم شتانەیان تەنیا بۆ جوانی داناوە. بەڵام وانیە، چونکە خەڵکانێك هەن کە هەموو ئەو شتانە دەکڕن و پێشکەشی ژنەکانیانی دەکەن. بەڕاستی شەقامێکی بە مەسرەف وکیسە تەکێنە.

پڕە لە شیرینی خانەو دوکانی ئیشی هەویر، کە زیاتر هی ئەلمانەکانە. پێدەچێت ئەوانەی ئەم دوکانانە بەڕێوە دەبەن خەڵکانی زۆر دەوڵەمەند و خۆشگوزەران بن. قەتاری سەروخواری گالیسکە هەر مەپرسە!

نازانم ئەو جادەیە چۆن هەڵیدەگرێ؟

بەڕاستی گالیسکەی گەورەو جوان‌و رازاوەن، بریسک‌وهوڕی جامەکانیان دەڵێی ئاوێنەیە، ناوەوەیان یەکپارچە بە مەخمەل‌و حەریر پۆشراوە، چ خولام‌و خزمەتکارانێکی پۆشتەو پەرداخیان دەگەڵە، هەر هەموویان نیشانە لەسەر شان‌و شمشێر بە قەدن.

تەمەشای یەك بە یەکی ئەو گالیسکانەم دەکرد کە ڕەت دەبوون. پڕ بوون لە خانمانی جوانپۆش، لەوە دەچوو هەموویان هەر دۆتمێرو شازادە خانم بن، چونکە لەم کاتانەدا ئەوانە لە ماڵ وەدەردەکەون‌و دەچن بۆ ئاهەنگی ڕەقس‌و سەماو شەوئاهەنگ ومیوانی، بە تاسەوە بووم ئەم ژنە دەوڵەمەندو ئەرستۆکراتانە لە نزیکەوە بدینم‌و بزانم چۆنن، هەڵبەتە دەبێ یەجگار جوان بن، من لە عەمراتم، لە دوورەوە نەبێ، ئیدی هەرگیز ئەو دیمەنەم نەبینی بوو، وەکو ئەم ئێوارەیە. بە دەم تەمەشای ناو گالیسکەکانەوە تۆم بیرکەوتەوە، ئاخ کۆترەکەم، ئازیزی دڵەکەم!

کە بیر لە تۆ دەکەمەوە، دڵم پڕ دەبێ لە ژان!

بۆچی دەبێ تۆ ئەوەندە کڵۆڵ‌و بەدبەخت بی ڤارینکا **گیان**، ئەی فریشتە چکۆلەکەم؟! چما تۆ لەو خانمانە کەمتری؟ چیان لە تۆ زیاترە؟ تۆ کەسێکی میهرەبان، جوان‌ولەبەر دڵان، خوێنەوارو ڕۆشنبیر، بۆچی دەبێ ئەم چارەنووسە خراپەت هەبێ؟ بۆچی دەبێ خەڵکی باش هەمیشە لە بەدبەختیدا بژین، لە کاتێکا بەختەوەری بەپێی خۆی دوای خەڵکانی دی

دەکەویّ؟ ڤارینکا گیان من دەزانم ئەم بیرکردنەوەیە باش نیە، ئەم جۆرە بیرکردنەوەیە حەرامە، کوفرە، بەلاّم من لە کانگای دلّەوە دەپرسم، راستگۆیانە دەپرسم، بۆچی خەلّکانێك هێشتا لە سکی دایکیاندان بە ختەوەریان لە چارە بنووسریّو خەلّکانێکی دی لە هەتیوخانان بێنە دنیاوە؟

مەبەستم ئەمەیە کە زۆرجار بەخت لە دەرگەی گەوجێك دەدات. وەك ئەوەی کەسێك بێتو بلێت: "تۆ، ئیڤان، دەست بخەسەر سەروەتو سامانی بابو باپیرانت، خۆش بخۆ، خۆش بخۆرەوە، شادو خورەم بژی، بەلاّم تۆ هەر ناوێکت هەیە، تەنیا بۆت هەیە دەمو لەوست بلێسیتەوەو بەشو بەهرەت لەم دنیایەدا هەر ئەوەیە بەندەی خودا! " من دەزانم ڤارینکا گیان ئەم بیرکردنەوانە گوناحە، گوناحێکی گەورەیە، بەلاّم هەندێجار لەم حالّەتانەدا، گوناح خۆبەخۆ دزە دەکاتە ناو دلّی مرۆڤەوە.

ئازیزەکەم چبکەم، حەزم دەکرد تۆش سواری یەکێك لەم گالیسکانە بوایەی. ئەگەر خودانی ئەو جۆرە گالیسکانە بوایەی، تەنانەت جەنەراڵانیش بە تاسەی نیگایەکی بە خێری تۆوە دەبوون، بەلّیّ جەنەڕاڵان نەك خەلّکانی رووتەی میناکی من، هەنگیّ جلو بەرگی ئاوریشمو زێڕت لەبەر دەکرد، نەك ئەم خەرقەو پەلاسانەی ئێستا لەبەری دەکەی، هەنگیّ وەکو پەیکەری پەریانی خۆش قەلاّفاتو هەیکەل، تەڕو تازە، بە داروبار، گۆنا پڕ ڕی گوڵناسا دەردەکەوتی، نەك وەکو ئێستا باریکو بنێسو لەشبەبار. هەنگیّ تاقە شتێك کە منی **خۆشحالّ** دەکرد ئەوە بوو کە لە جادەیەکدا، لە پەنجەرەی گالیسکەکەتەوە نیگایەکی تۆم کردبا، یان نیگایەکی سێبەرەکەتم بکردایە، ئەوەندەم بەس بوو تۆ بە

شادی بدینم، چونکە شادی تۆ منی شادو خورەم دەکرد ئەی باڵندە چکۆلە جوانەکەم.

بەڵام تۆ تەماشا، ئێستا لە چ وەزعو حاڵێکایت؟ نەك هەر خەڵکانی بەدخواو ڵرەش‌و گەندەڵ، وێران‌و داماوو کڵۆڵیان کردویت، بەڵکو سەرباری ئەوەش پیاوێکی خوێڕی بێ قیمەت، هیچو پوچو بێ شەرەف، دێتە سەرت‌و لە ماڵەکەی خۆتدا سوکایەتیت پێدەکات‌و بۆی دەچێتە سەر، تەنیا لەبەر ئەوەی چاکەتێکی جوانی پڕ بە بەری لەبەردایە، لەبەر ئەوەی عەینەکێکی چوارچێوە زێڕی لە چاودایە، هەموو شتێك بۆ ئەو رەوایەو تۆ دەبێ بەویەڕی نەرمکێشییەوە گوێ لە قسە سووکەکانی بگری! من دەڵێم بەسە!

و بۆچی دەبێ وابێ؟ هەر لەبەر ئەوەی **تۆ** هەتیوی، بێ پشت و پشتیوانی، هەر لەبەر ئەوەی دۆستێکی بەتوانات نیە کە شەریفانە بتپارێزێت!

**ئاخر** ئەمە چتۆ بەشەرێکە، ئەو خەڵکانە چتۆ بەشەرێکن کە سووکایەتی بە هەتیوێکی هەژاری بێنەوای وەکو تۆ دەکەن و هەر مێشیشیان میوان نیە؟!

ئەو خولاّم و خوبزەو ناکەس بەچانە بەشەر نین، ئەوانە... وا دەنوێنن کە شتن، بەڵام لە راستیا هیچ نین، من دڵنیام کە هیچ نین. ئەوە حەقیقەتی ئەو خەڵکەیە!

بە بۆچوونی من، **ئەو** تۆرگ ژەنەی کە ئەمڕۆ لە شەقامی گوروخوفیا دا دیتم، زۆر لەو خەڵکانە شایستەترو هەژی ترە.

راستە لە بەیانیەوە تا ئێواریٚ خۆی بە شەقامەکاندا بکێش دەکات و ئۆرگ دەژەنیٚ تا چەند کوپێکێکی دەست بکەویٚ و لە برساندا نەمریٚ، بەلاّم ئاغای خۆیەتیو بەرەنجی شان نانی خۆی پەیدا دەکات و سوالٚ و سەدەقەی لە کەس ناویٚ، زەحمەت دەکێشێت، رەنج دەداتو خەلٚکی سەرگەرم و دلٚخۆش دەکات، یانی هاوار دەکات:" وەرن، هەر چیم لە تواناندا بیٚ دەیکەم تا سەرگەرم و دلٚخۆشتان بکەم."

راستە دەستکورت و هەژارە، نکولٚی لەمە ناکرێت، بەلاّم هەژارێکی ئابڕومەندو سەربەرزە.

**راستە** شەکەت و ماندووە، سەرما گالٚەی پێدەکات، مۆخی بەدەنی دەچاێنیٚ، بەلاّم کاردەکات، بە شێوەی تایبەتی خۆی کاردەکات، رەنج دەدات.

بەلٚیٚ، دایکەلیٚ، لەم بابەتە خەلٚکە سەربەرز و ئابڕومەندانە زۆر هەن، ئەگەرچی لەچاو ئەو هەولٚ و رەنجەی دەیدەن، دەستکەوتیان زۆر کەمە، بەلاّم دەست لە کەس پان ناکەنەوە، سەر بۆ کەس دانانەوێنن،خێرو سەدەقە لە کەس قەبولٚ ناکەن.

من یەکێکم لەو بابەتە خەلٚکە. **منیش** وەکو ئەو کابرا ئۆرگ ژەنەم. مەبەستم ئەوە نیە کە دەقاو دەق وەکو ئەوم، بەلاّم منیش بە جۆرێك لە جۆرەکان لەو دەچم، سەربەرزانە رەنج دەدەم، بە گوێرەی توانای خۆم رەنج دەدەم، زەحمەت دەکێشم و هەر کارێکم لە دەست بیٚ دەیکەم، دەزانم ئەو کارەی دەیکەم زۆر نیە، بەلاّم هەر ئەوەندەم لە تواناداـیە.. لەوەی پترم پێناکرێت.

بۆیە باسی ئەو پیاوە ئۆرگ ژەنەم کرد، چونکە ڤارینکا گیان ئەمڕۆکە، لە هەموو کاتێ پتر هەستم بە هەژاری و باری قورسی هەژاری خۆم کرد.

لە جێی خۆ وەستام و کەوتمە تەماشای کابرای ئۆرگ ژەن. زۆر بیری رەشبینانەم بە مێشکدا هات، جا بۆ ئەوەی ئەو بیرو خەیاڵانە لە خۆم بتارێنم رێك لە بەرامبەریا وەستام و کەوتمە تەماشا کردنی. جگە لە من چەند کەسێکی دیکەش لە دەوری خڕ بووبوونەوە، لەوانە چەند عەریانچیەك، چەند سۆزانیەك، کیژۆڵەیەکی بچووکی پیس و چەپەڵی شڕوشپڕێوی قژ بژن.

یارۆی ئۆرگ ژەن لەبەر پەنجەرەی ماڵێکا وەستابوو، کوڕیژگەیەکی تەمەن دە ساڵ سەرنجی **راکێشام** کوڕێکی شێوەو سیما جوان بوو، بەڵام نەخۆش و لەشبەبار دەهاتە بەرچاو: باریکەلەیەکی لەڕو لاواز بوو، بە تونێ تاقە کراسێك و بە نیمچە پێ خواسی بەدیار یارۆوە وەستابوو وبە واقی وڕوو زاری داچەقیوەوە گوێی لە مۆسیقا دەگرت.چەند منداڵێکی بێنەوا بوو!

بە سەرسامی دەیڕوانیە ئەو بوکەڵە ئاڵمانیانەی کە بەسەر ئۆرگەکەوە دەرەقسین، دەست و پێی لە سەرما تەزی بوون و هەڵدەلەرزی، وسەری قۆڵێکی کراسەکەی دەچوو. سەیرم کرد پارچە کاغەزێکی بچووکی بە دەستەوەیە. ئاغایەك بەلاماندا رەت بوو، وپارچە دراوێکی کەم بەهای بۆ کابرای ئۆرگ ژەن هەڵدا، پارچە دراوەکە رێك کەوتە نێو ئەو پاکەتەی بەردەم کابرای ئۆرگژەنەوە...

کە کوڕیژگەکە گوێی لە **دەنگـــی** کەوتنی دراوەکە بوو، نیگایەکی ترسامێزی دەوروبەری خۆی کرد، وایزانی من دراوەکەم هەڵداوە. بەلەز

بەرەو لای من هات، بە دەستی لەرزان پارچە کاغەزەکەی بۆ درێژ کردم و بە دەنگێکی لەرزۆك گوتی:" ئەمە بخوێنەوە ! "

**کاغەزەکەم** کردەوەو خوێندمەوە. هەمان شتی هەمیشەیان تێدا نووسی بوو:" ئاغای خێرەومەند، دایکێك ومنداڵەکانی لە حاڵی مەرگدان، ئەم دایکە سێ منداڵی هەن و هەموویان برسین،جا ئەگەر دەتوانی بە لوتفی خۆت کۆمەکمان پێ بکەو منداڵە چکۆلەکانم لە بیر مەکە،و منیش کە مردم لەو دنیا تۆ فەرامۆش ناکەمو دوعای خێرت بۆ دەکەم ئاغای خێرەومەند." ئەمە ئاساییە، حاڵەتێکی باوو بڵاوە، بەڵام من چم لە دەست دێ، چم هەیە بیاندەمێ؟ هیچم نەداێ. مەگەر خودا بزانێ چەندم دڵ بەم کورێژگەیە سوتا ! چەندم بەزەیی پێدا هاتەوە !

بەستەزمانە دەموچاوی لەسەرما شین **بوو** بووەوە، هەڵبەتە برسیشی بوو، درۆی نەدەکرد، بەڵێ، درۆی نەدەکرد، بەچاویا دیار بوو درۆی نەدەکرد، من کەمۆکەیەك سەر لەم شتانە دەردەکەم.

بەڵام ئەوەی مایەی نیگەرانیە کە ئەم دایکانە چاودێریو سەرپەرشتی منداڵەکانیان ناکەن،و بەم سەرماو سۆڵەیە، بەنیمچە رووتی،و بە پارچە کاغەزێکەوە بەرەڵای سەر شەقامەکانیان دەکەن. ڕەنگە دایکەکەی کەرە ژنێکی بێ نموودی بێ شەخسیەت بێ‌و هیچ دەسەڵاتێکی نەبێت،و لەگینە کەسیشی نەبێت بچێت نانی بۆ پەیدا بکات، ئیدی دەستەو ئەژنۆ ماتو مەلولو خەمگینو نائومێد دادەنیشێت، لەوەشە بەڕاستی نەخۆش بێت.

بەڵام وێڕای ئەوەش دەیتوانی داوای کۆمەك لە **یەکێک** لە دەزگا پەیوەندارەکان بەو کاروبارانە، بکات. لەوەشە ئافرەتێکی درۆزنو کەڵەکچی بێ،ومناڵێکی رەشو رووتی برسی بەرەڵڵای نێو شەقامان

کردووە تا بەو جۆرە خەڵکی بخەڵەتێنێ‌و منداڵەکەش بەو مەردە بچێ.
ئاخر ئەم منداڵە بەڵەنگازە بە نیشاندانی ئەو پارچە کاغەزە بە خەڵکی،چی فێر دەبێ؟ چ پەندو دەرسێك لە ژیان وەردەگرێت؟ تەنیا دڵڕەقی فێردەبێ، بەرەڵلا دەبێ، دەست لە خەڵکی پان دەکاتەوە، دەرۆزە دەکات، خەڵکیش تیژ تێپەڕ بەلایدا دەڕۆن، نە ئاوڕی لێدەدەنەوە،ونە گوێی لێدەگرن.
ئەوان **خەڵکی** دڵڕەقن، بە قسەی رەق وەڵامی دەدەنەوە، دڵشکێنی دەکەن: "هەڕە، لاکەوە، گوم بە لەبەر چاوم، خوێڕی بەرەڵلا، بە تۆ کەر نابم!."
ئیدی ئەم جۆرە قسانە لە زاری خەڵکیەوە دەژنەوێ، ئیدی دڵی منداڵانەی رەق دەبێت، ڕقی لە هەموو کەسێك دەبێت. ئیدی ئەم منداڵە داماوە، ئەم بەڵەنگازە ترساوە، بەخۆڕایی لەبەر سەرما هەڵدەلەرزێ، لە تۆ وایە بێچوە پاسارییەکە، هێلانەکەی روخاوەو کەوتووەتە خوارەوە.
دەست‌و لاقی دەتەزێ، هەناسەی سوار دەبێت. ئیدی بەزووترین کات تووشی کۆکە دەبێت، دوای ماوەیەکی کەم نەخۆش دەکەوێ، نەخۆشی وەکو مار دەخزێتە ناو سینەودەرونی. جارێکی دی بیبینیتەوە سەیر دەکەی مەرگ لە سووچێکی بۆگەنی پیسدا بەگیری هێناوەو بەدیار سەریەوە باڵەفرێ دەکات، ئیدی کار لە کار دەترازێ‌و کەس بە هانایەوە ناچێت،..
ئیدی **ئەمە** حیکایەت‌و نەقڵی ژیانی ئەوە! ئیدی دەشێت ژیانی مرۆڤێك لەم دنیایەدا بەو جۆرە بڕوات! ئاخ ڤارینگا گیان!

چەند ناخۆشە کەسێك داوای خێرت لێبکات، بپاڕێتـەوەو "بیکـە بـەخاتری مەسیح"و تۆش بەڕێی خۆتا بڕۆیتو هیچی نەدەیتێ، پێی بڵێی:

"خودا بتداتێ". جا هەندێ پاڕانەوە تەحـەمول دەکرێ، دەشـێت گوێـت لێ بـێو بەهەنـدی نـەگری (پاڕانـەوەش زۆر جـۆری هەیـە ڤارینکـا گیـان) هەندێ پاڕانەوەی نەرمی ئاوازدار هەیە، پیـاو کـە گـوێی لێدەبێ، هەسـت دەکات ئەمە پاڕانەوەی باوی سەر زاری گـەدایانی هەمیشـەیی‌و پیشـەییە، ئەزبەریان کردووە. جا سەبارەت بەمانـە، **پیاو** ئەگـەر هیچیشـیان نـەداتێ، زۆری لەبـەر گـران نیـە، چـونکە ئەمانـە دەرۆزەیـان کـردووە بـە پیشـە، دەگەڵ ئەو ژیانەدا ڕاهاتوون، پیاو لە دڵی خۆیدا دەڵێـت ئەمانـە دەتـوانن تەگبیری حـاڵی خۆیـان بکـەن،دەزانن چـۆن مشـوری خـۆ بخـۆنو خـۆ لـە ئاستەنگان دەرباز بکەن.

**بـــەڵام** هەنـدێ سـواڵکەری دی هـەن، هەسـت دەکـەی تـازەکورەن، لـە پیشەکە نازانن، دەنگـو پاڕانەوەکـەیان زیـرو بگـرە ترسناکیشـە ئەمڕۆکـە من بە چاوی خۆم یەکێك لەو نموونانـەم بینـی. کـاتێ خـەریك بـوو پارچـە کاغەزەکەم لە کورێژگەکە وەردەگرت، کابرایەك لـە دوور شـەقاوی مـنو لـە پاڵ پەرژینێك وەستابوو، خۆی بۆ پارە وەرگرتن لە خەڵکی نابووەوە، لـە پڕ بەرەو من هاتو گوتی:

"ئاغا لە ڕای مەسیح، لە ماڵی خودا پێنج کوپیکانم بدەیە."

دەنگـی هێنـدە زیـرو بـێ ئەدەبانـە بـوو کـە هەسـتێکی ترسـناك ئـازای هەژاندم، بەڵام هیچم نەدایە، چونکە بـەخۆم هیچـم نـەبوو. دەبـێ ئـەوەش بڵێم کە دەوڵەمەندان حـەز ناکـەن هـەژاران بـە دەنگـی بـەرزو بـە ئاشـکرا گلەیی لە بەختی خۆیان بکەن. وادیارە ئەمە پەستو بێزاریان دەکات. بـە

هەرحاڵ کلۆڵیو هەژاری هەمیشە زەحمەتە،و مایەی بێزاریو پەستیە.
پێدەچێ ناڵەو کورپوزانەوەی هەژاران خەوی دەوڵەمەندان بزڕێنی!
ئەوی ڕاستی بێ ئازیزەکەم، بۆیە ئەم هەموو شتەت بۆ دەنووسم، تا یەکەم باری دڵو دەروونم کەمێك سووك بکەم،و دووەم تا شێوازی نووسینی خۆمت بۆ بنوێنم. ڕەنگە تۆش هەستت بەوە کردبێ کە ماوەیەکە شێوازی نووسینو دارشتنم باشتر بووە. **فێری** نووسین بووم.
جا وێڕای ئەوەش حاڵی حازر هێندە پەستو غەمگینم، کە لە ناخی دڵمەوە بەزەییم بەخۆدا دێتەوە، هەرچەند دەزانم ئەم بەزەیی بە خۆدا هاتنەوەیە،دادم نادات و هیچ شتێك ناگۆڕێت. بەڵام هەست دەکەم پیاو دەبێ جۆرە ئینسافێکی دەرهەق بە خۆی هەبێ. ئیدی ئەوە واقیعە دۆستە ئازیزەکەم. هەندێجار ڕێدەکەوێ خۆمان لەبەرچاوی خۆمان بچووك دەکەینەوە، خۆمان دەبوغزێنین، خۆمان بە هیچ نازانین،و ڕەنگە هەر لەبەر ئەمەش بێ کە ئەو هەموو ترسو نیگەرانیەم لێ نیشتووەو وەکو ئەو کورپێژگە کلۆڵە کە خێرو سەدەقەی لە من داوا دەکرد هەست دەکەم غەدرم لێدەکرێو بێکەس کوژم دەکەن.
با ئەمەت بە **فعووفە** بۆ روون بکەمەوە ئازیزەکەم، جاری وا هەیە کە بەیانیانی زوو بەلەز بۆ سەرکار دەڕۆم، سەرنجێکی شار دەدەم کە بەرە بەرە بێدار دەبێتەوەو لەجێ ڕادەبێو پێشوازی ژیان دەکات، دووکەڵی کارخانەکان بە ئاسماندا دەچێتو شەقامەکان وەکو مەنجەڵ دەکەونە کوڵو جۆشو هەراوجەنجاڵ هەموو شتێك دەگرێتەوە،و ڕێدەکەوێ ئەم نیمەنە لە خشتەم بەرێت، بەڵام لە پڕ وەکو ئەوەی پەلەپیتکەیەك بێو بەسەری کەپووەمدا بکێشرێ، بە پەلە پێ هەڵدەگرم، دوور دەکەومەوەو

هەست دەکەم زۆر بچووکم، ملی رێی خۆ دەگرمو بەخۆ دەڵێم ئەم ژیانە جەنجاڵە بۆ من دروست نەکراوە. **بەڵام** تۆ بیرێك بکەوەو لە خۆ بپرسە چ شتێك لەو دیوی دیواری دوکەڵاویو رەش هەڵگەڕاوی ئەم بینا بەردینە گەورانەدا روو دەدات. هەڵبەدە پەی بە نهێنییەکانی بەری، هەنگێ بە خۆت بۆت دەردەکەوێ کە ئایا من بە خۆڕایی ئەوەندە خۆم پێ بچووكو بێ بایەخو سەرگەردانو سەر لێ شێواوە یان نا!

تەمەشا ڤارینکا **گیان**، تۆ تەمەشا، من لێرەدا بە رەمز قسان دەکەم، نەك بە زمانو تۆنی راستەوخۆ، بۆیە نابێ قسەکەم وەکو خۆی وەربگیرێ. تۆ بڕوانە چ شتێك لەودیوی ئەو تەلارە بەرزانەوە پەنهانە؟

لەوێندەر، لە کونجێکی دوکەڵاویدا، لە دەخمەیەکی شێدارا، کە بە ناچاری پێی دەڵێن ماڵ، بابایەکی پیشەوەر لە خەو رادەبێ، بە درێژایی شەو هەر خەونی دیتوە، خەونی بەو پێڵاوەوە دیتووە کە دوێنێ بە هەڵە مقەستەکەی بەرکەوتووەو رووشاوە، کون بووە، سەیرە پیاو شەوێکی تەواو خەون بە شتێکی وا تورەهاتەوە بدینێ!

راستە ئەم پیاوە پیشەوەرە، پینەدۆزێکی بەلەنگازو هەژارە، هەقی خۆیەتی خەیاڵاتی شەوو رۆژی لەلای پیشەکەی خۆی بێ، منداڵەکانی هاواریانە، دەگرین، و هاوسەرەکەی لە برسانا سك دەگوشێت.

جا هەر پینەدۆزان نین کە بەم حاڵەتە دەروونییەوە لە خەو رادەبن، هەڵبەتە باسی ئەم مەسەلەیە، یان نووسین دەربارەی ئەم مەسەلەیە، هیچ نیە، و هیچ سوودێکی نیە، تەنیا ئەوە نەبێ کە شتێکی دیکە وەبیر دێنێتەوە، شتەکەش ئەوەیە کە لە هەمان تەلاردا، لە قاتی سەرووتر یان خوارتری ئەم قاتەدا، لە ژوورێکی زۆر پۆشتەو رازاوەدا، پیاوێکی زۆر

دەوڵەمەند دەژی، وەهەمان شەو خەوی بە جووتێك پێڵاوەوە دیتوە، راستە ئەو پێڵاوانەی ئەم خەونی پێوە دیتون، جیاوازن لەوانەی کابرای پینەدۆز خەونی پێوە دیتوون، رەنگە لە شێوەدا جیاواز بن، زۆر چاکتر بن، بەڵام هەرچییەك بن، هەر پێڵاون.

**بەڵام** ئەوەی من گەرەکمە بیڵێم ڤارینکا گیان، ئێمە هەمووومان، هەر کەسەو بە شێوەیەك، تا رادەیەکی دیاری کراو هەمان پینەدۆزین، ئەمەش گرینگ نیە، ئەوەی مایەی داخە کەسێك نیە بە گوێی ئەم گەوجەدا، ئەم پیاوە زۆر دەوڵەمەندەدا بچپێنێ و بڵێت: "فلانی شەرم نیە کە تەنیا بیر لەم شتانە دەکەیەوە، تەنیا لە خەمی خۆتدای، هەر بۆ خودی خۆت دەژی؟

تۆ کابرایەکی پینەدۆز نیت، **منداڵەکانت** هەموو ساغڵەم و سەلامەتن، ژنەکەت عەزرەتی پارەو نانێك نیە، سەرێ هەڵبڕەو تەمەشایەکی دەورووبەرت بکە، بەڵکو بیر لە بابەتێکی شەریفتر بکەیەوە، بابەتێکی شەریفتر لە پێڵاوەکانی خۆت؟"

ئەمە ئەو شتە بوو کە دەمویست بە زمانی رەمز بۆتی باس بکەم ڤارینکا گیان، رەنگە ئەمە هزرینێکی سەرکێشانەو توندڕەوانە بێت، بەڵام هزرێکە هەندێجار بەسەرما دێت و ناو بە ناو بە خەیاڵمدا تێدەپەڕێ، هەنگێ لە رێگەی وشەی توندەوەو بێ ویستی خۆم لە دڵم دێتە دەرێ.

کەواتە من هەڵە بووم کە خۆم بە کەم زانی، خۆم بە بچووك زانی، لە کۆتاییدا دەڵێم رەنگە وابزانی ڤارینکا گیان کە وڕێنە دەکەم، بوختان بە خۆمدا دەکەم، ئەم چیرۆکانە لە گیرفانی خۆمەوە دەردێنم، یان دەستەمۆی خەم و پەژارەو تووڕەیی بووم، یان هەموو ئەم قسەو باسانەم

لەم کتێب یان لەو کتێبەوە دەرهێناوە. نا، وانیە ئازیزەکەم دەبێ هەموو ئەم خەیاڵاتە لە مێشکی خۆت دەربکەی. من نە وڕاوە دەکەم نە بوختان بۆ خو دەکەم، هیچ شتێکیش لە گیرفانی خۆمەوە دەرنایەنم، توڕەو رەشبینش نیم، هیچ شتێکیشم لە کتێبانەوە دەرنەهێناوە. ئەمەی من دەیگێڕمەوە حەقیقەتە.

بەوپەڕی **خەمباری** بۆ ماڵ گەڕامەوە، لە پشت مێزەکەمەوە رۆنیشتم، قۆریەکەم نایە سەر سەماوەر کە دوو پیاڵە چایی بۆ خۆ دەم بدەم. رێك لەو کاتەدا، ئەم پیاوە بێنەوایەی کە لە هەمان تەلاردا نیشتەجێیە، واتا گورشکوف ، لێم وەژوورکەوت، پێشترو هەمان بەیانی بینی بووم کە بە دەوری دەرودراوسێکانی دیدا دەسوڕایەوە، و وام هەست کرد گەرەکیەتی بۆ لای من بێت. پێویستە ڤارینکا گیان زۆر بە کورتی پێت بڵێم کە وەزعوحاڵی ئەو زۆر لە من خراپترە !

زۆر، زۆر خراپترە: ژنو **منداڵی** هەیە ! ئەگەر من لە جێی گورشکوف بوایەم بەڕاستی نەمدەزانی چ بکەم. بە هەر حاڵ گورشکوف وەژوورکەوت، سڵاوی کرد، روندك وەکو هەمیشە لە چاوانیدا قەتیس مان، کەوتە ئەم پێو ئەوپێ کردن، پەریشانو پەشێو نەیدەتوانی قسە بکات. لە سەر کورسییەك دام نیشاندا. راستە کورسیەکە شکاوە، بەلاّم لەوە زیاترم نیە. چایەکم بۆ داکرد، لە هەوەڵەوە نەیدەویست چایەکەم لێوەربگرێ، شەرمی دەکرد، بەلاّم ئەنجام لێی وەرگرتم.

دەیویست بەبێ شەکر بیخواتەوە، کە **پێم** گوت بە قەندەوە بیخوات، هەمدیس رەفزی کرد، دەیگوت قەندی ناگەرەکە، ئەنجام پارچە قەندێکی بچووکی هەڵگرتو لە چایەکەی کرد، پاشان گوتی چایەکەم زۆر زۆر

شیرینە، تۆ تەمەشا هەزاری ئینسان تووشی چ زەبوونیەك دەكات! پێم گوت: "فەرموو، بڵێ دۆستی من!" گوتی:

"ماكار ئالكسیوڤیچ، دۆستی میهرەبان و خێرەوەمەند، حاڵ لەمەو حیكایەت لەوە، لە رای خودا پارمەتیەیەكی ئەم خێزانە كلۆڵە بدە، من ژن و منداڵم هەن، زەواد لە ماڵمدا نیە، برسین. من كە باوكم ناتوانم مناڵەكانم بە برسێتی ببینم." ویستم وەڵامی بدەمەوە، بەڵام دەرفەتی نەدام، نەیهێشت قسە بكەم، گوتی: "من لە هەموو ئەو خەڵكانەی ئێرە دەترسم ماكار ئالكسیوڤیچ، یانی مەبەستم ئەوە نیە كە بۆاستی لێیان بترسم، بەڵام لەروو دادەمێنم، خەجاڵەت دەبم. هەموویان خەڵكانی لوتبەرز و بە دەعیەن.

بە هەرحاڵ دۆستی **میهرەبان**، خێرەوەمەندو خاوەن چاكە، نەدەبوو تۆش ئیزعاج بكەم، چونكە دەزانم تۆش گیروگرفتی زۆرت هەیە، لە وەزع و حاڵێكا نیت كە بتوانی پارەیەكی زۆرم بدەیتێ، بەڵام بەلای كەمەوە سووكە قەرزێكم بدەیە، ئەوی راستی بێ من زاتم نەدەكرد ئەم جۆرە داوایەت لێبكەم، بەڵام دەزانم ئینسانێكی دڵاوا بە بەزەییت، دەزانم تۆش كەسێكی هەژار و دەستكورتی، دنیایەك نەگبەتی و بەدبەختیت بەسەر هاتووە، بۆیە بەزەییت لە دڵدایەو ئاگات لە دەردو مەینەتی خەڵكانی دی هەیە، ودەشێت بەزەییت پێیاندا بێتەوە...

لە ئەنجامدا داوای بووردنی لێكردم كە "پركێشی كردووەو بەم شێوە ناپەسندە رووی لێناوم." وەڵامم دایەوە پڕ بەدڵ حەزم دەكرد پارەم هەبوایەو یارمەتیم بدایە، بەڵام تاقە پولێكم نیە. گوتی: "ماكار ئالكسیوڤیچ، من پارەیەكی زۆرم ناوێ، مەسەلەكە تەنیا ئەمەیە كە

(لێرەدا دەموچاوی لە شەرماندا سوور هەڵگەڕا) ژنەکەمو منداڵەکانم برسیانە. ناتوانی تەنیا یەك دراوی دە کۆپیکیم بدەیتێ؟...

ئەم قسەیە وەکو چزوویەك بە دڵماچوو. لە دڵی خۆدا گوتم: ئەمانە لە منیش هەژارترو کڵۆڵترن. تەنیا بیست کۆپیکم لەو پارەیە پێ مابوو کە بە سلفە وەرمگرتبوو، دامنابوو سبەینێ کۆمەڵێك شتی یەجگار پێویستی بۆ خۆم پێ بکڕم. گوتم: "نا، نا، دۆستی ئازیز، بەداخەوەم... مەحاڵە، ناتوانم..." گوتی: "ماکار ئالکسیوڤیچ. برادەری ئازیز، شتێکم بدەیە...

ئەگەر دە کۆپیکیش بووە هەر باشە." ئیدی لەوەی پتر خۆم پێنەگیرا، بیست کۆپیکەکەم لە دەخیلەکەم دەرهێناو دامێ... ئەمە کاری خێری ئەمڕۆی من بوو، ئایا خراپم کردووە ڤارینکا گیان؟ ئاخ هەژاری!

کە دەردێکی گرانی، دوای ئەوە کەوتینە قسان، لێم پرسی: " دۆستی ئازیز، چۆن کەوتویتە ئەم فەلاکەتە،و چۆن بەم دەستکورتیە، ژوورێکت گرتووە کە مانگی پێنج ڕۆبڵی زیو کرێکەیەتی؟" ئیدی بۆی گێڕامەوە کە شەش مانگ لەوە پێش ئەو ژوورەی بە کرێ گرتووەو پێشەکی سێ مانگیشی داوە، دوای ئەوە بەخت بە جۆرێ لێی هەڵگەڕاوەتەوەو بە رادەیەك وەزعو حاڵی خراپ بووە نازانێ روو بکاتە کوێ!.. ژارۆ!.. بە ئومێد بوو کە لەم ڕۆژانەدا فایلەکەی تاوتوێ بکرێو مەسەلەکەی چارەسەر بکرێ. بەڵام فایلەکەی زۆر ئاڵۆز بووە..

تەسەور بکە ڤارینکا، ناچارە لەم دادگاوە بۆ ئەو دادگا بچێت. لەگەڵ بازرگانێکا کێشەی بۆ دروست بووە، کە لە قۆنتەراتێکا ساختەچێتی کردووەو دزی لە دەوڵەت کردووە. ئیدی ساختەچێتییەکەی لێ ئاشکرا بووەو کابرای بازرگان دەستگیرکراوەو دراوە بە دادگا، ئیدی گورشکوفی

لەگەڵ خۆیدا تێوەگلاندووەو ئەویش گیرۆدە بووە، هەرچەندە ئەم نەگبەتە راستەوخۆ بەشداری لەو کارەدا نەکردووە، مەگەر خەتاکەی هەر ئەوەبێ کە ئاسانکاری کردووەو بە باشی ئاگاداری ماڵی دەوڵەتو بەرژەوەندیەکانی دەوڵەتی نەکردووە.

**ئێستا** چەند ساڵێکە ئەم دۆسیەیە بەردەوامەو تا ئێستا قازیەکان یەك لاییان نەکردووەتەوە،و ناو بە ناو شتی تازە سەر هەڵدەداتو گورشکوف هەرچی دەکاتو دەکۆشێت ناتوانێ ئەم تۆمەتو تاوانە لە یەخەی خۆی بکاتەوە.

گورشکوف بەو پەڕی متمانەوە بۆی گێڕامەوە،و **گوتی**: "من ئەو کارە دزێوەم نەکردووە کە داروەتەپاڵم، لەم رووەوە هیچ تاوانێکم نیە، نە دزیم کردووە،و نە خیانەتم بە ئامانەت کردووە" ئەم مەسەلەیە زیانێکی زۆری لێداوە، لەکەداری کردووە. لە وەزیفە دەرکراوە، هەرچەندە هیچ تاوانێکی دیاریکراوی لەسەر نەبووە بە ماڵو ساغ نەبووەتەوە، تا بە تەواوەتی تەبرێ نەبێت ناتوانێ ئەو قەرزەی لەسەر کابرای بازرگان هەیەتیو کابرا لە دادگادا حاشای لێدەکات، وەریگرێتەوە.

من باوەڕ بە قسەکەی دەکەم، بەڵام مەخابن دادگا باوەڕی پێناکات. ئەمە یەکێکە لەو دۆزە هەرە ئاڵۆزو، بە لقو پۆپ،و تێکچڕژاوو بەگرێ کوێرانەی کە بە ئاسانی ناکرێتەوە.

هەرکە لایەنێکی رۆشن دەبێتەوەو گرێیەکی دەکرێتەوە خێرا کابرای بازرگان فێڵو دەمۆیەکی زیرەکانەی تازە دێنێتە پێشێ. راستیت گەرەکە ڤارینکا گیان من هاوخەمی گورشکوف—م. دەزانم چ حاڵو رۆژگارێکی نالەباری هەیە، بەزەییم پێیدا دێتەوە. کابرایەکی بەلەنگازی بێ کارە،

هیچ کەسێك کاری ناداتێ چونکە نێوی زڕاوە، کەس متمانەی پێناکات. هەرچی پاشکەوتێکیان هەبووە خەرجیان کردووە. دەعواکەشی ڕۆژ بە ڕۆژ ئاڵۆزتر دەبێت و درێژە دەکێشێت.

لە کاتێکا پێویستیان بەشتێکە پێی بژین، کەچی لەم کاتەدا منداڵێکی تازەیان دەبێت، خۆ منداڵی تازە گاڵتە نیە، مەسرەفی دەوێ.

کوڕە نەخۆش دەکەوێ، ئەمەش مەسرەفێکی تری دەوێ، دایکەکە نەخۆشە، کابرا بە خۆیشی نەخۆشیەکی کۆن و بە درێژای لەگەڵە، ئیدی ئەم پیاوە داماوە لە عەزابێکی **خراپ** دایە. بەڵام دڵنێت بە تەمایە لە چەند ڕۆژی ئایندەدا دەعواکەی چارەسەر ببێ و ئەستۆپاکی و بێتاوانی ساغ ببێتەوەو گوایە لەمە دڵنیایەو هیچ گومانێکی نیە، ڤارینکا گیان زۆرم بەزەیی پێیدا هاتەوە، دڵ خۆشیم دایەوەو میهرەبانیم لەگەڵ کرد. ورەم بەرز کردەوە، مرۆڤێکی گۆشەگیری دەسەپاچەی هەراسانە، پێویستی بە کەسێکە چاوی تێوە بێ، بۆیە میهرەبانیم دەگەڵ کردو دڵخۆشیم دایەوە. ئێ بە دوعا دایکەڵێ، خودا ڕاوەستاوت بکات، لەش بەبار نەبیت. کۆترەکەم کە بیر لە تۆ دەکەمەوە، تۆم بیر دەکەوێتەوە، دەڵێی هەتوان لە ڕوحی زامدارم **دەدەن**، هەر ئازارێك لە پێناوی تۆدا، مایەی سوکنایی دڵ و دەروونی منە.

*دۆستی دڵسۆزت*

*ماکار دیڤشکین*

***ئازیزەکەم ڤرڤارا ئالکسیوڤنا*** **٩/١**

ئێستا کە ئەم نامەیەت بۆ دەنووسم، یەجگار پەرێشانم، ئاگام لە خۆ نیە، ئەمڕۆ شتێکی هێندە سامناکم لێ قەوماوە، تەواو نیگەران و پەرێشانی کردووم. سەرم دەسووڕێت، هەموو شتەکان لە بەرچاوم دەرەقسن.

ئاه دۆستە ئازیزەکەم نازانم چۆن بۆتی بگێڕمەوە! کەس باوەڕی نەدەکرد ئەمە روو بدات، کەس پێشبینی ئەمەی نەدەکرد. بەڵام نا، باوەڕ ناکەم بە خۆم پێشبینیم نەکردبێ! دڵم خەبەری دابوو! تەنانەت شەوی پێشتر خەوێکم بە هەمان نێوەڕۆکو دیتبوو. جا ئێستا گوێ بگرە تا رووداوەکەت بۆ بگێڕمەوە!

زۆر بە سادەیی، بێ هیچ رتوش و شێوازبازیەک، بە هەمان ئەو وشانەی خودا لە مێشک و دڵمی دەنێت، بۆتی دەگێڕمەوە. ئەمڕۆ چووم بۆ دایەرە، لە شوێنەکەی خۆم دانیشتم و دەستم بە نووسین کرد.

دەبێ ئەوەش بڵێم ڤارینکا گیان کە دوێ شەویش هەر خەریکی نووسینەوە بووم. دوێنێ تیموڤێ ئیڤانوڤیچ بە خۆی هاتە لام، قەواڵەیەکی بە پەلەی دامێ و فرمانی پێکردم و گوتی: "ماکار ئالکسیوڤیچ ئەم بەڵگەنامەیە دەبێ ئەمڕۆ ئیمزا بکرێ.

بە پەلە، بە وردی و بە پاکی بینوسەوە". هەڵبەتە دەبێ ئەوەش بڵێم فریشتە چکۆلەکەم، من دوێنێکە زۆر پەرێشان و نیگەران بووم.

لە گیانی خۆم بێزار بووم، هێندە پەستو غەمگین بووم تاقەتو زەوقی هیچ کارێکم نەبوو. تەنانەت سەیری دەورو بەری خۆیشم نەدەکرد، دڵساردو نائومێد، دەروون تاریكو پەرێشان، جگە لە تۆ ئەی باڵندە **چکۆلەکەم** بیرم لە هیچی دی نەدەکردەوە. دەستم بە نووسینەوەی قەواڵەکە کرد، دەقەکەم زۆر بە جوانیو بە باشی، بێ هیچ عەیبێك نووسییەوە. بەڵام...

نازانم چۆنت بۆ باس بکەم؟ نازانم کاری ئەهریمەن **بوو** ئەوەی پێکردم؟ یان دەستی پەنهانو نادیاری تەقدیر لە کارەکەدا بوو، یان مەسەلەکە رێکەوتی رووت بوو؟ بە هەرحاڵ بەدەم نووسینەوەوە یەك دێڕی تەواوم پەڕاندبوو. ئیدی مانای دەقەکە مەگەر هەر خوا بزانێ چۆن شێوا بوو، پیاو راست بڵێ هیچ مانایەکی نەدەدا..

بە هەرحاڵ دوێنێ درەنگ کەوتبوونو قەواڵەکەیان بۆ ئیمزا نەنارد بوو، **ئەمرۆکە** بۆ ئیمزای حەزرەتی سەرۆکیان ناردبوو. ئەم بەیانیە وەکو جاری جاران بێ خەمو خەیاڵ چووم بۆ سەر کارەکەی خۆم، لە تەنیشت (ئیمیلیان ئیڤانوڤیچ)ەوە لە جێگاکەی خۆم دانیشتم. هەڵبەتە پێویستە ئەوەت پێ بڵێم ئازیزەکەم ماوەیەکە زۆر لە جاران پتر هەست بە شەرم دەکەم،هەست بە جۆرێك لە پەریشانیو نیگەرانیو ترسی بەردەوام دەکەم، تەنانەت رووم نایەت سەیری هاوکارەکانیشم بکەم، خۆم لە نیگاو روانینان دەدزمەوە. وام **لێهاتووە** هەر کە گوێم لە جیڕەی کورسی یەکێك لە هاوکارەکانی تەنیشتم دەبێ، خەریکە لە ترسانا دەمرم. جا ئەمرۆکە بەم حاڵەتە دەروونییەوە، لەسەر کورسیەکەی خۆم هەڵکورما بووم،سەرم داخستبوو،ومیناکی ژیشك چوو بوومە قاوغەکەی خۆم.تەنانەت یفیم

ئاکمیوڤیچ (کە لە نامەردی دا تاکی نیە) بە دەنگێك کە هەمووان گوێیان لێ بێ گوتی:

"ئەم بەیانیە تەواو نیت، زۆر پەریشانو هەراسان دیاری ماکار ئالکسیوڤیچ، دەموچاوت زۆر گۆڕاوە، ها، ها، ها!..."

بە جۆرێ دەمەلاسکێی کردمەوە، هەر هەموو ئەوانەی بەتەنشت ئەوەوە یان بەتەنیشت منەوە بوون، بە جۆرێ لە قاقای پێکەنینیان دا خەریك بوو دەبورانەوە. هەڵبەتە بە من پێدەکەنین!...

بێ ئەوەی لە ڕوو دابمێنن هەر پێدەکەنینو پێدەکەنین! منیش پتر خۆم گرمۆڵە کردو قامکم لە گوێچکەکانم ڕاکردو چاوانم نوقاندنو بەو دەقەوەو بێ جۆڵە لە شوێنەکەی خۆم دانیشتم. جا من فێرم لە کاتی وادا، واهی بکەم، بەو شێوەیە زووتر دەستبەردارم دەبن. لە پڕ گوێم لە دەنگە دەنگێك بوو، گوێم لە دەنگی خێرای پێ بوو کە بە ڕاڕەوەکەدا دەهاتودەچوو. گوێم لە، ڕاست درۆ!

ناوی خۆم بوو، یەکێك منی گاز دەکرد، بانگی دەکرد دیوفشکین! دڵم داخورپا، ترسێکی سەیرو بێهودە دایگرتم.

بە خوێشم نازانم لەچیو بۆچی لەو ساتەدا ئەوەندە ترسام؟ ڕاستت دەوێ بە عەمراتم ئەوەندە نەترسا بووم. خۆم لە گێلی دا وەکو ئەوەی هیچ رووی نەدابێ، هەر لەوێش نەبم، زیاتر خۆم بە کورسیەکەمەوە قرساند.

بەڵام دەنگەکە بەرزترو نزیکتر بووەوە، ئەنجام لە پەنا گوێم دا گوتی: "دیوفشکین، دیوفشکین! دیوفشکین لە کوێیە؟" سەرم هەڵبڕی، یفستافی ئیڤانوڤیچ بە دیارمەوە وەستابوو، گوتی: "ماکار ئالکسیوڤیچ

هەر ئێستا برۆ بۆ لای حەزرەتی سەرۆك! هەڵەت لە نووسینەوەی دەقی قەواڵەکەدا کردووە!"

هەر ئەوەندەی گوت، بەڵام ئەوەندە بەس بوو.. وانیە ڤارینکا گیان؟ بەڵێ بەس بوو ئەولا تریش! لە جێی خۆم وشك بووم، دەمم چووە کلیلە، دەتگوت بریسکە لێی داوم، ئازام سڕ بوو.

لە جێی خۆ هەستام، **کەوتمە** ڕێ، دەتگوت ئامێرێکی بێ گیانم، پتر لە مردوو دەچووم تا زندوو. سێ دانە ژووریان پێ بڕیم تا گەیاندمیانە ئۆفیسەکەی حەزرەتی سەرۆك. لە پڕ خۆم لە بەردەمیا بینییەوە. مەحاڵە بتوانم باسی ئەو بیرانەت بۆ بکەم کە لەو ساتەدا بە مێشك و خەیاڵمدا هاتن. پێم وایە لە شپرزەییدا. بیرم چوو سڵاویش بکەم. دەتگوت شێتم، لێوم تەتەڵەی دەکرد، لاقەکانم دەلەرزین، نەهەقم نەبوو ڤارینکا گیان. چونکە یەکەم شەرمم لە خۆ دەکرد.

بەڕێکەوت بە دەستە ڕاستما ئاوێنەیەکم بینی، **کە** خۆمم بەو وەزعو حاڵەوە بینی ئەقڵم لە کەللەدا نەما.و دووەم من هەمیشە هەوڵم داوە بە بێدەنگیو گومناوی کاری خۆ بکەمو سەنجی کەس بەلای خۆدا ڕانەکێشم،وکەس نەمبینێو نەمناسێت، وەکو ئەوەی لەم دنیایەدا نەبم، بۆیە بە مەزەندەی خۆم حەزرەتی سەرۆك، نەیدەزانی کە من لە دایەرەکەی ئەودا هەم یان نیم، لەوەیە ناوی دیوفشکینی وەکو فەرمانبەرێك بە شێوەیەکی ڕەوتەنی بەر گوێ کەوتبێ، بەڵام قەت سەرو سەختی دەگەڵ مندا پەیدا نەکردووەو **هیچ** بایەخێکی بە منو کاروباری من نەداوە. حەزرەتی سەرۆك بە تۆڕەیی دەستی پێکرد: "بۆچی ئەمەت کردووە ئاغا؟ چاوت لە کوێ بووە؟ ئەم قەواڵەیە زۆر گرینگەو من

پێویستم پێیەتی‌و تۆ تێکت داوە، ئاخر بۆ ئەمەت کردووەو حەواست لە کوێ بووە؟ ها؟" هەنگێ حەزرەتی سەرۆك رووی کردە یفستافی ئیڤانوڤیچ، کۆمەڵێك وشەی بە تەمتومان‌و پچڕ پچڕم بەر گوێ کەوت:

"خەمساردی! بێ موبالاتی! تۆ گۆبەندمان بۆ دەنەیتەوە!" نازانم بۆچی لە پڕ زارم کردەوە، دەمویست عوزرخوایی بۆ بێنمەوە، داوای بوردن بکەم، بەلأم وشەم لێ چوو بوونە قاتی، هیچ قسەیەکم بۆ نەدەهات. دەمویست هەڵێم، بەلأم زاتم نەدەکرد لە جێی خۆ ببزووم.وەهەنگێ...

هەنگی ڤارینکا گیان، شتێك رووی دا، هێندەم لە دڵگران بوو کە تەنانەت ئێستاش دەمەوێ بینووسم‌و بیگێڕمەوە، لە شەرمەزاریدا قەڵەکەم لە دەستم دەکەوێ. یەکێك لە دوگمە فلزیەکانم، نەفرەت لە دوگمە، کە بە داوێکی قرچۆکەوە بەجێی خۆیەوە ئاوێزان بوو، لە پڕ پچڕایەوە (وابزانم لە پەشۆکاویدا دەستم بەری کەوتبوو) کەوتە سەر زەوی‌و بە هەڵبەزو دابەز کەوتە سوڕانەوەو بە زڕەهۆڕ وەکو ئەوەی زەنگ بێ، بە ژوورەکەدا خولایەوەو خولایەوە تا رێك لە بەر پێی حەزرەتی سەرۆکدا گیرسایەوە. ئەمە لە کاتێکا رووی دا کە هەر هەموو ئەوانەی لەوێندەر بوون، کپوکپ‌و مات‌و بێدەنگ بوون! ئیدی هیچ ئومێدێکم نەما کە عوزرم لێ قەبوڵ بکرێ، کە هەر بتوانم عوزرخوایی بکەم، یان هۆی کەمتەرخەمی‌و هەڵەکەم روون بکەمەوە. هەر هەموو ئەموو شتانەم بیرچوونەوە کە دامنابوون بە حەزرەتی سەرۆکی بڵێم!

رووداوەکەی دواتر ترسناکترو خراپتر بوو. لە پڕ جەنابی پایەبەرز سەرنجی لەسەر بیچم‌و هەیئەت‌و جل‌و بەرگەکەم گیرسایەوە.

لەو ساتەدا سەرو سیمای خۆمم، کە لە ئاوێنەکەدا دیبوو، بیر کەوتەوە. بەلەز وەکو ئەوەی شێت بووبم، بەلەز تەکانم دا کە دوگمەکە هەڵگرمەوە! دانەویمەوەو هەوڵم دا دوگمەکە هەڵگرمەوە، **بەڵام** پیرە دوگمە لە دەستم دەرپەڕی‌و کەوتەوە خولانەوە،و بۆم هەڵنەگیرایەوە. ئیدی هەستم کرد خەریکە هێزم لەبەر دەبڕێت، ئیدی هەموو شتێکم لە دەست چوو، بۆ هەتا هەتایە لە دەستم چوو، ئابڕوم چوو بوو، کەرامەتم نەمابوو، هەر لە بەشەریەت کەوتبووم!

هەستم کرد، هەرەسم هێنا، کەوتم، بێ هیچ هۆیەك گوێم بە کۆمەڵێك ڕستەی نامۆ دەزرینگاوە، بە دەنگی تیریزو دەنگی فالدونی دەزرینگایەوە. ئەنجام بە هەرحاڵێك بوو دوگمەکەم هەڵگرتەوە، **هەستامەوە**، پشتم ڕاست کردەوە. بریا لە جێی خۆم رەق راوەستابام‌و جوڵەم نەکردبا، بەڵام نا...

وام نەکرد، بەڵکو بەربوومە پیرە دوگمەو دەمویست بە داوە پچڕاوەکەی خۆیەوەی بکەمەوە، لە تۆ وایە دەشێت بە جێگاکەی خۆیەوە بکرێتەوە.

سەرباری ئەمەش بزەم دەکرد، بەڵێ بزەم دەکرد. سەرۆك لە هەوەڵەوە رووی وەرگێڕا، بەڵام دوایی دووبارە نیگای کردمەوە، گوێم لێ بوو بە یفستافی ئیڤانوڤیچی دەگوت: "ئەمە چیە؟ تۆ هەیئەت‌و قەلافاتی دەبینی؟

چی لێقەوماوە، بۆچی وایە؟" ئاە ڤارینکا **گیان** چەند نارەحەت بووم! گوێم لێ بوو یفستافی ئیڤانوڤیچ دەڵێت: "پێشینە یەکی زۆرباشی هەیە هەرگیز پێی خوار دانەناوە، رەفتاری زۆر باش بووە، موچەیەکی باش، لە قەد پلەو پایەی خۆی وەردەگرێت." حەزرەتی سەرۆك گوتی:

"ناتوانی سلفەیەکی بدەیتێو تۆزێ پارمەتی بدەی؟" یفستافی ئیڤانوڤیچ وەڵامــی دایــەوە: "ســلفەی وەرگرتــووە. پێشــەکی چــەندین مــانگی وەرگرتووە، رەنگە گرفتی خۆی هەبێ، بەڵام هەمیشە رەفتاری باش بووە. پێشنەیەکی باشی هەیە، پێشینەیەکی بێ عەیب، رۆژێ لە رۆژان کەس گلەیی لێی نەبووە.

" فریشتە **چکۆلەکەم** هەستم بەگەرمایەکی زۆر کرد، سووتام، دەتگوت دەرگای دۆزەخیان بەروودا کردوومەتەوە! لە دڵی خۆدا دەمگوت لە شوێنی خۆدا دەمرم. سەرۆک بە دەنگی بەرز گوتی:

"باشە. سەر لە نوێ بینووسنەوە، بەڵام بەپەلە! دیوفشکین وەرە ئێرە، ئەم کاغەزە دووبارە بنووسەوە، بەڵام ئەمجارە بەبێ هەڵە، ئا..." لێرەدا سەرۆک ئاوڕی لەوانەی دەوروبەری دایەوەو دەستوری جیاوازی بە هەر یەکێکیان دا، ئیدی هەر کەسەو بەلایەکا بڵاوەیان لێکرد، هەرکە ئەوان رۆیشتن، سەرۆک بەپەلە جزدانەکەی دەرهێناو ئەسکە ناسێکی سەد رۆبڵی لێ دەرهێناو گوتی: "ئەمە بگرە، من هەر ئەمەندەم لە توانادایە، چۆنی حیساب دەکەی حیسابی بکە، کەی بوت بمدەوە..." بەدەم ئەو قسانەوە پارەکەی نایە ناو دەستم.

شۆک بووم ژیکەڵەکەم، ئازام کەوتە لەرزین، خۆیشم نەمدەزانی چیم بەسەر هاتووە.

ویستم دەستی ماچ بکەم. بەڵام رەنگی سوور هەڵگەڕا، بەزاتی خوا چۆنت بۆ دەگێڕمەوە وابوو ڤارینکا گیان، ئیدی تەوقەی دەگەڵ کردمو زۆر بە گەرمی دەستی منی رووتەی گوشی، بەجۆرێ دەستی گوشیم وەکو

ئـەوەی هاوشـان‌و هاوتــەرازو هاوپلـەو پایـەی ئـەو بم، ژەنـەرالێك بم لـەو گۆڕە. ئەوجا پێی گوتم:

"فەرموو ئێستا تەشریف بەرە.. من ئەوەی لە توانام دا بوو کـردم... لـە ئێستا بە دواوە هەڵە مەکـە.. بـۆ ئـەمجارەیان خـۆم چارەسـەری دەکـەم، لێت دەبورم." جا **ژیکەڵەکەم** من لای خۆمەوە ئەم بڕیارەم داوە، داوا لـە تۆو فیدورا دەکـەم. ئەگـەر منـداڵم هـەبوان داوام لـەوانیش دەکـرد کـە لـە ئێستا بە دواوە دوعاو نزا بۆ بابیان نەکەن، بەڵکو هەموو ڕۆژێك‌و بۆ هـەتا هەتایە دوعای خێـر بـۆ جـەنابی سـەرۆك بکـەن. ڤارینکـا گیـان، شـتێکی دیکەشم لە دڵدایە حەزدەکەم بە ڕاشکاوی‌و ڕێك‌و راست پێتـی بڵـێم، گـوێ بگرە ژیکەڵەکەم:

بـە دڵ‌و بـە گیـان سـوێندت بـۆ دەخـۆم ئـەوەی لـەم ڕووداوەدا دڵخۆشـی کردووم، سەرباری ئەو دەردو مەینەتەی لـە ڕۆژگـاری تـاریکی نەگبـەتی‌و کلۆڵی‌وبـەد بەختیمانـدا چەشـتم، سـەرباری ئـەو خـەم‌و پـەژارە قورسـەی بـەدیتنی تـۆ دەنیشـتە سـەر دڵ‌و دەروونم، سـەرباری رەنـج‌و مەینـەتی‌و هەژاریمان، سەرباری زەبـوونی‌و زەلیلـی و کەساسـی خـۆم، پێـت دەڵـێم‌و دووبـارەی دەکەمـەوە ئـەوەی لـەم ڕووداوەدا دڵخۆشـی کـردم، سـەرباری هەموو ئەوانە، هەرگیز سەد ڕۆبڵەکە نەبووەو نیە، بەڵکو ئەو هەموو لوتفـە بوو کە سەرۆك دەرهەق بە من نواندنی‌و بەو هەموو گەرمو گوڕییە دەستی منی رووتەی گوشی، دەستی منی هیچ، منی **هەمیشە** مەست! بەم کارەی منی کڕییەوە،کردیە کارێك متمانە بـە خـۆم پەیدا بکەمـەوە، بـەم دەسـت پێشکەرییە پیاوانەیەی روحی بوژاندمەوە، بۆ هەمیشـە ژیـنی لـەلا شـیرین کردم. ئێستا باوەڕی تەواوم بەوە هەیە چەندیش لەلای یەزدانی بـە توانـاو

مەزن خەتابارم، هەر دوعای من بۆ شادیو بەختەوەرییو سەرکەوتنی سەرۆك دەگاتە ئاسمانو لە قاپی خودادا گیرا دەبێت!.

**ڤارینكا** گیان، ئێستا، لەم کاتەدا یەجگار پەریشانو نیگەرانم! هەست دەکەم، لە ناوەوە هەرەسم هێناوە، دڵم بەجۆرێ لێدەدا لەتۆ وایە دەیەوێ لە سینەم بێتە دەرێ. وا ئەسکەناسێکی چلو پێنج رۆبڵت بۆ دەنێرم، بیست رۆبڵیش دەدەم بە خاوەن خانووەکە، ٣٥ رۆبڵیش بۆ خۆم هەڵدەگرم! بایی بیست رۆبڵان جلو بەرگ دەکڕم، پازدەشی بۆ خەرجی رۆژانەم دادەنەم. بەڵام رووداوەکانی ئەمڕۆ، زۆریان کار تێکردم، لە ناخی ناخەوە، لە رەگو ریشەوە هەژاندمی. ئێستا دەچم چاوێ گەرم دەکەم تا ئیسراحەتێك بکەم، ئێستا ئارامم. ئەوەی روحم دەهەژێنێ ئەو هەڵچوونانەیە کە ناخی ناخم دەلەرزێنێ، چین چین هەرەس دێنێ، دێمو سەرت لێدەدەم. بەڵام ئێستا پەرێشانی دەستی ئەو هەڵچوونانەم، لە تۆ وایە مەستو سەرخۆشم... خودا بە خۆی هەموو شتێك دەبینێ ڤارینكا گیان... **خودا** هەموو شتێك دەبینێ کۆترە گرانقەدرەکەی من.

*دۆستی شایستەت*

*ماکار دیوڤشکین*

*ماکار ئالکسیوڤیچ-ی هەرە ئازیزم* *٩/١٠*

یەجگار بەو خۆشیەت، شادو **خۆشحاڵم**، رێزی بێ پایانم بۆ رەفتاری پیاوانەو مرۆڤانەی سەرۆکەکەت هەیە دۆستی ئازیز.

ئێستا دەتوانی کەمێك لە شەڕی ئەو گیروگرفتانە بە دووربی کە بەرۆکیان گرتبووی! بەڵام تکات لێ دەکەم ئەمجارە کەمێك دەست بگرەوە، بە خۆڕایی، بڕاستو بە چەپدا پارەکەت بە فیرۆ مەدە.

هەوڵبدە بە ئارامی، بە هێمنی بژی، تا دەتوانی قەلەندەرانە بژی، لەمڕۆوە بڕیار بدە کە **هەموو** رۆژێك تۆزێ پارە وەلاوە بنەو پاشەکەوت بکە، تا جارێکی دی نەکەویتە تەنگانەوەو نەبوونی غافڵگیرت نەکات. تۆ خەمی ئێمەت نەبێ، تکات لێدەکەم خەمی ئێمەت نەبێ، منو فیدورا بە هەر جۆرێ بێ تەگبیری خۆمان دەکەین، ودەزانین چۆن خۆمان لە ئاستەنگان دەربازدەکەین.

بۆچی ئەم هەموو پارەیەت بۆ ناردوین ماکار ئالکسیوڤیچ، بەڕاستی پارەیەکی یەجگار زۆرە، هەرگیز پێویستمان بەم بڕە پارە زۆرە نیە. ئێمە بەشی خۆمان هەیە، و بە بەشی خۆمان رازین. راستە بەم زووانە پێویستمان بە بڕێك پارە دەبێ بۆ ماڵ گواستنەوە، بەڵام فیدورا بە تەمایە بەم زووانە کۆنە قەرزێکی **چەند** ساڵەی خۆی وەربگرێتەوە.

بەڵام بە هەر حاڵ من بیست رۆبڵێك لەم پارەیە بۆ شتی زەروری‌و بۆ تەنگانە گل دەدەمەوەو باقیەکەیت بۆ دەنێرمەوە. تکات لێ دەکەم ماکار

ئالکسیوڤیچ دەست بەم پارەیەوە بگرە. ئیدی دەتوانی تۆزێ بە ئارامی بژی، ئاگات لە سەلامەتیو تەندروستی خۆت بێ، بە شادیو خۆشی بژی.

حەزم دەکرد زیاتر بۆ بنووسم، بەڵام زۆر شەکەتو ماندووم. دوێنێ لە بەیانیەوە تا ئێوارێ لە جێدا کەوتبووم. **سوپاس** کە بەڵێنت داوە سەرم بدەی، کارێك باش دەکەی، تکات لێدەکەم وەرە سەرم بدە، بە هاتنت زۆر خۆشحاڵ دەبم.

ف. د.

*ڤرڤارا ئالکسیوڤنای زۆر ئازیزو گرانقەدرم!* *٩/١١*

هاوڕێ **ئازیزەکەم**، تکات لێ دەکەم، لێت دەپاڕێمەوە، جارێ بارمەکە، لێرە مەڕۆ، من کە ئێستا زۆر شادم، لە ژیانی خۆم رازیم، پێویستم بە هیچ نیە، بارمەکە، ئەم کەیفو خۆشیەم لێ تێك مەدە کۆترەکەم! گوێ لە قسەی فیدورا مەگرە، بە گوێ ئەو مەکە، دڵنیابە کە بە دڵی تۆ دەکەم، ئەو ڕێگەیە دەگرم کە تۆ بۆم دادەنەی.

ڕەفتارو هەڵسوکەوتی خۆم چاك دەکەم، هەر **هیچ** نەبێت لەبەر حورمەتوڕێزی جەنابی سەرۆك دەبێ ڕەفتاری خۆم چاك بکەم.

نامە بۆ یەکدی دەنووسین، دڵی خۆمان بۆ یەکتر دەکەینەوە، بیرو بۆچوونەکانمان بەیەکدی دەڵێین، بەشداری خۆشیو ناخۆشی یەکدی دەکەین، ئەگەر ناخۆشیەك، ناخۆشیەك لە ئارادا مابێ، لە نزیکەوە ئاگامان لە یەکدی دەبێتو کۆکو تەبا پێکڤە دەژین، بۆ خۆ ئەدەبیات دەخوێنینەوە فریشتە ژیکەلەکەم، باشە؟

چارەنووسم گۆڕاوە، تەواو گۆڕاوە، هەموو شتێك روو لە باشیە، خاوەن خانووەکە ئێستا باشە، پەلپو بیانووم پێناگرێ، تیریزا ئاقڵ بووە، ئەو کەودەنە نیە کە من وێنام **دەکرد**. تەنانەت فالدونی-ش گۆڕاوە، چوستوچالاكو روح سووك دێو دەچێت. لەگەڵ راتازاییف دا ئاشت بوومەتەوە.

به خۆم، بەوپەڕی شادیو رەزامەندی چووم بۆ ژوورەکەی، راستت دەوێ **پیاوێکی** باشە ڤارینکا گیان، هەموو ئەو شتە خراپانەی دەرهەق بەو دەگوترێ، بوختانو نەهەقیە، ئێستا بۆم دەرکەوتووە کە هەر هەموو ئیفترا بووە. هەرگیز بیری لەوە نەکردووەتەوە ئێمە بکات بە هەوێنی نووسینێك، بمانکات بە کەرەستەی رۆمانێك، بە خۆی ئەوەی پێ گوتم.

تەنانەت پەرەگرافێکیشی لە دوا کتێبی خۆی، لە دوا دەستنووسی خۆی بۆ خوێندمەوە. سەبارەت بەو ناوەش کە لە **منی** نابوو، مەبەستم (لوفلاس- هەوەسکار)، مەبەستی تانەو تەشەر نەبووە، ناوەکەش هیچ مانایەکی نەنگی نیە. مانای ناوەکەی بۆ روون کردمەوە، کە وشەیەکی بێگانەیەو بە واتای "شێرە کوڕ" دێ یان ئەگەر بە شێوەیەکی ئەدەبیانەتر لێك بدرێتەوە دەکاتە "سەر سەخت" ئەوە مانای ئەو وشەیەیە. یانی شتێکی تیا نیە کە هەست بریندار بکات یان کەرامەت بڕوشێنێ، یان ناو بزڕێنێ. یانی گاڵتەو شۆخیەکەی ئاسایی بووە فریشتە زیکەلەکەم.

**مسن**، منی نەخوێندەوارو کاڵفام، گەوجانە بە سووکایەتیم زانی بوو بردوو بوومە سەر خۆم. راستت گەرەکە دەبێ من عوزرخوایی بۆ ئەو بکەم... ئەمڕۆکە هەوا زۆر خۆشە ڤارینکا گیان.. بەڕاستی کەشو هەوایەکی فرە خۆشە...

راستە لای بەیانیەکەی هەندێ **سارد** بوو، رێژنە بارانێك باری، بەلام هیچ نەبوو! ئەم بارانە کەشو هەواکەی خۆشترو جوانتر کرد. چوومە دەرێو جووتێ پێڵاوی عالم کڕی، ئەوجا پیاسەیەکی خۆشم بە شەقامی نیفسکی

دا کرد. ژمارەیەکی ڕۆژنامەی (هەنگی باکوور)م خوێندەوە. ئا... باش بوو بیرم کەوتەوە، بویەرێك رووی دا با بۆتی بگێڕمەوە:

**ئەم** بە یانیە دەگەڵ ئیمیلیان ئیڤانوڤیچو ئاکسنتی میخائیلوفیچ دا باسی جەنابی سەرۆکم کرد. بەڵێ ڤارینکا گیان، پێدەچێت من یەکەم کەس نەبم کە لوتفو سەخاوەتی ئەوم بەر کەوتبێت. چاکەی بۆ خەڵکانی دیکەش بووە، میهرەبانیو دڵاوایی ئەو بووە بە وێردی سەرزاری هەموو کەسێك.

زۆر کەس لە چینو توێژی خەڵکانی جیاواز ستایشی دەکەنو خۆ بەمنەتباری ئەو دەزانن. لە زۆر ماڵدا کە نێوی دێت خەڵکی فرمێسکی سوپاسگوزاریو منەتباری دەڕێژن. **کچێکی** هەتیوی لە ماڵی خۆیدا بەخێو کردووەو پاشان بەمێردی داوە، داویەتی بە پیاوێکی بە حورمەتو سەلاروسەنگین، کە لای خۆی، لە نووسینگەکەی خۆیدا کار دەکات. هەروەها کوڕی بێوەژنێکی گرتووەتە ژێر باڵی خۆیو لە پۆستێکی دەوڵەتیدا دایمەزراندووە، و زۆر چاکەی تری لەم بابەتەی کردووە.

**بۆیە** بە ئەرکی خۆم زانی منیش لە بری ئەو چاکەیەی، بۆ هەموو کەسێکی بگێڕمەوە کە جەنابی سەرۆك چ چاکەو پیاوەتیەکی دەگەڵ کردووم: بە دەنگی بەرز بۆ هەمووانم گێڕایەوە کە چی داومەتیَ و چ لوتفێکی لەگەڵ کردووم. هەموو ڕاستیەکانم بۆ گێڕانەوە، هیچ شتێکم نەشاردەوە. شەرموشورەییم خستەلاوە. شەرمو غروور لە ئاستی چاکەو گەورەیی دا دەکاتە چی؟

بەدەنگی بەرز حەقیقەتەکەم گێڕایەوە، تا هەموو خەڵکی بزانن جەنابی سەرۆك چەند پیاوێکی دڵاواو میهرەبانو گەورەیە! بەوپەڕی ڕاشکاویو جۆشو خرۆش گێڕامەوەو نە شەرمم کردو نە لە شەرمانا سوور هەڵگەڕام.

بە پێچەوانەوە شانازیم بە گێڕانەوەی ئەو چیرۆکە دەکرد. باسی هەموو شتێکم کرد (هەڵبەتە جگە لە باسی تۆ ڤارینکا گیان) باسی گیروگرفتی خۆم دەگەڵ خاوەن خانووەکە، دەگەڵ فالدونی، دەگەڵ راتازاییف، مارکوف‌و باسی پێڵاوەکانم کرد.

باسی **هەموو** شتێکم بۆ کردن، هەموو شتێك. یەك دوانێکیان زەردەیەکیان بۆ کرد، نا هەموویان بزەیان کەوتە سەر لێوان. بگرە کەمێکیش پێکەنین.

رەنگە بە سەروسیمای من پێکەنی بن، یان باسی پێڵاوەکانم هێنا بوونیە پێکەنین، بەڵێ دەبێ هەر ئەمە بێ، دەنا ماقوول نیە بە خۆڕایی‌و بە مەبەستی گاڵتەکردن بە من پێ بکەنن. من لەمە دڵنیام. بۆیە پێکەنین چونکە گەنجن. یان لەبەر ئەوە بوویێ **چونکە** دەوڵەمەندن، دەنا هەرگیز ئەوەیان بە بیروخەیاڵدا نەهاتووە کە بەقسەکانی من پێ بکەنن‌و گاڵتەم پێبکەن. مەبەستم ئەوەیە کە چونکە من ستایشی جەنابی سەرۆکم دەکرد، نە یاندەتوانی بە قسەکانی من پێ بکەنن‌و گاڵتەیان پێ بێت، وا نیە ڤارینکا گیان؟

ڤارینکا، هەموو ئەو بوبەرو رووداوانە لە ناخی ناخەوە هەژاندمیان‌و گێژو وێژو سەرسامیان کردووم، هێشتا بە تەواوەتی نەهاتوومەتەوە سەرخۆ. چیلکەو داری سووتاندنی پێویستت هەیە؟ ئاگات لە خۆ بێ سەرمات نەبێ ڤارینکا، دنیا ساردە، هەرکە بایەك لێت بدا پەسیو دەگریت.

ئاخ **ڤارینکا**، دەزانی تۆ بەم کەڵکەڵەو خولیایانەت دەمکوژی؟ من دوعای خێرت بۆ دەکەم، مەگەر هەر خوا بزانێ چەن لە خەمی تۆدام، چەندت دوعای خێرت بۆ دەکەم، لە خودا دەپاڕێمەوە. گۆرەوی خوریت هەیە،

جلی گەرمی ژێرەوەت هەیە؟ ئاگات لە خۆت بێ كۆترەكەم. ئەگەر هەرچیەكت پێویست بوو، تو زاتی خودا وەرەو پێم بڵێ، منی پیرەمێر مەرەنجێنە، یەكڕاست وەرەو پێم بڵێ. خەمی منت نەبێ، ئیدی رۆژگاری تەنگانە بەسەر چووە، ئایندەیەكی پرشنگدارمان لەبەر دەمە.

هەموو شتێك بە دڵی خۆمان دەبێت.

ئاە **ڤارینكا**! چ رۆژگارێكی دژوارمان بەڕێكرد! بەڵام گرینگ نیە، ئەو رۆژگارە بەسەر چوو، تەواو بوو. باسیان مەكە، دوای چەند ساڵێك هەر هەموویمان بیر دەچێتەوە. من ساڵانی گەنجی خۆمم دێنەوە یاد. بەڕاستی ساڵانێكی خۆش بوون، هەرچەندە زۆرجار تاقە كوپیكێكم لە گیرفاندا نەبوو، سەرمام بوو، بێ جلو بەرگ بووم، برسیم بوو... بەڵام زۆر شادو دڵخۆش بووم. بەیانیان بەرەخی روباری نیفسكی دا پیاسەم دەكرد، كە سیمایەكی جوانم دەبینی، سەرانسەری رۆژەكەم بە خەیاڵی ئەوەوە بە خۆشی دەبردە سەر. رۆژگارێكی بەشكۆ بوو، بەڕاستی رۆژگار بوو نە كڵتە ڤارینكا گیان! بەڕاستی ژیان خۆشە **ڤارینكا**!

بە تایبەتی لە پوترسبۆرگ! دوێنێ بەچاوانی پڕ لە گریانەوە تۆبەم كرد، لە خودا پاڕامەوە كە لە هەموو ئەو هەڵەو گوناحانەم خۆش بێت كە لەم رۆژگارە خەمناكەدا، لەم رۆژگارە شوومەدا تووشیان بووم: لە ناشوكرییەكانم، لە بیرە كوفرئامێزەكانم، لە بەدكاریەكانم، لە داوێن پیسی، لە قومارو... كانم خۆشبێت...

لە نوێژو دوعاكانمدا دڵسۆزانە بۆ تۆش پاڕامەوە. هەر تۆ بووی ئازیزەكەم، فریشتە چكۆلەكەم بە هانامەوە هاتی، وڕەت بەرز كردمەوە، دڵخۆشیت دامەوە، بە رێنوێنی و پەندو ئامۆژگارییەكانت رێگەی راستت

نیشاندام. **هەرگیز** ئەو چاکانەی تۆ لەبیر ناکەم ڤارینکا گیان، ئەمڕۆ نامەکانتم دەرهێنان، یەك بە یەکیانم ماچ کرد! بەڵێ کۆترەکەم! جارێ بە خودات دەسپێرم دایکەلێ، پێیان گوتووم لەم نزیکانەی خۆمان پڵتۆیەك هەیە دەیفرۆشن، دەچم بزانم دەیدۆزمەوە یان نا. جارێ خودا حافیز، فریشتە چکۆلەکەم، خودا حافیز.

*هاوڕێی هەرە دڵسۆزت*

*ماکار سیوشکین*

***ڕێزداری ئازیز ماکار ئالکسیوفیچ:*** ***٩/١٥***

یەجگار **نیگەرانم**، پەستو غەمگینم، گوێ بگرە چیمان لێقەوماوە. هەر زو دڵم خەبەری دا بوو کە شتێکی خراپمان لێدەقەومێ. بە خۆت حوکم بدە دۆستی بەڕێزم:

ئاغای بیکوف حاڵی حازر لە پوترسبۆرگە..

فیدورا بە ڕێکەوت دیتوویەتی، کە بە گالیسکە بەلای فیدورا دا ڕەت بووە، بە گالیسکەچیەکەی گوتووە رایگرە، چووە بۆ لای فیدوراو لێی پرسیوە کە ئێستا لە کوێ دەژی. فیدورا لە هەوەڵەوە هیچی پێنەگوتووە، پاشان بیکوف بەدەم بزەیەکی بە تویکڵەوە، بە تەشەرەوە پێی گوتووە دەزانێ دەگەڵ کێدا دەژی (پێدەچێت فیدورڤنا هەموو شتێکی بۆ گێڕابێتەوە).

هەنگێ فیدورا گەییوەتە تینیو خۆی پێ نەگیراوە، **هەر** لەوێدا، لە ناوەندی شەقامەکەدا، کەوتووەتە جنێو پێدانی، پێی گوتووە کە پیاوێکی بەدناکارە، بێ ئەخلاقە، پێی گوتووە ئەو سەبەبکاری هەموو بەدبەختیو عەزابێکی منە. ئەویش لە وەڵامیا گوتوویەتی خەڵکانێك کە تاقە پولێکیان لە باخەڵ دا نەبێ ئاساییە بەدبەخت بن. فیدوراش پێی گوتووە کە من دەمتوانی بە رەنجی خۆم بژیم، و تەنانەت دەمتوانی مێردیش بکەم، وتەنانەت وەزیفەیەکیش پەیدا بکەم، بەڵام تازە کار لەکار ترازاوەو هیچ ئومێدێکم نیە، ونەخۆشمو لەوەیە بەو زووانە بمرم.

لە وەڵامدا گوتوویەتی گوایە من هێشتا گەنجمو لە هەوەڵی عومرمدام، هێشتا کەلکەڵەو خولیای تورەهاتم لەمێشکدایە، و تەنانەت "نامووسی خۆم لەکەدار کردووە" (ئەمە دەقی قسەکانی ئەوە).

منو فیدورا پێمان وابوو ئەدرەسەکەمان نازانێ. بەڵام **دوێنێ** وەختێ من لە ماڵ دەرچوو بووم، بەمەبەستی کڕینی هەندێ پێویستیان بۆ بازاڕی گوستینی چوو بووم، لە پڕ خۆی بە ژوورەکەماندا کردبوو، وادیارە نەیویستووە من لە ماڵەوە ببینێ. ئیدی بە دوورو درێژی پرسیاری ژیانو گوزەرانی لە فیدورا کردبووین، چاوی بە سەرانسەری ژوورەکەماندا گێڕابوو، کاری خەیاتیەکەی منی دیتبوو، پاشان لە فیدورای پرسی بوو: "ئەو کارمەندەی ئاشناتان کێیە، ئەوەی دۆستایەتی لەگەڵتاندا هەیە؟" بەرێکەوت لەو دەمەدا **قسۆ** بەوێدا تێپەڕ بوویت، و فیدوراش تۆی پیشانداوە، ئەویش تەمەشایەکی کردوویو زەردەیەکی تەوسامێزی کردووە.

ئیدی فیدورا تکای لێکردووە کە بڕوات، پێی گوتووە کە من پەریشانو بێتاقەتم، نەخۆشم و لەوەیە بە دیتنی ئەو لە ژوورەکەماندا، حاڵم خراپتر ببێ. تۆزێك بێدەنگ بووە، پاشان گوتوویەتی گوایە بە رێکەوت بێرەدا تێپەڕ بووە، وەختی هەبووەو بۆیە لایداوە تا بزانێ هیچیان پێویست نیە، ویستویەتی بیستو پێنج رۆبڵ بە فیدورا بدات، کە هەڵبەتە فیدورا رەفزی کردووەو وەری نەگرتووە.

تۆ بڵێی **ئەم** سەردانە چ بگەیەنێ؟ چی لێمان گەرەکە؟ نازانم چۆن ئەم هەموو شتەی دەربارەی ئێمە زانیوە، هەرچی سەر دێنمو سەر دەبەم، وەڵامی قەناعەتبەخشم دەست ناکەوێ. فیدورا دەڵێت ئاکسینیای برازنی

كە جار جار سەرمان دەدات، جلشۆرێك دەناسێت بە نێوی ئاناستاسیا، پس مامی ئاناستاسیا پاسەوانە لە وەزارەتێكا كە برادەرێكی برازایەكی ئانافیدورڤنا لەوێندەر كار دەكات، لەوەیە ئەم قسەو قسەلۆكانە لەوێندەرەوە دزەی كردبێ‌و دەماودەمی كردبێت. بە هەرحاڵ لەوەشە فیدورا بە هەڵەدا چووبێ. راستت دەوێ ئێمە نازانین چۆن بیر لەمە بكەینەوەو چۆنی لێك بدەینەوە. ئایا جارێكی دیكەش دێیتەوە دیدەنیمان؟

كە بیر لەمە دەكەمەوە ترسم لێدەنیشێت! كە فیدورا دوێنێ ئێوارێ شتەكەی بۆ **گێرامەوە**، هێندە ترسام خەریك بوو لە خۆ بچم. لەوەی زیاتر چییان لێم دەوێ؟ چی ماوە پێمی بكەن؟ من نامەوێ لە ئێستا بە دواوە بیانناسم. ئاخر چیان لەمنی بێنەوا، لە منی بەلەنگازی داماوی كلۆڵ دەوێ؟

خودایا ئێستا چ ترس‌و لەرزێكم لە دڵدایە! هەمیشە لە بیری ئەوەدام ماكا سەروسەكوتی بیكوف پەیدا بوو. هەنگێ چیم بەسەر دێت؟ دیسان چارەنووس چ داوێكی بۆ ناومەتەوە؟ مەعز بۆ خاتری مەسیح خێرا، هەر ئێستا وەرە بۆ دیدەنیم ماكار ئالكسیوڤیچ. تكات لێدەكەم، بیكە بە خاتری خوا وەرە. وەرە دیدەنیم.

**

*ڤرڤارا ئالکسیوڤنا، ژیکەڵەکەم:* ٩/١٨

**ئەمڕۆ** لە ماڵەکەی ئێمەدا بویەرێکی لە رادەبەدەر خەمناك رووی دا، بویەرێکی تەفسیر هەڵنەگر، و چاوەڕوان نەکراو. گورشکوڤ بەلەنگاز (دەبێ لە هەوەڵەوە ئەمەت بۆ بێگێڕمەوە ڤارینکا) بە تەواوەتی تەبرێ بوو بوو.

دەمێ بوو بڕیاری دادگا دەرچوو بوو، ئەمڕۆ چوو بوو تا دوا بڕیار وەربگرێ. دەعواکەی بە قازانجی ئەو بڕابووەوە، لە هەموو گومانو بێ موبالاتیو خەمساردییەك پاك بوو بووەوە.

بڕیاری دادگا ئەوە بوو کە کابرای بازرگان پارەیەکی مۆڵی بداتێ، بەو جۆرە باری ژیانو گوزەرانی یەجگار باش بوو بوو، ئەستۆی **پاك** بووەوە، شەرەفو ئابڕووی کڕدرایەوەو لە هەموو لەکەیەك پاك بووەوە، یانی هەموو شتێك بە قازانجی ئەو بڕا بوویووەوە. بە کورتیەکەی هەموو ئارەزووەکانی هاتبۆوە دی.

ئەمڕۆ **سەعات** سێی پاش نیوەڕۆ گەییشتەوە ماڵێ. سیمای تێك چووبوو، رەنگی بوو بوو بە جاوی سپی. لێوەکانی دەلەرزین، لێ بەو حاڵەشەوە بزەی لە لێوان نەدەبڕا. ژنومنداڵەکانی لە هەمێز گرتن، ماچی کردن.

ئێمەش هەموو بە پیریەوە چووین تا پیرۆزبایی لێبکەین، دیار بوو ئەم هەلوێستەی ئێمەی زۆر پێ خۆش بوو، زۆر بە گەرمی پێشوازی کردین، سلاوی لە هەمووان کرد، چەند جارێك تەوقەی دەگەڵ هەمواندا کرد. تەنانەت وام هەستکرد کە لەشی گەورەتر بووە، وەك بلێی بالای چەند سانتیمێك بەرزتر بووە. تەنانەت وەکو جاران چاوانی تەژی رونك نەبوون.

بەستەزمانە یەجگار شپرزە بوو، بۆ دوو دەقیقە لە شوێنێکدا ئۆقرەی نەدەگرت، هەر شتێکی لەبەر دەستدا بوایە هەلیدەگرت، ئەوجا لە جێی خۆی دایدەنایەوە، بێوچان زەردەی دەکرد،سلاوی دەکرد، دادەنیشت، هەلدەستا، دادەنیشتەوە، بەدەم ئەو حالەوە لە یەکبینە قسانی دەکرد، زاری لێك نەدەنا، قسەکانیشی وڕێنە ئاسا بوون، شتێکی لەم بابەتانەی دەگوت: "ئابڕوم، شەرەفم، ناوبانگم، سومعەم لە نێو خەلکیدا..."و تەنانەت لە ناکاودا لە هۆڕژنی گریانی دەدا..

چاوانی زۆربەی ئێمەش پڕ بوون لە فرمێسك. راتازاییف ویستی دلخۆشی بداتەوە، ورەی بەرز بکاتەوە، دەستی خستە سەرشانیو گوتی: "برای ئازیز، شەرەفی چی، پیاو ئەگەر نانی نەبێ بیخوا شەرەفی چی، تۆ بۆ باسی شەرەف دەکەی، تۆ شوکرانەی خودا بکە ئەم هەموو پارەیەت دەستکەوتووەتەوە، ئەمە سەری هەموو شتێکە، دەبێ لەم رووەوە شوکرانەی خودا بکەی!". لەو ساتەدا هەستم کرد گورشکوف ئەو قسانەی لە دل گران بوو. نالێم بەڕاشکاوی ناڕەحەتی خۆی نواند، بەلام نیگایەکی تەوسامێزی راتازایفی کردو دەستی لەسەر **شانی** خۆی لابرد.

جاران كاری وای نەدەكرد ژیكەلەكەم! بە هەرحاڵ هەر بەشەرەو تەبیعەتێكی هەیە. بۆ نموونە ئەگەر من ئەوەندە بەختەوەر بوایەم ئەو كارەم لەگەڵ ئەو لاوە مەغروورەدا نەدەكرد، **مەبەستم** ئەمەیە ئازیزەكەم، كە هەندێجار بەشەر زیاد لە پێویست نەرمكێشی دەكاتو لە هەنبەر چاكەی كەسانی دیدا منەتباریو خۆشكێنی دەكات.. بە هەرحاڵ با واز لەمە بێنین، ئەمە بابەتی ئەم نامەیە نیە كە ئێستا بۆتی دەنووسم. گورشكوف گوتی: "بەڵێ، من دڵم بە پارەكەش خۆشە، زۆر شوكر بۆ خودا، شوكرانە بژێرم." ئەوجا بە درێژایی هەموو ئەو ماوەیەی ئێمە لە ملیان بووین، هەر گوتوویەتیو گوتوویەتیەوە:

"زۆر شوكر **بۆ** خودا، شوكرانە بژێرم خودایا!..." ئەوجا ژنەكەی خواردنێكی تایبەتیو زۆری راسپارد، باشترو زیاتر لە جاران، خاوەنی خانووەكە نەك هەر داواكەی بەگەن كرد، بەڵكو دەیویست بە خۆی خواردنەكەیان بۆ ئامادە بكات. خاوەن خانووەكە هەندێجار ژنێكی ژنانەو میهرەبانە، تا خواردنەكە پێگەیی، گورشكوف بۆ ساتێكش ئۆقرەی نەگرتووە، لە شوێنێك دانەنیشتووە، هەر هاتووەو چووە. سەری بە یەك بە یەكی ژوورەكاندا، فەرمووی لێكرا بێ یان نا، كردووە.

یەكراست خۆی بە ژووردا دەكرد، بزەیەكی **دەكرد**، لەسەر كورسیەك دادەنیشتو چەند قسەیەكی دەكرد، یان كرۆكپ ورتەی لێوە نەدەهات. پاشان هەڵدەستاو دەڕۆیی. تەنانەت كە خۆی بە ژووری ئەفسەرە دەریاوانەكەدا كرد، چەند وەرەقەیەكی هەڵگرت، خولكیان كرد كە یاریەكە بكەن بە چوار قۆڵی.

کەمێك یاری کرد، دەستەکەی تێك دایەوەو گوتی: "بەسە، من نیازی یاریم نەبوو، هەر ویستم سەرێکتان بدەم." ئیدی هەستاو ڕۆیی. لە ڕاڕەوەکەدا تووشی من بوو، بە هەردوو دەست، دەستی توند گرتم‌و **ڕاستەوخۆ** چاوی بڕیە دوڕ چاوانم، بەڵام نیگای نا ئاسایی‌و هەندێ غەریب بوو، بە درێژایی ئەو ماوەیە زەردەی لە لێو نەبڕا، بەڵام بزەکەشی نا ئاسایی‌و بڕێك قورس بوو، هەستێکی خەمناکی لای بینەر چێدەکرد، دەتگوت بزەی مردووانە. ژنەکەی لە خۆشیاندا دەگریا. شادی باڵی بەسەر ژوورەکەیاندا کێشابوو، لە تۆ وایە لە پێشوازی جەژندان. بەپەلە فراڤینیان خوارد.

گورشکوف لە دوای نیوەڕۆژە بەژنەکەی گوت: "گوێ **بگرە** ئازیزەکەم، من دەچم سەرخەوێ دەشکێنم."

چووە سەر جێگەکەی خۆی. کیژەکەی گاز کرد، دەستی خستە سەر سەری،و ماوەیەکی زۆر نەوازشی کرد. ئەوجا ڕووی کردە ژنەکەی پرسی: "ئەدی پتنکا لە کوێیە؟" ژنەکەی پرسی: "پتنکای خۆمان؟

" ئەوجا نیشانەیەکی چەلیپای کێشاو بە ترس‌و نیگەرانیەوە گوتی مردووە،و بە خۆی ئەمە دەزانێ. مێردەکەی گوتی: "بەڵێ، بەڵێ، دەزانم، هەموو شتێك دەزانم، دەزانم پتنکا ئێستا لە بەهەشتی بەریندایە.".

هەنگێ ژنە زانی کە مێردەکەی ئاسایی نیە،و ئەم ڕووداوە تەواو پەریشانی کردووەو حەواسی پەرتە،و پێی گوت:

"ئازیزەکەم باشتر وایە کەمێك بخەوی." **گوتی**: "بەڵێ بەڵێ، هەر ئێستا دەنووم.. من... تۆزێ..." ڕووی وەرگێڕا، کەمێك ڕاکشا، پاشان دووبارە ڕووی لە ژنەکەی کردووەو ویستی شتێك بڵێت. ژنەکەی نەیزانی دەیەوێ

چ بلّێ، بۆیە پرسی! "دەتویست چ بلّێی هاوڕێم؟" وەلامی نەدایەوە، ژنە تۆزێ چاوەڕوانی کرد، ئەوجا لە دلّی خۆیدا گوتی:

"وا دیارە خەوی لێکەوت." ئەوجا **چــوو** بۆ لای خاوەن خانووەکەو نزیکەی سەعاتێکی بە دەمەتەقێوە لەوێندەر بەسەر برد. کاتێ گەڕایەوە سەیری کرد مێردەکەی هێشتا هەلّنەستاوەو کرو کپ لە جێگەکەیدا راکشاوە. پێی وابوو نووستوە، بۆیە لێی دانیشتو خۆی بە کارێکەوە مژول کرد. پاشان پێی گوتین نزیکەی نیو سەعاتێك لە فکران راچووە، **ئێستا** لە بیری نیە کە بیری لە چی کردووەتەوە، بەلاّم دەزانێت کە لەو ماوەیەدا مێردەکەی بە تەواوەتی لەبیر کردبوو، بەلاّم لە پڕ هەستێکی ترسناك لە گێژاوی ئەو بیرانەی دەردێنێ، ئەو بێدەنگیە سەیرو غەریبەی ژوورەکەیان کە لە بێدەنگیو خامۆشی گۆڕستان دەچێت شپرزەو نیگەرانی دەکات. تەمەشایەکی تەختە خەوەکە دەکاتو دەبێنێ مێردەکەی بێ جولّە خەوتووە.

دەچێتە دیار سەرێو تەکانی دەدات، دەبینێ بەدەنی ساردی ساردە، تومەز مردبوو، بەلّێ ژیکەلەکەم گورشکوف مردبوو.

لە پڕ وەکو ئەوەی **هەورە** بروسکە لێی دابێ مردبوو. مەگەر هەر خودا بزانێ بۆ مردبوو. ئەمەندەم پێ ناخۆش بوو ڤارینکا، ئەمەندەم لە دلّ گران بوو تا ئێستاش نەهاتوومەتەوە سەر خۆم. باوەڕم نایەت بشێت کەسێك بەو بێدەنگیە، بەو ئارامیە،وبەو کوتوپڕیە بمرێت! ژاری گۆرشکۆف بەستەزمان خۆت، لەلەنگازۆ!...

کە عەزابی چەشت! ئەوەش چارەنووسی بوو!

ئەوەش قەدەری بوو! ژنەکەی غەرقی ڕوندکان بوو، لە ترساناو لە داخا، هۆشی لای خۆی نەمابوو. کیژۆڵەکەشی لە سووچێکدا هەڵکورمابوو، بێ جووڵە کزکۆڵەی کردبوو. هاتوچۆیەکی زۆر بۆ ژوورەکە پەیدا بوو،...
باسی هاتنی پزیشکی قانونی دەکرێ کە دەبێ تەحقیق بکات.. من وردەکاری شتەکان بە تەواوی نازانم...
بەلام زۆر دڵم بە حاڵیان دەسووتێ، چەندم بەزەیی پێیاندا دێتەوە! بەڕاستی یەجگار ناخۆشە، پیاو نەزانێ لە چ ڕۆژێکا، لە چ سەعاتێکا... لە کاتێکا مردنی هەو لە بیرش نیە، مردن بەرۆکی بگرێ و بە خوت‌وخۆڕایی، سووک و ئاسان لە نێوی بەرێت...

*هاوڕێت: ماکار دێووشکین*

*خانمی ئازیز، ڤرڤارا ئالکسیوڤنا* **٩/١٩**

حەزم کرد زوو ئاگادارت بکەمەوە کە راتازیفی **هاورێم**، کارێکی باشی بۆ دۆزیومەتەوە، کابرایەکی نووسەر دەستنووسێکی گەورەی بۆ هێناوە تا من بەکریێ بۆی بنووسمەوە...

واتە شوکر بێ ئیش نابم. بەڵام خەتی کابرای نووسەر هێندە ناخۆشە کە بۆم ناخوێنرێتەوە، تیا ماوم چۆنی بخوێنمەوە، ئەمە جگە لەوەی داوایان لێکردوم بە کەمترین ماوە تەواوی بکەم، چونکە پەلەیانە..

. نووسەر باسی کۆمەڵێك شتی کردووە کە من هیچی لێ حاڵی نابم... رێکەوتووین هەر لاپەرەیەکیان بە چل کوپیك بۆ بنووسمەوە. بۆیە ئەمەت بۆ دەگێڕمەوە تاکو بزانیت ئەوەی وەریدەگرم، لە پێویستییەکانی خۆم زیاترە. جاریێ خودا حافیز ڤارینکا. یەکسەر دەستبەکار **دەبم**.

*دۆستی ئەمەکدارت*

*ماکار دیوشکین*

***دۆستی هەرە ئازیز ماکار ئالکسیوفیچ*** ***٩/٢٣***

حەوت دانە رۆژە هیچم بۆ نەنووسیوویت، لەم ماوەیەدا زۆر سەرقاڵ بووم، کۆمەڵێك کێشەو نیگەرانیم بۆ پەیدا بوو.

پێریێ بیکوف **هاتە** دیدەنیم، بە تاقی تەنیا لەماڵەوە بووم، فیدورا چوو بووە دەرەوە. خۆم دەرگام کردەوە، کە ئەوم بینی زۆر ترسام، لە جێی خۆم وشك بووم، نەمتوانی بجوڵێم. هەستم کرد رەنگم بە رووەوە نەما.

وەکو هەمیشە بەدەم قاقاوە وەژوورکەوت، کورسیەکی هەڵگرت و لەسەری دانیشت. تا ماوەیەکی زۆر نەمتوانی بێمەوە سەر خۆم، ئەنجام لە سووچێکدا دانیشتم و دەستم بە کار کرد. ئەویش دەستبەرداری پێکەنین بوو، پێم وایە رواڵەتم حەپەساندی. ئاخر لەو دواییانەدا یەجگار لاواز بووم.

کۆناکانم ژاکا بوون، چاوانم بە قوڵا چووبوون، و رەنگو رووم بوو بوو بە جاوی سپی... ئەوانەی پارەکە دیبوویانم، ئێستا بە زەحمەت دەیانناسیمەوە.

ماوەیەکی زۆر بە بێدەنگی لێم راما، **پاشان** دووبارە گەڕایەوە سەر کەیف و سەفاکەی خۆی. کەوتە پرسیارو قسان، خۆیشم نەمزانی چیم وەڵام دایەوە. بەڵام ئەو بە وەڵامەکەی من دووبارە لە قاقای پێکەنینی دایەوە.

سەعاتێکی تەواو لە ژوورەکەمدا مایەوەو پرسیار لە دووی پرسیاری لێدەکردم. ئەنجام، کاتێ کە هەستا بڕوات، دەستی خستمە نێو دەستی‌و گوتی: (دەقی قسەکانی ئەوت بۆ دەگێڕمەوە) : "فرفارا ئالکسیوفنا، هەر بەینی خۆمان بێت، ئانا فیدوروفنای خزمی تۆو دۆستو هاوڕێی نزیکی من، ئافرەتێکی زۆر بچووك و کەمو شرپەندەیە".

(لێرەدا وشەیەکی دیکەشی دەربارەی ئەو بەکار هێنا کە وشەیەکی **جوان** نیە). "دۆتمامەکەی تۆی بە رێگەی خراپدا برد، وتۆشی تووشی گێچەڵو سەرگەردانی‌و ماڵوێرانی کرد. هەڵبەتە منیش لەو سەرو بەندەدا، وەکو پیاوێکی ترسنۆك، بێ هەڵوێست رەفتارم کردووە. بەڵام ئیدی ئەوە رۆژگارەو چی لەگەڵدا دەکرێ؟"

بەدەم **ئەم** قسانەوە بە جۆرێ لە قاقای پێکەنینی دا کە کەوتە کۆکین. پاشان گوتی بابایەکی وتاربێژ نیە، تا وتاری دوورو درێژی بۆ بدات، ئەو شتە بنەڕەتیانەی ویژدانو شەرەف داوایان لێکردووە کە بیڵێتو چیتر لێی بێدەنگ نەبێت، گوتوویەتی‌و دەبێ پاشماوەی بابەتەکە زۆر بە کورتی بگێڕێتەوە. ئیدی رێكو راست، بە ئاشکراو بێ پێچو پەنا گوتی گەرەکیە خوازبێنیم بکاتو زەماوەندم دەگەڵ بکات.

وبە ئەرکی سەر شانی خۆی دەزانێ کە ئیحتوبارو شەرەفو کەرامەتی من بکرێتەوە، پیاوێکی دەوڵەمەندەو دوای گواستنەوە **بۆ** گوندێکی ناو جەرگەی موڵکەکانی خۆیم دەبات، وبە تەمایە لەوێندەر خۆی بۆ راوە کەروێشکان تەرخان بکات، ونایەوێ چیتر بۆ پۆترسبۆرگ بگەڕێتەوە، چونکە شارێکی ناخۆشو پیسە، ولەم شارەدا، خۆی گوتەنی "برازایەکی خوێڕی هەیە"و سوێندی خواردووە لە بەشە میرات بێبەشی بکات، وبە

زۆریش لەبەر ئەوە سوورە لەسەر خواستنی من، تا میراتگری شەرعیو قانونی بخاتەوە. ئەوجا بیری خستمەوە کە من لە هەلومەرجێکی هەژارانەی زۆر دژوارا دەژیم، بۆیە هیچ سەیر نیە، چونکە لەم کوخە تەنگو تاریکەدا ئاکنجیم، دایمە نەخۆشو لەشبەبار بم. تەنانەت پێشبینی ئەوەشی **کرد** ئەگەر یەك مانگی دی لێرە وەمێنم، دەمرم.

وگوتی خانووەکانی پوترسبۆرگ زۆر خراپو پیسن، ولە کۆتاییدا لێی پرسیم ئایا هیچم پێویست نیە؟

پێشنیازو عەرزەکەیم هێندە بەلاوە سەیر بوو، بە خۆیشم نازانم بۆچی کەوتمە گریان. ئیدی ئەو وایزانی ئەم فرمێسكو گریانەی من نیشانەی سوپاسگوزاری و منەتباریە، ئیدی گوتی هەمیشە باوەڕی وابووە من کیژێکی دڵپاك، بەسۆزو هەستیارو رۆشنبیرم.

بەلام تا لەو دواییانەدا، تاقیبی تەواوی هەڵسوکەوتو رەفتاری **نەکردووم**، نەیتوانیوە بکاتە قەناعەتی تەواو. پاشان لە تۆی پرسی، وگوتی هەموو شتێکی دەربارەی تۆ بیستووەو زانیوە، زانیویەتی کە تۆ کەسێکی ئابڕومەندو بە ئاکارو رەسەنی، وبەش بە حاڵی خۆی نایەوێ قەرزارباری تۆ بێتو گەرەکیەتی بزانێ ئایا ئەگەر پێنج سەد رۆبڵت، لە بری هەموو ئەو چاکانەی دەرهەق بە منت کردووە، بداتێ بەسە یان نا؟

کاتێ بۆم باس کرد کە ئەوەی تۆ دەرهەقی من کردووەتە هەرگیز بە پارە قەرەبوو ناکرێتەوە، هاواری کرد ئەمانە قسەی هیچن، **ئەمانە** قسەی ناو رۆمانانن، ومن هێشتا گەنجم، و لە ئەندازە پتر شیعرو رۆمانان دەخوێنمەوە، ورۆمان کیژانی گەنج تێك دەداتو خەیاڵاویان دەکات، وکتێبان بۆ ئەخلاق خراپن، وئەو رقی لە هەموو کتێبێکە. ئامۆژگاری

کردم سەبر بکەم تا چەند ساڵێکی دی گەورەترو پوختەتر دەبم، تا حوکمی دروست دەربارەی خەڵکی بدەم، هەنگێ لەگینە تۆزێکیان بناسیت، ئەوجا گوتی بە وردی‌و بە کاوەخۆ بیر لە پێشنیازو عەرزەکەی بکەمەوە، چونکە حەزناکات بۆ کارێکی وەها گرینگ، بەپەلە بڕیار بدات، چونکە پەلەو هەڵچوون‌و سۆزو گوداز، خەڵکانی گەنجی بێ ئەزموونی میناکی من بەرەو هەڵدێری سەرگەردانی دەبات.

**بەلاّم** وێڕای ئەمەش لە ناخی دڵەوە حەزدەکات وەلاّمەکەم ئەرێنی بێ، خۆ ئەگەر داواکەی رەفز بکەم، ناچارە کیژی کابرایەکی بازرگانی موسکۆیی بخوازێت، چونکە سوێندی خواردووە کە برازا خوێرپەکەی لە بەشە میرات بێبەش بکات، پاشان بە زۆر پێنج سەد رۆبڵی بۆ بەجێهێشتم‌و خۆی گوتەنی "بۆ شیرینی.

"و ڵنیای کردم کە لە گوندەکەی ئەودا دەبوژێمەوەو قەڵەو دەبم‌و لەوێندەر لە نازو نیعمەتی ژیانم هەڵدەکێشێت.وحالی حازر یەجگار سەرقاڵە و کۆمەڵێك کاری بەسەردا کەڵەکە بووەو دەبێت فریایان بکەوێ‌و ئێستاش دەرفەتی **نێوان** دوو دیداری گرینگی قۆزتووەتەوەو بە رێبواری هاتووە من بدێنێ.

ئەوسا لێی دا رۆیی، زۆرم بیرکردەوە، شتەکانم لە هەموو رووپەکەوە لێك دایەوە،ماوەیەکی زۆر لە فکران ڕاچووم، دوو دڵی کوشتمی تا بڕیارم دا.

هاوڕێم بڕیارم دا کە شووی پێبکەم.

پێویستە پێشنیازەکەی پەسند بکەم، تاقە کەسێك کە بتوانێ لە بێ حورمەتی‌و شەرمەزاری، لە هەژاری‌و مەینەتی‌و کڵۆڵی رزگارم **بکات**، ئابڕووم بکڕێتەوە، ئەم پیاوەیە، تەنیا ئەوە فریام بکەوێ. لەوەی پتر چیم

گەرەکە؟ لەوەی زیاتر چاوەڕوانی چی لە چارەنووس و قەدەر بکەم.؟
فیدورا دەڵێت بەشەر نابێت لەقە لە بەختی خۆی بدات. فیدورا دەڵێت بەشەر دەبێت مەسڵەحەتی خۆی بزانێ و دەست بە خێرو خۆشی خۆیەوە نەنێت... دەبێ خۆشی و بەختەوەری چی بێ؟

بە هەرحاڵ، دۆستی هەژێرم، من هیچ ڕێگەیەکی ترم لەبەر نیە، ئاخر دەتوانم چی بکەم؟ من سەلامەتی خۆمم نایە سەر کارکردن، خۆ ناتوانم هەتا هەتایە هەر کار بکەم. بچم کارەکەری ماڵان بکەم؟ خۆ لە داخا دەمرم. خۆ کەسیش منی ناوێ. من بەم لاوازی و بێتاقەتی و نەخۆشیە دەبم بە بار بەسەر خەڵکییەوە. هەڵبەتە چاك دەزانم ئەو شوێنەی کە بە تەمام بۆی بچم بەهەشت نیە، بەڵام چی بکەم، چارم چیە هاوڕێم؟ چیم لە دەست دێ، راستت دەوێ هیچ چارێکم نیە.

داوای ئامۆژگاریت لێناکەم، ویستم ئاگادارت بکەم کە بە خۆم هەموو لایەنێکی مەسەلەکەم شەنوکەو کردووە.

ئەو بڕیارەی کە تۆزێ لەمەوپێش پێم گوتیت بڕیاری یەکجارەکیمە،و بە زووترین کات بە بیکوف رادەگەیەنم، چونکە داوای کردووە بە زووترین کات دوا بڕیاری خۆمی پێ رابگەیەنم. دڵێت زۆری پەلەیەو کاری هەیەو ناتوانێ چاوەڕوانی بکات. سەفەری لەپێشەو ناتوانێ لەبەر هەندێ هۆی تورەهات سەفەرەکەی دوا بخات، خودا دەزانێ ئایا لەوێندەر بەختەوەر دەبم یان نا!

چارەنووس و قەدەرم لە دەستی خودایە، خۆم بە دەستی توانای هەمیشەیی موبارەکی ئەو دەسپێرم. بەڵام من خۆم یەك لایی کردووەتەوەو بڕیاری خۆم داوە. دەڵێن بیکوف پیاوێکی پیاوانەو

میهرەبانە. ڕێزوحورمەتم دەگرێت، لەوەیە منیش فێری ئەوە ببم کە حورمەتی بگرم، ئیدی مەرجی زەوجین هەر ئەوەیە.

ماکار ئالکسیوفیچ، من تۆم لە هەموو شتێك ئاگادار کردەوە، دڵنیام بە خۆت تەقدیری ئەوە دەکەی کە لە چ عەزابو مەینەتو خەمو پەژارەیەکدام.

هەوڵی ئەوە مەدە ژێوانم بکەیتەوە، چونکە هەر هەوڵێك لەو بارەیەوە بدەی بێسوودە. هەوڵبدە لە دڵی خۆتدا، هەر هەموو ئەو سۆنگەو ئەنگێزانە هەڵسەنگێنە کە بوونە مایەی ئەم بڕیارەم. لە سەرەتاوە یەجگار دوو دڵو نیگەران بووم، بەڵام ئێستا هێورو ئارامم. نازانم ئایندە چی بۆ من پێیە. هەر چیەك دەبێ با ببێ، ویستی خوا ڕەتبوونەوەی بۆ نیە!...

ئەوە بیکوف **هات**، بۆیە نامەکەم تەواو ناکەم. زۆر شتی تر هەبوون کە دەمویست بۆتی بگێڕمەوە. ئەوە بیکوف هاتە ژوورەوە!.

*ڤرڤارا ئەلکسیوڤنا، ژیکەلەکەم:* *٩/٢٣*

بە پەلە بەرسڤی **نامەکەت** دەدەمەوە، دەمەوێ بەر لە هەموو شتێك ئەوەت پێ بڵێم کە زۆر سەرم سوڕما.

بەڕاستی هەموو ئەم شتانە غەریبو هەڤدژن، دوێنێ گورشکوف-مان بەخاك سپارد. بەڵێ ڤارینکا گیان، شتەکە وایە. کەواتە شتەکە وایە ڤارینکا، هەڵبەتە بیکوف رەفتارێکی پیاوانەی کردووە، تۆش، ئازیزەکەم یەکسەر و بێ چەندو چوون پێشنیازەکەیت قەبوڵ کردووە.. بەڵام... هەڵبەتە هەموو شتێك بە دەستی خودایە، راستە، بێ هیچ چەندو چوونێك بەدەستی خودایە... من ئەوە دەزانم...

دەبێ ئەمەش ڕەزای خوای **لەسەر** بێت. ڕەزاو ویستی خوا لەسەرووی هەموو شتێکەوەیە، ویستی خودا دەبێ بێتەدی. ویستی خودا رەحمەتەو سنووڕو ئەندازەی نیە، چەندو چوونی نیە، بەڵام ئێمەمانان پەی بە نهێنییەکانی نابەین...

چارەنووسی بەشەرانیش وەکو ویستی خودایەو ئەم سەرو ئەوسەری دیار نیە، کەس پەی بە نهێنییەکانی نابات. دیارە فیدوراش هەڤدەنگتە.

من دڵنیام کە بیکوف شادیو خۆشی تۆی دەوێ، تۆ بەختەور دەبیت، ژیانێکی خۆشو ئاسانت دەبێ، لە هیچت کەم نابێت کۆترەکەم، روحەکەم، فریشتە چکۆلەکەم، باڵندە نازەنینەکەم... بەڵام ڤارینکا گیان بۆچی ئەوەندە بەپەلە؟... بەڵێ، کار... ئاغای بیکوف زۆر مژوڵو

پڕکارە، دەبێ فریای کارەکانی بکەوێ... هەڵبەتە هەموو کەسێك لەم دنیایەدا کاری هەیە.. ئەویش وەکو خەڵکی دی کاری هەیە... کاتێ کە لە دەف تۆ دەرچوو بینیم، پیاوێکی زەلام و بە هەیبەتە، زۆر بە هەیبەتە.. بە هەرحاڵ ئەمە گرینگ نیە، مەسەلەکە ئەمە نیە کە بە هەیبەتە یان نا...

بەڕاستی من ئێستا زۆر بێ حەواسم، بیرم پەرت و پەشێوە.. کۆنترۆڵی بیری خۆم پێناکرێت، نازانم دەمەوێ چ بڵێم، **لێرەدا** خاڵێکی گرینگ هەیە، زۆر گرینگ: چۆن نامە بۆ یەکدی بنێرین؟ ئەدی من؟ من؟

چۆن دەتوانم بە تاقی تەنیا هەڵبکەم؟ چۆن ئیدارە دەکەم؟ بەڵێ فریشتە چکۆلەکەم من هەموو شتێکم لێکداوەتەوە.. بەڵێ لە دڵی خۆمدا لێکم داوەتەوە.

**وەکو** چۆن تۆ داوات کردووە لێکم داوەتەوە، هەڵمسەنگاندووە... هەموو ئەو بەڵگەو بیانووانەم، کە تۆ هێناوتنەوە، لێکداوەتەوە. تازە خەریك بوو لە نووسینەوەی لاپەڕە بیستی دەستنووسەکە دەبوومەوە، کە لە پڕ هەموو ئەم ڕووداوانەم بەسەرا داڕژا ئازیزەکەم. کەواتە دەڕۆی ڤارینکا گیان.

بەڵام تۆ بەر لەوەی سەفەر بکەی پێویستت بە کۆمەڵێك شتە، وەکو: پێڵاو، جلك و بەرگ. من موغازەیەك لە شەقامی گوروخوفایا دەناسم، بیرتە کە جارێکیان باسی ئەو موغازەیەم بۆ کردبووی؟ بەڵام نا... نا.. ئەوە تۆ چ دڵێی ڤارینکا گیان؟ تۆزێ بیر بکەوە! مەبەستم ئەوەیە کە ناتوانی ئێستا سەفەر بکەی... مەحاڵە.. ئەمە چەندوچوون هەڵناگرێ!

مەبەستم ئەمەیە کە زۆر شت هەیە دەبێ پێش سەفەرەکەت بیکڕی، دەبێ گالیسکەیەکیش بگریت. ئەمە جگە لەوەی کەش‌و هەواکە باش نیە، کەشەکەی گۆڕی، لە پەنجەرەکەوە بڕوانە دەرێ بزانە چ بارانێک دایکردووە! بارانێکی خراپ دایکردووە، باران بە باوە، بایەکی سارد... ئەوجاش گەرەکتە.. سەرمات دەبێ فریشتە چکۆلەکەم.. ڕوحت سەرمای دەبێ! مەبەستم ئەوەیە تۆ، تۆ کە ئەوەندە لە خەڵکی دەترسیت، بەم هەموو سلۆکیەتەوە، گەرەکتە سەفەر بکەی، دەگەڵ ئەو پیاوەدا بڕۆیت؟ ئەدی من؟ لەگەڵ کێدا بم، بە تەنیا بم؟

دەزانم فیدورا هانت دەدات، دەڵێت بەختەوەری تۆ لەوێندەرە!... بەلام فیدورا ژنێکی خۆسەری بێ سەروبەرە، دڵڕەقە، گەرەکیەتی من ماڵوێران بکات. ئەمشەو هەموو شەوەکە، هەر سەرقاڵ دەبی دایکەلێ؟ ئەمشەو بۆ نوێژی شێوان نایەی بۆ کڵێسا؟ حەزدەکەم بێم و لەوێندەر بتبینم. بەڵێ، ڕاستە، ئازیزەکەم، زۆر ڕاستە کە تۆ کیژێکی ڕۆشنبیرو خوێنەواری، داوێن پاک‌و هەستیاری، بەلام بۆ ئەو باشتر وایە کیژە بازرگانە مۆسکۆییەکە بخوازێ!..

تۆش پێت وانیە ڤارینکا گیان؟ باشتر وایە ئەوکیژە بازرگانە هەڵبژێرێت، کەواتە با ئەو بخوازێت. هەرکە دنیا تاریک داهات بە پەلە دێم بۆ سەردانت‌و نزیکەی سەعاتێك، یان تۆزێ کەمتر دەمێنمەوە، لەم وەرزەدا ڕۆژ کورتە ،دنیا زوو تاریك دەبێت. سەرێکت لێدەدەم ژیکەلەکەم. تۆ هەنووکە چاوەڕوانی بیکۆی. کەی ئەو ڕۆیی، ئەوساکە... چاوەڕوانم بکە ڤارنیکا. ئەم ئێوارەیە سەرت دەدەم.

*ماکار دیوشکین*

***ماوڕێی ئازیز، ماکار ئالکسیوڤیچ*** ***٩/٢٧***

ئاغای بیکوف گوتوویەتی کە دەبێ بەلای کەمەوە سێ دەست کراسی ئاوریشمی هۆڵەندیم **هەبێت**، بۆیە دەبێ دوو خەیات پەیدا بکەم، تا دوو دەستی دیکەم بۆ بدورن، چونکە کاتێکی زۆر کەممان بە دەستەوە ماوە.
ئاغای بیکوف، زۆری پەلەیە، بەردەوام توڕەیەو دەڵێت من زۆر بەم شڕو شیتاڵو شڕەو پڕانەوە ماتەڵو گیرۆدەم. ئەم خەمو خەمباریە زۆری درێژە کێشا. پێنج ڕۆژی دی زەماوەند دەکەینو دوای ئەوە یەکسەر سەفەر دەکەین. ئاغای بیکوف پەلەیەتیو دەڵێت نابێ وەختی خۆمان بە شتی توڕەهاتەوە بە فیڕۆ بدەین.
زۆر نیگەرانم، نیگەرانی هەموو شتێکم، نیگەرانی هێزو شنگی لێبڕیووم، ماندووم، خۆم بەپێوە ناگرم. زۆر کار هەیە دەبێ فریایان بکەوم، هێندە سەرقاڵم نام پەرژێ سەری خۆم بخورێنم، لە دڵی خۆدا دەڵێم خۆزگە ئەم شتە، هەر نەبوایە.

ئا، باش بوو بیرم کەوتەوە: ئاوریشمو تۆڕی تەواومان **نیـە**، بۆیە دەبێ هەندێکی دی بکڕین. چونکە ئاغای بیکوف دەڵێت حەز ناکات هاوسەرەکەی جلکی وەکو جلکی ئاشپازو کارەکەرانی لەبەردا بێ، و دەبێ بەجۆرێ بم کە "هەر هەموو ژنانی موڵکدارە دراوسێکانی موڵکەکانی ئەو وەکو کەو بچن" ئەمە دەقی قسەکەی ئەوە.

بۆیە، ماکار ئالکسیوڤیچ، تکات لێدەکەم، لوتف بفەرموو و بچۆ مەدام شیفون لە شەقامی گوروخوفایا ببینەو پێی بڵێ یەکەم چەند خەیاتێکمان بۆ بنێرێت، ودووەم ئەو زەحمەتە بکێشێتو بێت بۆ لای من. ئەمڕۆکە ماندووم.

ماڵە تازەکەمان؟! زۆر ساردە، ماڵەکەمان زۆر خراپ بە یەکا دراوە، پوری ئاغا بیکوف یەجگار پیرە، هێندە پیرە بە حاڵ هەناسەی دێو دەچێت، دەترسم بەر لە سەفەرەکەمان بمرێت. بەڵام ئاغا بیکوف دەڵێت ترست نەبێ، دەبوژێتەوە.

ئاغای بیکۆف بە خۆی لەگەڵ ئێمەدا ناژی،ماڵەکەمان زۆر پەشێوە، هەموو خزمەکارەکان خۆ دەدزنەوەو نازانم کێوە چوون. تەنیا فیدورا هەندێجار فریامان دەکەوێو بە کارەکانماندا ڕادەگات، شاگردەکەی بیکوف کە دەبوایە سەرپەرشتی **هەموو** شتێکی کردبایە، سێ دانە ڕۆژە، بێ ئەوەی هیچ بڵێ، غەیب بووە. ئاغا بیکوف هەموو بەیانیەك سەرێکمان دەدات، هەمیشە پەستو بەگلەوگازاندەیە، تەنانەت دوێنێ دەگەڵ بەڕێوەبەری ماڵەکەدا کردی بە شەڕو لێیداو مەسەلەکە بەرادەیەك گەورە بووەوە کە کار گەییە پۆلیس.. کەس نیە ئەم نامەیەی پێدا بنێرم، بۆیە بە پۆستەدا بۆتی دەنێرم. ئا..

باش بوو بیرم کەوتەوە. بە ئەرك نەبێ بە مەدام شیفون بڵێ کە دەبێ ئاوریشمەکە بەو نموونەیە بگۆڕێت کە دوێنێ لەسەری ڕێك کەوتین، وپێویستە بە خۆی بێت بۆ لامو ئەو ئاوریشمەم نیشان بدات کە هەڵی بژاردووە.

هەروەها ئەوەشی پێ بڵێ کە من رەئیم دەربارەی بلوزە قۆڵ ئەڵقە ئەڵقەکە گۆڕیوە، پێم وایە پێویستە بە قولاپدۆزی بێتە چنین، هەروەها یەکەم پیتی ناوەکان لەسەر دەستەسڕو سەر تەپڵەکەکان، دەبێ گوڵدۆزی بکرێ، تێ دەگەی؟ لە بیرت نەچێت، گوڵدۆزیم دەوێ ها. ئا.. شتێکی دیکەش هەبوو خەریك بوو بیرم دەچوو: تکات لێدەکەم، توخودا پێی بڵێ کە گەلاکانی سەر پالتۆکە بەرجەستەدۆزی بکات و لق و پۆپەکان ئاسایی بن، هەروەها یەخەکەی بە تۆڕو تۆیەی پان بکات. تکات لێدەکەم ماکار ئالکسیوڤیچ، لە بیرت نەچێ، ئەمەی پێ بڵێ.

دۆستت

ڤ. د.

پەراوێز:

زۆرم لەبەر گرانە کە بەم وردە فەرمایشانەم ئەزیەتت دەدەم. هەست بە عەزابی ویژدان دەکەم. پێرێکەش هەموو دانی بەیانی لەبەر خاتری من و بە ئیشی من، سەرانسەری شار گەڕایت..

بەڵام چارم چیە؟ لە ماڵەکەماندا کەس بە کەس نیە، خۆیشم نەخۆشم. تکایە لێم مەڕەنجێ، گلەییم لێ مەکە ماکار ئالکسیوڤیچ، بەجگار دڵتەنگ و نیگەرانم! خوا دەزانێ چ شتێکم لە رێیە دۆستی ئازیز، ماکار ئالکسیوڤیچی نازدارم؟ دەترسم تەماشای ئاینده بکەم، دڵم هیچ شتێکی باشم پێ ناڵێ، بە ترسێکی تەموومژاوییەوە دەژیم.

پەراوێز:

هاوڕێم، تـوبی توخـودا، هـیچ شـتێك لـەو شـتانەی کـە لـە نامەکـەدا بـۆم نووسیویت، لە بیر نەکەی. زۆر دەترسم قسەکانم وەکو خۆیان نەگەن.. لە بیرت بێ برودری نەك قولابدۆزی.

ف. د.

*خانمی مەژی، ڤرڤارا ئالکسیوڤنا:* *٩/٢٧*

هەموو **فەرمایشەکانم**، موو بە موو، دەقاو دەق، وەکو خۆی بۆ جێبەجێ کردوویت.

مەدام شیفون دەڵێت بە خۆیشی بیری لەوە کردبووەوە کە پیتی یەکەمی ناوەکان برودری دۆزی بکات، گوتی ئەمەیان –ئەگەر بە هەڵە نەچوویم– جوانترو لەبارترە، چونکە بەڕاستی نازانم لەو رووەوە چی گوت و من سەر لەو شتانە دەرناکەم.

ئا، لە نامەکەتدا باسی مەسەلەی (دالبر)یت کردبوو، ئەویش باسی هەمان شتی کرد. بەڵام ئازیزەکەم بیرم نەماوە لەو بارەیەوە **چی** گوت.

ئەوەندە دەزانم زۆری لەو بارەیەوە ڕێسا، بەڕاستی ژنێکی چەنەبازو سەیرە، چی گوت؟ نازانم، بە هەرحاڵ بەخۆی هەموو ئەو شتانەت بۆ باس دەکات کە بە گوێی منیا دا، ڤارینکا گیان بەڕاستی گێژو وێژ بووم، ئەمڕۆ بۆ دایەرە نەچووم.

بڕوا بکە تۆ بە خۆڕایی خەمت لە خۆ هێناوە، هیچ نارەحەت مەبە ئازیزەکەم، ئامادەم لەبەر خاتری تۆ، لە پێناوی ئاسودەیی تۆدا هەموو موغازەکانی شار بگەڕێم.

لە نامەکەتدا نووسیوتە لە **ئاینده** دەترسیت، تەنانەت ناوێری نیگایەکی ئایندەش بکەی. ئەمە ترسی ناوێ، سەعات شەشی ئەم ئێوارەیە هەموو شتێکت بۆ روون دەبێتەوە: مەدام شیفون بە خۆی دێت و سەرێکت دەدا.

نیگەران مەبە، گەشبین بە ڤارینکا گیان، هەموو شتەکان تەرتیب دەبن، بە باشترین شێوە جێبەجێ دەبن، بەس تۆزێ سەبرت هەبێ، بەلام سەبارەت بە (دالبر) ئەم (دالبر)ە نەحلەتیە لەبەر چاوم لا ناچێت، دوای (دالبر) ببڕێتەوە. **دەمویست** بێم و سەرێکت لێبدەم فریشتە چکۆلەکەم، پڕ بەدڵ دەمویست سەرت بدەم. راستت دەوێ دووجاریش تا بەر دەرگاکەتان هاتم.. بەلام ئەم پیاوە، بیکوف، ببورە، مەبەستم ئاغای بیکوفە ئەوەندە گرژومۆن و پەست بوو.. نەوێرام ریسك بکەم... گرینگ نیە!

*دۆستت*

*ماکار دیوفشکین.*

*مێژا ماکار ئالکسیوڤیچی ئازیز،* **٩/٢٨**

**تکات** لێدەکەم بەپەلە خۆت بگەیەنە لای زێڕنگەرەکەو پێی بڵێ ژێوان بوومەتەوە، گوارە مرواریو زومڕودەکانم بۆ دروست نەکات، ئاغای بیکوف دەڵێت ئەمە ئیسرافکاریەکی فرەیە، زۆری تێدەچێت، گرانە، زۆر پەستو تورەیە.

دەڵێ گیرفانەکانیمان هەڵتەکاندووەو خەریکە تالانی دەکەین، تەنانەت دوێنێ بە ئاشکرا گوتی ئەگەر بیزانیبا ئەم هەویرە ئەو هەموو ئاوە دەکێشێت، لە سەرەتاوە خۆی لە قەرەی زەماوەند نەدەدا.

دەڵێت هەرکە زەماوەندەکەمان **تەواو** بوو یەکسەر دەڕۆین، سەفەر دەکەین، کەس دەعوەت ناکەین، وپێویست ناکات بیر لە رەقسو سەماو ئاهەنگ گێڕان بکەمەوە، خۆ هێشتا بۆ جەژنی سەری ساڵوکریسمیس-ش زۆری ماوە.

بەڵێ، ئەوە قسەکانیەتی! لێ خودا شایەدە من هیچ پێویستم بەو شتانە نیە، داوام نەکردبوون. ئاغای بیکوف بە خۆی لە سەرەتاوە سوور بوو لەسەر کردنی **ئەو** شتانەو رای سپاردبوو. ناوێرم وەڵامی بدەمەوە، یەجگار گرژو پەستو تورەو تڕۆیە. ئاخۆ ژیانم چۆن دەبێت؟

*کۆترەکەم، فرڤارا ئالکسیوڤنا:* *٩/٢٨*

**من**، مەبەستم ئەمەیە کە زێڕنگەرەکە دەڵێت باشە، قەیدی نیە.
بەڵام سەبارەت بە خۆم، دەمویست لە سەرەتای ئەم نامەیەوە ئەوەت پێ ڕابگەیەنم کە نەخۆش کەوتوومو ناتوانم لە جێگا بێمە دەرێ.
ئەم نەخۆشیە دوابڕاوە لە کاتێکی خراپدا بەرۆکی گرتم.. کاتی نەخۆشی بڕا بوو ئێستا نەبێ!
لە کاتێکا سەرمام **بووە** کە یەك دنیا کاروباری بەپەلە هەن دەبێ فریایان بکەوم، لە کاتێکا کە تۆ پێویستت بە منە، تف لەم بەختو ناوچەوانە! دوای هەڵامەتو پەسیو ببڕێت.. دەبێ ئەوەشت پێ بڵێم بۆ نەگبەتیو بەد شانسی من، ئەمڕۆ جەنابی سەرۆك تورە بووە، لە ئیمیلیان ئیڤانوڤیچ تورە بووەو هاواری بەسەردا کردووەو کابرای بەستەزمان لە ترسا زراوی تۆقیوەو مردووە. ژارۆ! دەبینی هێشتاش لە هەموو شتێکت ئاگادار دەکەم. ئەم شتە ناخۆشانەت پێدەڵێم. دەمویست شتێکی دیکەشت پێ بڵێم، بەڵام دەترسم پەستو دلگیرت **بکەم**، چونکە ژیکەلەکەم، من، بەخۆت دەزانی کابرایەکی ساکاری گەوجو کۆلکە خوێنەوارم، هەرچیەکم بە خەیاڵدا بێت دەینووسم، لەوەیە لێرەو لەوێ شتێکی... تیا بدینی.. بە هەر حاڵ گرینگ نیە!

*دۆستت*

*ماکار دیوفشکین*

*ڤرڤارا ئالكسیوڤنا، هاوڕێ ئازیزەكەم:* ٩/٢٩

**ئەمڕۆ** فیدورام بینی، كۆترەكەم. گوتی سبەی شاییەكەتانە، ودوو سبەی سەفەر دەكەی، ئاغای بیكوف لە ئێستاوە ئەسپی ئامادە كردوون. سەبارەت بە جەنابی سەرۆك، لە دوا نامەمدا بۆم باس كردبووی ئازیزەكەم. ئا، بەڵێ... شتێكی دیكە: سەبارەت بە وەسڵی حیساباتی موغازەكەی شەقامی گوروخوڤایا، بە هەر هەموویدا چوومەوە، هەموو حیسابەكان تەواون.

بەڵام نرخی شتەكانیان گرانە. **ئیدی** ئاغا بیكوف بۆچی گلەیی لە تۆ دەكات، داخی خۆی بەسەر تۆدا دەڕێژێ؟ هەر شادو بەختەوەر بی ئازیزەكەم!

شادم بەشادیت! ئەو كاتانەم خۆشە كە بزانم تۆ شادو بەختەوەری، زۆر حەزم دەكرد بێم بۆ كڵێساو بەشداری ڕێوڕەسمی شاییەكەت بكەم ئازیزەكەم، بەڵام ناتوانم، پشتم داویەتە ژان. با بێمەوە سەر باسی نامەكانمان، ئەم شتە زۆری نیگەران و نارەحەت كردووم: لەمەودا كێ نامەكانمان دێنێ و دەبات، دایكۆڵ؟

دەزانی تۆ دۆست و پشتیوانێكی باش بووی بۆ فیدورا، **ئازیزەكەم**.
زۆر لەگەڵی باش و بە حەوسەڵەو دڵاوا بووی. زۆر چاكت كردووە، كارێكی فرە باشت كردووە ئازیزەكەم! خودا پاداشتی هەموو چاكەكانت

دەداتەوە، **خودا** چاکەی چاکەکاران لە بیر ناکات، خێرت دێتەوە ڕێی، چاکە بکەو بیدە بەئاوا، چاکەت دێتەوە ڕێ، ئەمە عەدالەتی خودایە، درەنگ یان زوو هەر دێتە دی. ژیکەلەکەم زۆر شتم هەیە حەز دەکەم بۆتی بنووسم، قسەم زۆرە. بە من بێ هەموو سەعاتو هەموو دەقیقەیەك هەر بۆت بنووسمو بۆت بنووسم، هەموو شتێکت بۆ بگێڕمەوە، لە هەموو شتێکت ئاگادار بکەم! هێشتا یەکێك لە کتێبەکانی تۆم لەلایە، (حیکایەتەکانی بیلکین). ڤارینکا گیان با ئەم کتێبە لەلای من بمێنێتەوە، ئەم کتێبەم لێ مەسەنەوە، پێشکەش بە منی بکە، با دیاری تۆ بێ بۆ من کۆترەکەم. نەك هەر لەبەر ئەوەی زۆرم دڵ پێوەیە ئێستا بیخوێنمەوە، بەڵکو لەبەر ئەوەی زستان بەڕێوەیە، وبە خۆت دەزانی شەوگاری زستان درێژە، پیاو دڵی دەگیرێ، هەنگێ خۆم بە خوێندەوەی مژول دەکەم.

ڤارینکا گیان بڕیارم داوە لێرە بگوازمەوە، بۆ ماڵەکەی ئێوە بار بکەمو لەگەڵ فیدورادا بە شەریکی بەکرێی بگرم. حەز ناکەم لە ئێستا بەدواوە لەم ژنە شەریفە دابڕێم. بەڕاستی ئافرەتێکی بە هیمەتو ئیشکەرو کۆشیارە. دوێنێ ڕۆییشتمو هەموو کون و کەلەبەرێکی ماڵە چۆڵو هۆڵەکەی تۆ گەڕام، هێشتا هەموو شتەکان لە جێی خۆیان بوون. مێزی خەیاتیەکەت، گوڵدۆزیو ئیشەکانت لە شوێنی خۆیان بوونو کەس دەستی لێ نەدا بوون:

ئیشەکانت لە سووچێکی ژوورەکەدا کەڵەکە بوو بوون، تاوێکی باش ڕوانیمە گوڵدۆزیەکانت، یەک دوو پارچەو سەرە مقەستان لێرەو لەوێ کەوتبوون. داوێکت لە دەوری یەکێك لە نامەکانی منەوە پێچا بوو.

لە چاوی مێزەکەتدا پارچە کاغەزێکم دۆزییەوە کە لێی نووسرا بوو "ئاغای ئازیز، ماکار ئالکسیوڤیچ، زۆر بە پەلەمە..." تەنیا ئەوەندەی لێ نووسرا بوو و هیچی تر. دیارە دەبێ یەکێك هاتبێ بەسەراو نووسینەکەی پێ بڕی بێ‌و نەی هێشتبێ گرینگترین قسەی دڵی خۆتم بۆ بنووسیت. تەختە خەوە چکۆلەکەت هێشتا لە جێی خۆیەتی، لە پشت پەردەکەیە.. کۆترەکەم!! جارێ **خودا** حافیز، توبی توخودا، بە زووترین کات وەڵامی ئەم نامەیەم بدەوە، با زۆر چاوەڕوان نەبم.

*ماکار سیوشکین*

***ماکار ئالکسیوڤیچ، دۆستی ئازیز!*** ***٩/٣٠***

تــەواو، چــارەنووس هەرچـیەك بــێ رەتبوونــەوەی نیــە، ئیــدی ئــەوە چارەنووسی منە! نازانم ئایندەو چارەنووسم چ دەبێت.

بەڵام گوێڕایەڵو ملکەچی ویستو مەشیەتی پەروەردگارم.

سبەی لێرە دەڕۆین، سەفەر دەکەین، بۆ دوا جار ماڵاوایی لـە تـۆ دەکـەم ئــەی دۆســتی ئــازیزو گرانقــەدرم، ئــەی ئــەو کەســەی چــاکەی دنیــات بەسەرمەوەیە، ئەی ئەو کەسەی جێگـەی بابـت بـۆ گرتبوومـەوە، خەفـەت بۆ من مـەخۆ، بـە خۆشـیو شـادی بـژی، و هەمیشـە یـادم بکـە، لـە بـیرم مەکە. لە خودا دەپاڕێمەوە بارانی رەحمەتی خۆیت بەسەرا داباریێنیّ!

زۆرت بیر لێدە کەمەوە، لە بیرو هۆشو نوێژو دوعاو نزاکانمدا فەرامۆشـت ناکەم، دوعای خێرت بۆ دەکەم.

ئیدی تەواو، ئەو قۆناغەی ژیانم تەواو بوو!

من ئەوەندەم یادگارو بیرەوەری خـۆش نیـە کـە لەگـەڵ خـۆدا بـۆ ژیـانی تازەمی بەرم، بۆیـە ئـەوەی لـە هـەموو شـت بـۆ مـن جـوانترو بـەنرخترە، چــاکەکانی تۆیــە، ئــەو چــاکانەیە کــە دەگــەڵ منــت کــردووە، یــادو بیرەوەرییــەکانی تۆیــە، یادگــارو بیرەوەرییــەکانی تــۆ پایەیــەکی هــەرە بەرزیان لە دڵی مندا دەبێت.

تۆ تاقە دۆستی منی، تـۆ تاقـە کەسـی کـە بەڕاسـتی خۆشـت ویسـتووم.. هـەموو شـتێکم بـە چـاوی خـۆم بـینی، و بـۆم دەرکـەوتووە کـە چـەندت

خۆشویستووم، کە بزەیەکت بە سیمای منەوە دەبینی لە خۆشیا لە پێستی خۆت نەدەهێوریت، بە دێرە نووسینێکی من ئەو پەڕی خۆشحاڵ دەبوویت. جا ئێستا دەبێ خۆت بەوە رابێنی کە چۆن بەبێ من بژیت... چۆن لە دوای من بە تەنیا هەڵدەکەی!

کێ بایەخت پێدەدات، دۆستە هێژاکەم تاقە دۆستەکەم؟ کتێبەکەم، مێزو مەکینەی خەیاتیەکەم، ئەو نامەیەی کە لە چاوی مێزەکەمدا دۆزی بووەتەوەو تەواوم نەکردبوو هەر هەمووی بۆ تۆ، بە تۆی پێشکەش دەکەم.

بە تایبەتی نامە تەواو نەکراوەکە کاتێ کە تەمەشای دەکەی، دەتوانی بە خەیاڵ تەواوی بکەی، وبە کەیفی دڵی خۆت ئەو وشانەی بۆ زیاد بکەی کە حەزت کردووە لە منیان بژنەوی، یان بۆم نووسیبای، خودا دەزانێ چم لە خەیاڵدا بووە بۆتی بنووسم!..

ناو بە ناو یادێکی دۆستە کۆڵەکەت، دۆستە هەژارو بێنەواکەت، ڤارینکای بەلەنگاز، کە یەجگار ئلبەستەی تۆ بوو، بکەوە. هەموو نامەکانت لەلای فیدورایە، لە چەکمەجەی سەرەوەی کۆمەدیەکەیدایە.

نووسیوتە کە نەخۆشیت، ئاغا بیکوف حەز ناکات فەمۆ لە ماڵ وەدەرکەوم. نامەت بۆ دەنووسم هاورێم، بەڵێنت دەدەمێ نامەت بۆ بنووسم، بەڵام هەر خودا خۆی دەزانێ چی دێتە پێشێ.

کەواتە هاورێم، دۆستی ئازیزم، براکەم، ئازیزەکەم بۆ هەتا هەتایە بە خودات دەسپێرم!... ئاه... ئەگەر ئێستا لێرە دەبووی خۆم دەمزانی چۆن لە هەمێزم دەگرتیتو ماچ بارانم دەکردی! بە دوعا هاورێکەم، بە دوعا بە دوعا، هەر شادو سەلامەت بی، هەتا ماوم دوعای خێرت بۆ

دەكەم. پەحا كە دڵم تەنگە! چ خەمێكی قورس چۆكی بەسەر سینگما داداوە. ئاغا بیكوف بانگم دەكات.

*هاوڕێی هەمیشەدڵسۆزت*

*ف. د.*

پەراوێز:

روحم، سەرڕێژی خەمە، دەروونم لێوان لێوی روندكە.. گریان ئەوكی گرتووم‌و خەریكە دەم خنكێنێ، خەفەم دەكات. بە دوعا، خودایا دەردی جودایی چ گرانە! لە بیرم مەكە، هەرگیز هاوڕێ كڵۆڵەكەم، ڤارینكای بەلەنگاز لە یاد مەكە!.

**

***ڤارینکا، ئازیزەکەم، کۆترەکەم، سێوو ئیمانم ڤارینکا!***

ئەوا بردیانیت، دەڕۆی، **سەفەر** دەکەی. خۆزیا ڵیان دەرهێنابام، و تۆیان بەو جۆرە لێ دوور نەخستبامەوە! ئاخر چۆن توانیت ئەمە بکەی؟ تەمەشا، تۆ لەلایەکەوە دەگریت و لەلایەکی ترەوە دەڕۆی، سەفەر دەکەی! تۆزێ لەمە پێش نامەیەکی تۆم پێ گەیی، نامەیەکی فرمێسکاوی. کە ئەمە وادەگەیەنێ حەزناکەی بڕۆی، سەفەر بکەی، یانی بە تۆبزی دەتبەن، لە منت دادەبڕن، یانی تۆ دڵت بە حاڵی من دەسووتێ، یانی خۆشت دەوێم!

ئیدی چۆن و لەگەڵ کێدا دەژیت؟ **دڵە** چکۆلەکەت لە داخ و خەما، لە بێزاری و تەنیاییدا دەتوێتەوە. خەم وەکو خۆرە دەداتە دڵە چکۆلەکەت،داخ و کەسەر وێرانی دەکات. لەوێ نەخۆش دەکەوی، سەرمات دەبێ!

نیگەرانی ڵە چکۆلەکەت وشک دەکات، دڵت لە خەما شەق دەبات. لەوێندەر دەمریت، لەو خاکە شێدارەدا دەت نێژن، لەو دوورە وڵاتەدا، لەو غەریبیەدا، کەسێك نابێ بۆت بگری، تاقە فرمێسکێك لەسەر گۆڕەکەت بڕێژێ!

ئاغای بیکوف فریای گریان **ناکەوێ**! هەر خەرێکی ڕاوەکەرویشکی خۆی دەبێت.. ئاخ ڤارینکا، ڤارینکا گیان! بۆ ئەو بڕیارەت دا؟ چۆن دڵت هات ئەو بڕیارە بدەی؟ چیت بە خۆت کرد، چیت بە خۆت کرد؟ ئەم نەهەقیە

چ بوو لە خۆتت کرد؟ ئەوانە لەوێندەر لەگۆڕت دەنەن، هێندەت کار پێدەکەن دەتکوژن فریشتە چکۆلەکەم!... ئـاخر تۆ لە پەڕەی گوڵ ناسکتری، یەجگار لاوازی ڤارینکا! نازانم منی گەوج ئەوسا لە کوێ بووم؟ چاوانی منی گەوجی خلەفاو تەمەشای کوێیان دەکرد؟ لە جیاتی بەرهەڵستی تەواوی ئەم کارە بکەم... بەڵێ.. لە جیاتی ئەوەی گەوجێکی کەڕو کاس، وکوێرو نابینا بووم... باشارم بەسترا بوو. نە بیرێکم کردەوە، نە شتێکم بینی، نە ناڕەزاییەکم دەربڕی، لە تۆ وایە کاری هەرە دروستی من ئەمەیەو تەواو، دەتگوت هیچ پەیوەندییەکی بە منەوە نیە، کەوتمە ناو بازاڕ، موغازە بە موغازە بە دوای دالبرو قولاپدۆزیو گوڵاپتوونو گوڵدوزی دا دەگەڕام...

نا، ڤارینکا گیان، نا، ئەمە قەبوڵ ناکەم، با لەم نەخۆشیە هەستمەوە، رەنگە سبەی باشتر ببم، هەنگێ هەڵدەستم، لە ماڵ وەدەردەکەوم... خۆم دەخەمە ژێر پێچکەی گالیسکەکەتەوەو نایەڵم بڕۆی، نایەڵم سەفەر بکەی! ئاخر ئەمە چیە؟ بیرێ لە خۆت ناکەیەوە؟ بە چ هەقێ ئەمە دەکەن؟

منیش دەگەڵتا دێم، بە غار دووی گالیسکەکەت دەکەوم، ئەگەر لەگەڵ خۆتم نەبەی هێندە بە دووی گالیسکەکەتدا غار دەدەم تا هەناسەم لەبەر دەبڕێ، تا روحم دەپڕوکێ وگیانم دەردەچێ.

باشە تۆ دەزانی بۆ کوێ دەچی؟ دەزانی ئەو شوێنەی بۆی دەڕۆی چۆن شوێنێکە؟ چ شتێك لەوێندەر چاوەڕوانتە؟ ئەگەر نازانی، وەرە لە من بپرسە، من دەزانم گیانەکەم، با من بۆتی باس بکەم! بیابانێکی کاکی بە کاکی، وشكو برینگ، تا چاو هەتەر دەکا هەر دەشتە، دەشتێکی وشكو

برینگ، سافو تەخت، دڵێی ناولەپی **دەستە**! ئەو ژنە جووتیارانەی لەو دەڤەرو وڵاتە دەژین، هەموو شرپودرپو دڵڕەق، نە هەستیان هەیە نە سۆز، جووتیارەکانیان لەوان خراتر، شرو شپرێو، هەمیشە سەرخۆش وەمەستن، ئێستا، لەم وەرزەی ساڵدا، گەلای درەختان رژاوە، هەموو رووتو قووت، دایمەی خوا بارانە، دنیا زۆر ساردە، بەڵێ تۆ بۆ ئەو شوێنە دەڕۆیت، سەفەر دەکەیت!

ئاغای بیکوف، لەوێندەر شتێکی هەیە خۆی پێوە بخلافێنی، خۆی پێوە مژول بکات، دەگەڵ کەروێشکانو راووشکاری خۆیدا دەژی، ئەدی تۆ، تۆ چی دەکەی؟ هیچ دەورێکت نابێ، جگە لەوەی ژنی بابایەکی موڵکداری گەورە بی.

جا فریشتە **چکۆلەکەم**! تەمەشایەکی خۆت بکەو پێم بڵێ ئاخۆ تۆ لەو جۆرە ژنانەی، لە ژنی بابایەکی موڵکداری گەورە دەچیت؟... ئاخر چۆن ئەم هەموو شتە رووی دا ڤارینکا گیان؟ ئیتر نامە بۆ کێ بنووسم؟ بەڵێ، بیرێ لەمە بکەوە گیانەکەم، لە خۆت بپرسە: "ئیدی نامەکانی بۆ کێ بنێری؟"

ئیدی بە کێ بڵێم دایکەلێ؟ کێ بەم ناوە خۆشو ناسکەوە گاز بکەم؟ کە رۆییشتی ئیدی لە کوێ بتدۆزمەوە، ئەی فریشتە چکۆلەکەم؟ ئەمە دەمکوژێت ڤارینکا گیان، بێگومان دەمرم دڵم بەرگەی ئەم عەزابە گەورەیە ناگرێت.

من وەکو رۆژی روناکی خودام خۆش دەویستی، **وەکو** کیژی خۆمم خۆشدەویستی، هەموو شتێکی تۆم خۆشدەویست، دایکەلێ، ئازیزەکەی دڵم! من لەبەر خاتری تۆ دەژیام! بۆ تۆو بە تۆوە دەژیام! کارم دەکرد،

بەلگەنامانم دەنووسینەوە، پیاسەم دەکرد، هەرچیەکم بە بیرو بە خەیاڵدا هاتبا، راستگۆیانە لە نامەدا بۆم دەنووسیت. هەر هەمووی لەبەر خاتری تۆ بوو ژێکەلەکەم، لەبەر ئەوە بوو کە نزیکم بووی، لێرە دەژیای.

رەنگە تۆ بەمەت نەزانی بێ، **بەلاّم** بەڕاستی وابوو، ئەوە حەقیقەتەکە بوو! جا گوێ بگرە فریشتەکەم، تۆزێ بیر بیکەوە کۆترەکەم، چۆن دەتوانی سەفەر بکەی و بڕۆی، چۆن دەتوانی بەجێم بێڵی و بڕۆی؟ گیانەکەم ئەمە زەحمەتە، مەحاڵە هاوڕێم، مەحاڵ، تۆ ناتوانی ئەم سەفەرە بکەی، مەحاڵە، ناتوانی... دەبێ ئەمە لە خەیاڵی خۆ دەربکەی..

تەمەشا چ بارانێکە، تۆ لاوازی، بەرگە ناگری، سەرمات دەبێت، گالیسکەکەت تەڕ دەبێ، باران دێتە ژوورەوە، هەرکە لە شار وەدەرکەوتی گالیسکەکەت سەقەت دەبێ، خراپ دەبێ، دەشکێ، دڵنیام دەشکێ. تۆ نازانی ئەو گالیسکانەی ئێستا لە پوترسبۆرگ دروست دەکرێن زۆر جڵەبی و ڕاویجن، هەر بە ناو گالیسکەن؟ من ئەو گالیسکەسازانە دەناسم، یەک بە یەکیان **دەناسم**، هۆش و بیریان لای جوانی و شیکی گالیسکەکەیە، لەوان وایە گەمەی منداڵان دروست دەکەن، ئیدی بەلایانەوە گرینگ نیە چەند ڕوختە وقوت و قایمە یان چەند شەق و شۆقە، یان چەند بەرگە دەگرێت، سوێندت بۆ دەخۆم کە بەرگەی هیچ ناگرێ و لە خۆوە دەشکێ.

من دەستەونەزەر لە بەردەم ئاغای بیکوف رادەوەستم و ئەوەی بۆ روون دەکەمەوە، بۆی دەسەلمێنم! تۆش، تۆش ڤارینکا گیان، دەبێ ئەوەی

بۆ روون بکەیتەوە، بە بەڵگەی ماقول‌و بنجبڕ بۆی بسەلمێنە کە پێویستە تۆ لێرە بمێنی‌و مەحاڵە بتوانی دەگەڵ ئەودا بڕۆی، سەفەر بکەی!...

ئاه بۆچی نەچوو ئەو کیژە بازرگانە مۆسکۆییە بخوازێ؟ دەبوایە ئەوی بخواستبایە، ئەو کیژە بازرگانە بۆ ئەو باشتر بوو. زۆر باشتر بوو. من دەزانم، زۆر چاك دەزانم بۆچی باشتر بوو! هەنگێ تۆم لێرە لەلای خۆم، لە نزیکی خۆم گل دەدایەوە. ئەم بیکۆفە بە چ کەڵکێکی تۆ دێت؟ بۆچی بەم کەفلەکونە وا لە لات شیرین بوو؟ هەر لەبەر ئەوەی گوایە بەردەوام دالبر ت بۆ دەکڕێت، رەنگە لەبەر ئەوە بووێ؟ ئاخر دالبر بەچی دەچێ، بە کەڵکی چی دێت؟

هەموو ئەوانە پەشمە ڤارینکا.. مەسەلەکە، مەسەلەی ژیانی مرۆڤێکە ڤارینکا! دالبرو گوڵدۆزی پارچە پەڕۆیەکەو هیچی تر، خۆ منیش دالبرت بۆ دەکڕم، هەرکە موچەم وەرگرت بۆتی دەکڕم. بەڵێ، بەڵێ، با مووچەکەم وەربگرم بزانە چۆنت بۆ دەکڕم، سەبرۆکەیەکم لێ بگرە ڤارینکا، ئەی منداڵە نازەنینەکەم! من موغازەکەی پێ دەزانم! ئاه خودایا خودایا! ئایا هەر سووری لەسەر ئەوەی دەگەڵ ئەم بیکوفەدا بۆ دەشت بڕۆیت! یانی ئەمە دوا بڕیارتە، چیتر ناگەڕێیتەوە؟

ئاه گیانەکەم ڤارینکا! نا، نا... بێگومان نامەم بۆ دەنووسیت، دەبێ نامەیەکم بۆ بنووسیت بە دوورو درێژی باسی هەموو شتێکم بۆ بکەی.. کە گەیشتیتە جێ، لەوێندەرەوە نامەم بۆ بنووسە، ئەگینا، فریشتە چکۆلەکەم، ئەمە دوا نامەی من دەبێت... نا، مەحاڵە، بۆ دوا نامە بێ؟ مەبەستم ئەمەیە کە ناکرێت ئەمە دوا نامەی من بێ، بە تایبەتی ئەم

نامەیە، وبەم کوتوپڕیو ناگەهانیە ! دوا نامەی من! نا.. نا.. نامەی تریشت بۆ دەنووسم، هەڵبەتە تۆش نامە بۆ من دەنووسیت..

ئایا هەست ناکەی کە شێوازی نووسینم خەریکە باش دەبێت؟ ئاه ئازیزەکەم، شێوازی چی؟ من گوێ بە شێواز نادەم! بە تایبەتی لەم ساتە وەختەدا وام لێهاتووە، بە خۆیشم نازانم چی دەنووسم، بەڵێ نازانم چی دەنووسم، نە بە شێوازی نووسینەکەمدا دەچمەوە، نە دەستەواژەکانی چاك دەکەمەوەو نە بڕای دەکەمو نە دووبارە دەیخوێنمەوە. تەنیا بۆ ئەوە دەنووسم کە بنووسم، کە زۆرترین کات تۆ بدوێنم.. ئاه کۆترەکەم، **کیژەکەم، ئازیزەکەم، گیانەکەم ڤارینکا...**

## ئا

- ئـەداو ئـەتوار: رەوشـت و ئاکار
- ئارایشـتکار : ئارایشـتگەر ، مکیاجکار
- ئەوك : قورگ، گەروو، بەرمل
- ئاسیو : ئـازار، بـەلآ ، زیـان، زەرەر
- ئاشـــخانە : مووبـــەق، چێشتخانە
- ئەنگۆ: ئێوە، ھەوە، ھون
- ئەگـەرنا: دەنـا، ئـەگینا، ئەگین، گەرنا
- ئێژی : دەڵێی
- ئەفسـووناوی : سـیحراوی، جادوویی
- ئـــیکلام : کڕنـــۆش، سەرچەماندن بۆ ڕێزگرتن
- ئامێز : باوەش، ھەمێز
- ئەزیەتی : گەورەم، قوبان
- ئاران: گەرمەسێر، گەرمیان، زستانەوار
- ئۆین: پیلان، دەسیسـە، فێڵ و مەکر
- ئۆینبـاز : بەمـەکرو فێڵبـان، پیلانگێڕ
- ئێشك: پاس، کێشك
- ئاکنجی: نیشتەجێ
- ئـــالوودە: گــــیرۆدە، خووپێگرتوو
- ئاوەز: ھۆش، فام، ئەقڵ
- ئاشـپەز: شـیوکەر، چێشـت لێنەر، چێشتچی
- ئـەنگێزە: ھـۆ، ھانـدەر، سۆنگە
- ئەسـتەم: زەحمـەت، ئاسـێ ، دژوار
- ئەســـەح: ئەکیـد، خویـا، مەعلووم
- ئیرەیی: حەسوودی
- ئەستێل: حەوز
- ئیستەرەم: دەمەوێ
- ئەستەڕ: بەر، بەری کەواو...
- ئــاپۆڕا: حەشــــامات، قەرەباڵغی، حەشیمەت
- ئاشووب: پەشێوی و ئاژاوە
- ئـەوزار: ئـامراز، ئـامێر، وەسیلە
- ئاغەڵ: جێـی داکردنـی مـەڕو بزن لە دەمی سەرمادا

- ئەسکەمیل: کورسی
- ئاوەز: ئەقڵ
- ئاخێز: نیوە هەستان
- ئەوقات: پارێزەر
- ئۆل: ئاین
- ئاریشە: کێشە، گرفت
- ئاودرکــە: ئــاودڕ، ئــەو شوێنەی ئاو دایدڕیبێ
- ئاڵچاخ و دەنی: سووك و بێ ئابڕوو، خوێڕی
- ئـــــــــاوردوو: سوتەمەنی،شــەواتەك،ئێزنگ وقاشکەری

## پ

- باوەژن: زڕدایك، هۆی دایك، باجی
- باب: باوك
- باڵانما: بـاڵانوێن، ئاوێنـەی باڵاڕوان
- بەلەز: خێرا، بەپەلە، گورج
- بــایس : هــۆ، بــاعیس ، سەبەب
- بلوور: شووشە
- بێنەوا: هەژار، بێچارە، داماو
- بە تۆبزی: بە زۆر، بە خورتی
- بــە روحــم : بــە بــەزەیی ، دلۆڤان
- برنجــە: جــۆرە کانزایەکــە، زەردی سەماوەر(قصدیر)
- بەلــەنگاز: بێچــارە،نەدار، بەسەزمان
- بەرۆك: یاخە، یەخە
- بەکاوەخۆ: بە هێواشی
- بەرسڤ: وەڵام
- بەرك: گیرفان، باخەڵ
- بالیفۆکـە: سـەرینی بچـووك، گۆشە
- بوری: تێپەڕی
- بیلبتون: بە تەواوەتی
- بەو ئاوایە: بـەو جۆرە، بـەو شێوەیە
- باریە: لۆسە
- بەستێن: رۆخ، کـەنار، گـوێ چەم، دەم چەم
- بێشە: دارستان، لێر
- بەرکۆشە: بەرهەڵبێنە
- بن پیاڵە: ژێر پیاڵە
- بۆرەقنە: ئامـاڵ بـۆر، مەیلـەو بۆر، بۆرباو
- بوێر : ئازا، دلێر
- بێوەی: بێ زیان، سەلامەت

- باڕ : بێچووه مەلی بەهاره
- بێزوو: بێزگ، مەگیرانی
- بێزگەوان: بێزووکەر
- بەلآنس: هاوسەنگی
- بارتەقا: باتەقا، هەنبەر، بەرانبەر
- باجەوان: باجگر
- بەسوێ: به ژان، به ئازار
- بەردەبار: پیاوی زاناو به تەگبیر
- بێدادی: نەمەقی
- بەیتاڵ: پزیشکی ئاژەلآن
- بویەر: ڕووداو
- باژێرۆك: شارۆچکه
- باشار: دەربردن، خۆراگرتن
- بەرایی: پێشایی، بەراهی
- بەلەد: شارەزا، ڕێزان، ڕێنوێن
- بەفره ژیلکە: بەفری زۆر دەنك ورد
- بەلەك: پوورز
- به خورتی :به تۆپزی
- بالیف: سەرین، پشتی
- بەگەنکردن: پەسندکردن
- باندۆر: کاریگەریی
- بایس: هۆ،باعیس، سۆنگه
- بەرخودان: مقاوەمەت
- بارخانە:کەلوپەلی بازرگانی، باری لەسەر یەك هەلچنراو
- بەرجەوەن: دیمەن
- بۆدڕ: بۆنی توندی ماسی و تەگه
- بۆدراو: برژاو، خاوەبرژ
- بەلَخ: بەلغ، کەپوو
- باسریشك: بەفرو باران پێکەوه



- پێشخزمەت: نۆکەری بەردەستان
- پارك: باخ
- پسمام : کوڕه مام، ئامۆزا
- پواز: سنگێکە له درزی داری قەلَشاوی دەنێن تا نەیەتەوه یەك
- پۆڕ: بالَندەیەکی خۆش گۆشتە، له مریشك گەورەتره
- پێشکار: خزمەتکار
- پەیڤ : وشە، وته ، قسه
- پەز: مەڕ، مێگەله مەڕ و بزن
- پەری : فریشته
- پاژ: بەش

- پرتەو: تیشك ، روناكی
- پێكڵە: پێكەوە، بە هەڤرا
- پڕ: زۆر، تەژی
- پۆستین: فەروە، كەوڵی تیسكن
- پەژمردە: چەرمسی، ژاكاو
- پایدۆس: دەست لە كار هەڵگرتن
- پۆڵكە: كاگۆز
- پەسیو: پەسیڤ، هەلأمەت
- پیتاك: باربوو، كۆكردنەوەی دارایی
- پێل: شەپۆل
- پەسلان: قیامەت، ئەو دنیا
- پاتاوە: پێڵاو، كاڵە.
- پاتۆق: شوێنی كۆبوونەوە
- پۆڕ: قژ
- پێشداوەری: حوكمی پێشوەختە
- پانكردنەوە: ماستاوساردكردنەوە، ڕووپامایی
- پەشم: قسەی قۆڕو بێ مانا
- پزیشكیار: یاریدەدەری پزیشك
- پەتۆ: بەتانی

## ت

- تەمەشاڤان: بینەر، سەیركەر
- تەماشاخانە: شانۆ، نمایشسەرا
- تەژی: پڕ، لیپاو لیپ، سەر رێژ
- تا: لا، لایەن
- تێشت: نانی بەیانی، قاوەڵتی، بەرقلیان، تاشتی
- تالووكە: مەترسی، خەتەر
- تەبارە: دەغڵی گەیشتووی نەدوراو، قایمە دەغڵ
- تەژەو ناقۆلاً: گەورەو ناشیرین
- تاین: یارۆ، فلأن، ناڤبری
- تاژی: سەگی ڕاو، تانجی
- تەشقەڵە: گەمەڕ، بیانووپێگرتن
- تەیرو تو: باڵندەو مەلان
- تەوازۆ: تەوازی، عوزرخوایی، داوای بوردن
- تخوب: سنوور، كەوشەن، تخووم
- تەوێڵ: ناوچەوان، هەنیە، ئەنی، تویڵ،جەمین

- تۆرینۆك:تووڕەو دڵناسك
- تەختەبەن: تەختە خەو
- تەقوو: بەڵکوو ،هاتوو
- تاقــەتکردن: شــاردنەوە، داکردن
- تۆلاز: مێباز، چاو لەوەڕێن
- تیلمە: تیلماسك
- تیلاگ: لاسەر
- تاوەگاز: تاوانگاز، بە هەتاو سووتاو
- تەڵفیزی: تەڵفیسی، تەوس، گاڵتەو گەپ
- تەریدە : ڕێگر ، چەتە
- توولەك: وەرینی مووی لەش
- تۆسن: سەرکێش، نا ڕام
- تەڵگــــەر: نەســـرەوت، بزووتنەوە
- تەمراندن: کوژاندنەوە
- تاری : تاریك
- تۆماکۆ : تووتن
- تەشبریق : هەورە تریشقە، بروسکە
- تووك: نزای خراپ ، دوعای شەڕ
- تاخ: گەڕەك
- تــاس: ســەر پرووتــاوە، دەغسەر
- تەرز: جۆر، نەوع

## ج

- جەگەن: گیایەکە لاسکی سێ سووچە لە زەڵکاودا دەڕوێ
- جــنگن: شــەڕانی، دڕ، نەگونجاو
- جــەلۆ: هــەرزە پیــاو، سەرسەری
- جندەخانە: سۆزانی خانە، قەحپەخانە
- جەڕباندن:تــاقی کردنــەوە، تەجرەبە کردن
- جوڕنە: حەوزۆکەی گەرماو
- جما: جولاً، بزوا
- جڤاکی: کۆمەڵایەتی
- جــوابی کــرد : دەری کــرد ، ئیزنی دا
- جمکانــە : دووانــە، جمــك، لفانە
- جەندەك: تەرم

## چ

- چەلەنگ: چوست و چالاك، گورج و گۆڵ، شۆخ و شەنگ

- چـینی: جـۆرێ سـوالەتی هەرەباشە، وەکو کاشی
- چتۆ: چۆن، چلۆن، کوو
- چڕین: وتـن ( بـۆ گـۆرانی و قام)
- چێل: مانگا
- چـــەنگ: ئـــامێرێکی موسیقایە، هارپ
- چەکمە: جەزمە، پووت
- چەمەنزار: مێرگ، مێرغوزار، سەوزەزار
- چما: بۆچی، ئەڕا، لەبەرچی
- چقڵ: دڕك، دڕو، دڕی
- چەرچی: فرۆشیاری گەڕیدە، دەستفرۆش
- چوغورد: چوغور، چغر، چڕ
- چمك: سووچ، گۆشە
- چوارنکال: هەرچوارلا
- چێبوو: دروست بوو
- چـــەمووش: ســـڵ، رەوەك، لەقەهاوێژو کازگر
- چەرموو: سپی
- چەرچی: دێوەرە،فرۆشیاری گەڕۆك، دەستفرۆش
- چاوســـاغ: دەســـکێش، جاسووس، سیخوڕ
- چەلیپا: خاچ، سەلیب
- چاوگ: دەستە چیە



- حایرمان: سەرسام بوون
- حەسار: حەوش
- حەنـــەك: جەفەنگ،قســـەی گاڵتەو گەپ
- حەشەری: بەر بەتاو، ژنی بە ئالۆش
- حەژمەت: مەینەت، خەفەت، کەسەر، داخ، خەم
- حەجامات: خوێن بەردان
- حەوجە : پێویست



- خەنی لـە خۆتـان: خۆشـی لـە خۆتان
- خشـکۆك: دەلال، جوانکیلـە، جوان، قەشەنگ
- خەنەقانـدن: خنکانـدن ، لـە سێدارەدان
- خـــوێزە: خـــولام، نۆکـــەر، خزمەتکار، خزمەتچی
- خـورجین: هەگبـەی لـە بـەن، جانتای لە بەن، خورج

- خا: خات، خاتوون، خانم، یا
- خاپانــــدن: فریــــودان، تەفرەدان، خەڵەتاندن
- خاپینۆک: فریبۆک، فێڵباز
- خانــــەدان: نــــەجیمزادە، ئەسڵزادە
- خــودان: خێــو، خــاوەن، ساحێب
- خولك: خولق
- خۆرتی: بە تۆبزی، بە زۆری
- خشت: رێك، بێ کەم و زیاد
- خاکی: بێ هەوا، بێ فیز
- خەرگە: پەڕۆی کۆن و پیس
- خوابەختـەکی: خـۆو بـەخت، بە هەڵکەوت
- خەبتین: خەبات کردن
- خشکۆك: جوان، خشیك
- خویا: ئاشکرا، دیار، روون
- خۆرانگــاز: تــاوە ســووت، سووتاو لەبەر خۆر
- خەفیـــــە :جاســــــووس، خەوەرچین، هەواڵدز
- خۆڵەکەوە: خۆڵەمێش
- خەمرە: کوپەی زۆر گەورە
- خـەنۆڵ: خەنـدەران، دەم بـە پێکەنین، ڕووخۆش
- خــزاگ:عەرەبانەیــەك کــە بەسەر بەفرا ڕایدەکێشن

د

- دامــاو: بێنــەوا، بەلــەنگاز، بێچارە
- دەڤەر: ناوچە، ئاقار، شوێن، جێ
- دێرکەوتن: دواکەوتن
- دلپاقژ: دڵپاك، بێ فڕو فێڵ، بێ گزی
- دەربار: دیوەخان و بارەگای پاشا
- دەهری : زۆر تورە
- داگەڕان: هاتنە خوارەوە
- دڵنــەواز : دڵگــیر، مایــەی دڵخۆشی
- دلۆڤان: بە بەزەیی، دڵنەرم، میرەبان
- دیـدەوانی: ئێشـکگرتن ( بـە تایبەتی ئێشکی سەر قەڵات و بورجان)
- داپیرە: دایە گەورە، نەنك
- دەلیڤە: دەرفەت ، هەل

- درەخت: دار
- دەرباریـیـــان: دەســـــت وپێوەنـــدانی دیوەخـــان و بارەگای پاشایەتی
- دڕوو: دڕك، چقڵ، دڕی
- دڵـــڕەش: بـــێ بـــەزەیی، ستەمکار، دڵڕەق، ڕکوونی
- دامە: مۆر
- دنـــگ: دیـــنگ، ئـــامرازی چەڵتووك کوتان
- دەڵەکدان: پاڵنان
- دڕدۆنگ: دوودڵ، بە گومان
- دوونیـــەتی: خوێڕیـــەتی، بچووکی
- دەڵەچـــە: مـــەرایی کـــەر، ماستاوچی
- دۆنکـــــی: داردەســـــتی حەسحەسی ناو بازاڕ
- دیرۆکنووس: مێژوو نووس
- دەرەڤی: هەڵەمات، رایدەکرد
- دەرۆزە: گەدایی، سواڵ
- داشۆ: کاکە، براگەورە
- دەهری : زۆر تورە
- دەخەبتن : خەبات دەکەن
- دۆغری : راست ، دروست
- داغان : رووخان، وێرانکردن
- دەغـوول: دەسـبڕ،خـاپینۆك، فێڵباز، گزیکار
- دوئێل: مبارەزە
- دۆتمام: کیژەمام، ئامۆزا (بۆ کچ)
- دەسەنە: بەخشین،
- دوڕ: ناوەند، ناوەڕاست
- دێـــر، درەنـــگ، جێگـــەی رەبەنانی فەلە
- دەست قلپ: ماڵ بەفیڕۆدەر

## ر

- رەقسین: سەما، هەڵپەڕین
- ڕنەك: قەشمەو
- ڕدێن: ریش
- رونـــدك: فرمێســـك، رونتـــك، ئەسر، ئەسرین
- رۆحانی: پیاوی ئاینی
- راز: نهێنی
- ڕەژوو: زوخاڵ ، خەڵوز
- ڕك : کووڕ، ڕژد
- رابوون: هەستان
- ڕۆخانە: روبار، چۆم، چێم، ڕوو
- ڕنـــد: جـــوان، خوشـــیك، خوشکۆك

- رمووده: ئالووده، هۆگر
- رادەست: خۆ بە دەستەوەدان
- رەند. مێرخاس، مەرد، پیاوانە
- رەقیب: نەیار، خەنیم
- ریسك: مغامەرە
- ریوەڵە: بچکۆلەی لاوان، بێ نموود
- رۆنیشت: دانیشت
- رووپامایی: مەرایی، دەلەچەیی، بن ریشەیی
- رامووسان: ماچ
- رەهەنە: رەهەندە، عەودالْ ، ئاوارە، چۆلگەڕ
- رەبەن: سەڵت، زوگورت، راهب
- رەبەنیتە: راهبە، ژنە قەڵەی تەرکە دنیا، ڕەبەنی ژن
- ڕاوگە: جێگەی ڕاو وشکار

ز

- زڕکیژ: کچی مێرد بۆ باوەژن، یان کچی ژن بۆ باوەپیارە
- زێدە: زیادە
- زەلام: گەورە، ئاقۆڵاو تەژە
- زار: دەم، دەو
- زورپیەت: وەچەو نەوەو نەتیرە
- زێد: زاگە
- زاگە: زێد، شوێنی لە دایکبوون، مەفتەن
- زوخالْ: رەژوو، خەڵووز
- زگرەش: ڕکوونی، بوغزن، کینە لە دلْ
- زەوجێن: زەماوەند
- زڤڕینەوە: گەڕانەوە
- زەیسان: زەیستان، ژنی تازە زاو
- زەیەوان: زێوان، نیگابانی گۆڕ و گۆڕستان
- زرانی: ئەژنۆ
- زارۆك : بچیکان ، مندالآن
- زەردەکەن: بزە، زەردەخەنە
- زەروو: زالو
- زیانۆك: بە زیان، زەرەردەر، زیاندەر

ژ

- ژێوان: پەشیمان
- ژارخەن: پێکەنینی ژەهراوی

- ژارۆ: داماو، فەقیر، بەسەزمان
- ژنەوتن: بیستن، ژنەفتن

س

- سەرزەنشت: سەرکۆنە، لۆمە
- سەڵت: ڕەبەن، بێ ژن و منداڵ، عازەب
- سەندەڵ: قاپقاپ، تەقتەقیلە
- سپڵە: پێنەزان، بێ ئەمەك، بێ وەفا، نمەك حەرام
- سۆز: پەیمان، بەڵێن
- ستران: گۆرانی، قام، لاوك
- ستێران: ئەستێرە، ئەستێران
- سپێدە: بەرەبەیان
- سەوزەزار: مێرگ، مێرگوزار، چەمەنزار
- سەمت: لا، ئالی، ڕەخ
- سەربوردە: بەسەرهات، سەرگوزەشتە، سەربهورد
- سەرگوروشتە: سەربوردە،
- سخێف: جنێو
- سەختگیر:توند و بەزەبت و ڕەبت
- سیوات: خوێنەواری
- سانەقڵ: شێتۆکە
- سەربۆز: سەر ماش و برنج
- سیاناو: قوڕاو
- سێوی: هەتیوو، منداڵی بێ داك و باب
- سیکتر: دەرکردن، تڕۆکردن
- سونگی: قەمە
- سەهەندە: بزۆز، نەسرەوت، زرینگ، ئاژاوەچی
- سێبەندی: بێ شەرم و حەیا،
- سابرێن: نێری، تەگە
- سەرۆ: ئیلهام، سرووش
- سازڤان: مۆزیکوان
- سەرناڤ: ناونیشان
- ستان: شار، پارێزگا
- ستاندار: پارێزگار،متەسەڕیف
- ساردخانە: مەیتخانە
- سۆل:پێڵاوی سووکەڵەی بێ پانییە ،نەعل
- سەردولکە: گۆرانی هەڵگوتن بە مردوودا
- ساڤالۆك: منداڵی تازەزاوی جوانکیلە
- سەلبەند: ڕێگەی بە بەرد فەرشکراو

- سیسەم: تەختە خەو، تەختە بەن
- سویَ: ئازار، ژان
- سیخار. زوقم
- ساقەتە: لاسکی گیا

ش

- شــرِندە: ژنــی دەمدرێــژی شەڕانی بێحەیا
- شڕپۆش: شڕۆڵە، بیَ بـەرگ و بار
- شەیپور: بۆقی، کەرەنا
- شام: شیو، شیڤ، خواردنی ئێواران
- شکەفت: ئەشکەوت
- شکەســتەنی: ناسـك، شـتیَ زوو بشکیَ
- شتاقیان، هیچیان، کەسیان
- شنگ: هێز، تاقەت، توانا
- شەقاو: هەنگاو
- شلینگ: پارەیەکە
- شاپ: شەق
- شەکەت: ماندوو، هیلاك
- شووورە: دیوار
- شەڕبار: پڕشەڕ، شەڕانی
- شـەنگولَ: بە دەمـاخ، کـەیف خۆش
- شـــەبەیخوون: پـــەلامارو هێرشی شەوانە
- شەلاق: شەلاخ، قامچی
- شەم: مۆم، شەمالك
- شـەمدان: مۆمـدان، شـەمان، جێگەی مۆم
- شـۆڤار:زمـان شـڕ، نێــوان تێکدەر، جاسووس
- شوو: مێرد ، هاوسەری ژن
- شەکەت: ماندوو. هیلاك
- شاشك: مێزەر، پێچی مێزەر، شاشیك
- شیرەت: راوێژ، ئامۆژگاری
- شیرەتکار: راوێژکار
- شــــادەتنامە: کارنامـــــەی خوێندن
- شۆخی : سوعبەت ، گاڵتە
- شـیڤ: شـێو، شـام، نـانی شێوان، نانی ئێوارە
- شێلەو بێلە: فێلَ و تەڵەکە
- شەواك: کەمزە، کێلۆکە



- عاسا: دار عاسا، داردەست
- عەیار: زیتەڵ، زۆرزان

- عەبەنووس: دارێکی رەش و رەق و بەنرخە
- عـەیان: دیـار، ئاشـکرا، لەبەرچاو
- عەگید: ئازا، پاڵەوان، جامێر

غ

- غارِ: ئەشکەوت
- غورابی خـەو: شـیرنە خـەو، خەوی قورس
- غەوارە: غەریبە، بێگانە
- ف:
- فەرمایشت: فەرموودە، قسە
- فەرخـە: بێچـوە مـەل و جانەوەران
- فشـقیات: حەنـەك، گاڵتەوگـەپ، ئاخـافتنی بـێ تام
- فراقین: نیـوەرۆژە، خـواردنی نێوەرۆ
- فەرسەخ: فەرسەق
- فرنـاخ: لـووت بـەرز، بـە دەعیە، روحزل
- فامـا: فامیدە، تێگەییشتوو، زیرەك
- فـالا: بـەتاڵ، خـاڵی، پـووك، ئاوالە، کراوە
- فەرەنگی: ئەورووپایی

ق

- قالیچە: مافووری بچووك
- قرمز: سوور
- قەڕاڵ: پاشا
- قەڕاڵنشـین: پاشانشـین، ئیمپراتۆریەت
- قورباقە: بۆق
- قـاوەڵتی: تاشـتی، بـەرقلیان، نـانی بـەیانی، تێشـت، قاوەتوون
- قوورچانی: هەڵهات
- قشتیلە: بچووکی جوانکیلە
- قالۆر: قاورغ
- قاپ: قاچ
- قاورغ: قەپێلك، قاپۆرە
- قوشقی: تـوورە، وەرەز، سڵ ، رەوەك
- قەرقەشـە: تەشـقەڵە، شـەرو ناخۆشی
- قۆپی: زەلکاوی قامیشەلان
- قەڵـەمرەو: سـنوور و کەوشـەنی ژێـر دەسـەڵاتی کەسێك یان دەوڵەتێك

- قوو: باڵندەیەکە لە قاز سپی ترو زلترە
- قـەلأیی:کانزایـەکی سـپی نەرمـە مسـی پـێ سـپی دەکەنەوە
- قژاوڵە: تاق تاقکەرە
- قـاوش: هـۆڵ، شـوێنی نووستنی بە کۆمەڵ
- قەساس: سزا، تۆڵە
- قەرەبـەخت: بـەخت رەش، بەدبەخت، نەگبەت
- قامـك: پەنجـە، ئەنگوسـت، پل، کلك
- قامبێژ: گۆرانی بێژ
- قەساو: قەساب
- قەلەزراو: ترسنۆك
- قەتاندن: بەسەربردن
- قاقڕ:زەوی رووتـەن کە گیای لێ نەڕوێ
- قومـات:بابۆڵـەی سـاوا تێـوە پێچان
- قاشوانێ: گۆبازی، قاشوان
- قەپاتمـە: سـۆیتەل، ژنـی بـێ مارەیی بۆ رابواردن
- قەموور: کووڕ، پشت کۆم
- قەسـتە سـەر: دوژمنـی زۆر سەرسەخت، خەتەر
- قەبە : گەورە
- قۆشەن: لەشکر
- قرێر: بڕیار، قەرار
- قەرماو: بویەر، رووداو
- قـاوەتوون: تاشـت، تێشـت، قاوەڵتی، نانی بەیانی
- قیرات: گەرماپێو
- قرێـــژە بـــەرد: خەنـــە تیلکە،وردە شینایی پێکەوە نووساوی سەر بەردان

## گ

- کوت ومت: ەقاودەق
- کوانگە: کوانوو، ئاگردان
- کارمامز: بەچکە ئاسك
- کودەڵە: بێچووە بەراز
- کوختـە: کـۆخ، خـانووی چکۆلەو خراپ
- کوڵکە: موو، توك
- کولۆ: کوللە
- کەچـڕەوی: لـە ڕێ لادان، تەحریفیەت
- کـەوەیی: شـینکی، شـینباو، خۆڵەمێشی

- کێوە: بۆ کوێ
- کەپەك: سۆس
- کۆمەك: یارمەتی، هاریکاری
- کلۆر: ناوبەتاڵ
- کوریژگە: کوڕی بچووك
- کەپوو: لووت، دفن
- کەونارا: زۆرکۆن، شوێنەوار
- کەسك: سەوز
- کۆمیدی: پێکەنیناوی
- کامکردن: نەوس تکان
- کەزی: پرچ، زلف
- کلاوخود: کلاوی ئاسنینی شەڕڤان
- کەرب: رق و کینە
- کان: مەعدەن
- کێوستان: کۆسار، کۆجاڕ
- کۆلۆنی: موهاجیرنشین، نشیمەن، موستەعمەرە
- کەمدوو: کەم قسە
- کۆسار: کۆجاڕ، کێوستان
- کەوی: ماڵی، دەستەمۆ
- کەڤر: بەرد
- کەڤرۆك: بەردەلآن
- کەندەکار: کەسێك کە لە دار نەخش دەکەنێ
- کێشکچی: پاسەوان، نیگابان
- کۆ: سڵ، سڵکردنەوە
- کەپوو: لووت، دفن
- کارگە: وەرشە
- کەرپووچ: خشتی سوورەوەکراو
- کوند: بوەکوێرە، کوندەپەپوو، بایەقوش
- کەودەن: گەوج
- کاژستان: بێشەی دارکاژان
- کرێت: ناشیرین، کاری خراپ
- کەتواری: ریالیستی، واقیعی
- کەوشەن: مەرز، سنوور، ئاقار، تخووب
- کنوکۆ: چوونە بنج و بناوان، تۆژینەوە
- کسۆك: سەگ
- کەستەك: سندە گوڵ، کڵۆ قوڕی وشکەوە بوو
- کۆشیار: چالاك، پڕکۆشش
- کینەکێش: ڕك هەڵگر، ڕکونی
- کەت: تەختەخەو
- کەرەمکە: بفەرموو

- کەوە ڕۆژ: ڕۆژی بێ هەتاو، سپییە ڕۆژ
- کۆما: کۆمەڵێك

## گ

- گۆساخ: چاوقایم، ڕووقایم
- گەدا: پارسەك، سواڵکەر، دەرۆزەکەر
- گورزە: باقەی گەورە
- گەرەکمە: دەمەوێ، دەخوازم
- گەمە: یاری، وازی، کایە
- گەنج: زێرو زیو،ماڵی دنیا
- گەردنبەند: ملوانکە
- گازکردن: بانگکردن
- گۆڕین: یارۆ، ناڤبری
- گوند: دێ، ئاوایی
- گومناو: ناوبزر، نەناسراو
- گۆزینگ : قولەپێ
- گەلۆز: ناولینگ
- گول: گەڕ و گول
- گاگۆز: پۆلکە
- گارد: پاسەوانی تایبەت
- گۆنگ : ئالۆز
- گەنگەشە: موناقەشە
- گووراو : مەخلووق
- گووفەك: زیلدان، سەرانگوێلك
- گازی: بانگکردن
- گڕۆز: وڕکن
- گلکۆ: گۆڕ، ئارامگە
- گمێز: پیشاو

## ل

- لە کەیفان: لە خۆشیان
- لە بیلادەوە: لە ئیجادەوە، لە بنەڕەتەوە
- لیرەوار: دارستان، جەنگەڵ، بێشەلان
- لاپرەسەن: فزوڵ، فزوڵی
- لۆسە: باری
- لەزگ بوو: خەریك بوو، وەخت بوو
- لێ: بەلام
- لێبڕا: بڕیاری دا
- لۆسە: باریە
- لاق: قاچ، لنگ
- لەزکرن: خێراکردن، پەلەکردن
- لایدە: بێگانە
- لەهەنبەر: بەرانبەر
- لێ : بەلام

- لەیستۆک : بووکەشووشە، بووکەڵە
- لەگەز : مەتەڵ
- لەش بەبار: نەخۆش
- لەگین:رەنگە، لەوەیە
- لەوتاوە : پیس بووە
- لەز : خێرا ،پەلە
- لەبڕ : یەکسەری، بەقۆنتەرات
- لاشەڕ : بێوەی، سەلامەت ، دوورە شەڕ
- لاکەوە : لاچۆ ، برۆ کەنار
- لە نک: لە کن، لە جەم، لە دەف، لەلا
- لەگام: چەورە، زگ لەوەڕێن
- لێزگە: لێزایی، نشێو



- موغازە: فرۆشگە، دوکان
- مێریڤان: دلۆڤان، میهرەبان
- مشوور: تەگبیر، بەخەم کردن
- مژوول: سەرقاڵ، سەرگەرم
- ملْ ومۆش: ملۆمۆ، گەران و بۆنکردنی زەمین بۆ پەیداکردنی خواردن
- مۆڵ: زۆر، فرە، زەحف
- مژمژە: مەساسە
- میرغەزەب: جەلاد
- مەزرا: کێڵگە
- مقاش: ماشە
- مەگیرانی: بێزوو
- مەرزو بۆ: وڵات، نیشتمان
- مقەوا: کارتۆن
- مەنهۆڵ: زێراب
- مەزڵ: قۆناغ، جێی مەبەست
- میرەبان : دلۆڤان ، میهرەبان
-ماڵبات: خانەوادە ، بنەماڵە
- مدارا :سەبرو حەوسەڵە ، دڵڕاگرتنی دۆست و ئەحباب
- مووبەق : ئاشخانە
- موغەیری: موغاری، بوغاری، کوانووی نێو دیوار
- منجڕ :نەژنەو ،سوور لەسەر شتێک
- مسکێن : رەعییەت، بەرحوکمی ئاغا
- مەعلان : پسپۆڕ ، لێزان
- مخابن: بە داخەوە
- مراک : کەوچک ، کەچک
- مینا، میناک: وەک، وەکو

- مەخفـــەر: پۆلیســـــخانە، قەرەوڵخانە
- مادونی: مۆڵەت، ئیجازە
- مەرگی مفاجا: سەکتەی دڵ
- مەحزەر: نووسینگەی مارەو تەڵاقان
- مەژی : مێشك
- مامۆژن: ئامۆژن، ژن مام
- مراك: کەوچك، کەچك
- مافور: قالی
- مەتەرێز: مەتەرێس، سەنگەر
- مامێر: ڕەبەنیتەی بەتەمەن
- ماسێر: ڕەبەنیتەی گەنج
- متوو: هۆگر
- مرداو: قۆپی

ن

- نەزاکەت: ئەدەب، سەلاری
- نیگابان: پاسەوان
- نەیجەزار: قامیشەڵان
- نسیبەت: بەڵا، موسیبەت
- نەترە: ورە
- ناچیز: هیچ، زۆر کەم
- نـــەژاد: ڕەگـــەز، ڕەچـــەڵەك، ئەسڵ
- ناحەز: ناشیرین
- نێچیرڤان : ڕاوچی
- نشـیمەن: بارەگـا ، شـوێنی دانیشتن
- نەزاکەت : لوتف و ئەدەب
- نك : کن ،لا، جەم ، دەف
- ناڤبری : ناوبراو
- نەژنەو :نەبیست، منجڕ
- نـەمـد : لبـاد، نیوداشـت: نـە کۆن و نەتازە
- نها : ئێستا، هەنووکە، نهوو
- ناڤسالْ : میانە ساڵ
- نووکە : هەنووکە ، نهو، نها، ئیستا
- نەخاسما: بە تایبەتی
- نەسرانی: فەڵە، مەسیحی
- نابـــاب: نابـــاو، دژەبـــاو، ناپەســـــند لـــــە ڕووی کۆمەڵایەتییەوە

و

- وەمێنیْ:بمێنێتەوە
- وەکرد: کردەوە
- وەشێرت: شاردەوە
- وێنا : تەسەور
- وار: هەوار، شوێن، مەڵبەن

- واز : كــراوە، پێچـــەوانەی داخراو
- وێدەدەم: دەدەمێ
- وەقف كردن : تەرخان كردن
- وەردەوەدان : لــە جــارێ پــتر كێڵان
- وەردیان : زیندانەوان
- وەشـــانخانە: بلاوەخانـــــە، دارالنشر
- وەشــانكار: بلاوكـــەرەوە، ناشر
- وڕاوە: وڕێنە
- ودم:مومبارەكی، پیرۆزی
- وشــــــكەبار:میـــــوەی وشكەوەكراو
- وەكوژانــــدن : تەمرانـــدن، كوژاندنەوە
- وێمدە : بمدەیە
- واز: ئیشـــتیاو ئـــارەزووی خواردن
- وەزەن: ئازار
- وشــترالوك:حوشــتر خــۆرە، عاگول
- وازوازی: دەمدەمی مجێز

- هانكە هانك: هەناسە بركێ
- هــەڕگ: لكــەداری وشــكەوە بوو، چرۆچیلكەی ئاوردوو
- هـــــەڕوگیڤ: هەرەشـــــەو گورەشە
- هەڵدێر: جێگـەی زۆر بـەرزو قیت لە شاخ و كێودا
- هەزاربەهــەزار: شــاخی زۆر بەرزو عاسی
- هــەڵزنان: هەڵگـــەڕان بـــۆ سەرەوە
- هایم: سەرگەردان، وێڵ
- هەنبەر: بەرانبەر
- هەترەش: زەندەق، زراو
- هەنووكە: ئیستا، نها، نهوو
- هۆشن: بەهۆش
- هەتەر: مەودای حوكمی چاو
- هۆڵی: كێوی، وەحشی
- هۆدە: ژوور، ئۆتاغ، دیوو
- هـــزرو هــــزرین : بـــیرو بیركردنەوە
- هەیڤ : مانگ
- هەیڤەشەو: مانگە شەو
- هەدا : سەبر ، حەوسەڵە
- هەراوزەنا : هەراو هەنگامە

- هەڕەمە : تێکەڵ و پێکەڵ، گەنم ودانەوێڵەی تێکەڵکراو
- هاپۆ : مام
- هەڵەشە :لەسەر، بێ ئەقڵ
- هەرەت : تاف
- هەتوان : مەرهەم ، مەلحەم
- هەڤڕك : ملەکەر، ململانێ، ڕکبەرکێ
- هەڕوو : هەرە ، برۆ
- هەنگێ : هەینێ ، ئەوسا
- هەشتاو : پەلە ، لەز، خێرا
- هاوکوف:دوو کەسی لە یەك ئاستی کۆمەلأیەتی
- هاودەستی:هاوبەش لە کەین و بەینان
- هەیڤۆك: هەیڤك، مانگیلە، مانگی یەك شەوە
- هێورین: حەوانەوە
- هاماج: ئۆتمۆسفێر
- هەلأوێردن: جیاکرنەوە
- هاتە وەشاندن ، بلأوکرایەوە
- هزرڤان: بیرمەند، زانا
- هەنیە: تەوێڵ، ناوچەوان
- هەلاکەت: گیانەڵلأ، ناویلکە، ناوزینگ، حاڵی مردن
- هەلأژیان: ڕاکشان
- هاژۆتن: لێخوڕین



- یاڵ: تووکی سەر ملی شێرو یەکسم
- یەکهاوی: یەکجۆر، یەکدەست، بێگۆڕان
- یارۆ : فلأن
- یاتاخ : پێخەف ، نوێن
- یەختە: خەسێنراو، گون دەرهێنراو
- یونیفۆرم: جلکی فەرمی یەکچەشن

*حەمە کەریم عارف*

* کەرکووکییە و لە ساڵی ١٩٥١دا لەدایك بووە.

لە ساڵی ١٩٧٥ کۆلیژی ئەدەبیاتی بەغدای تەواو کردووە.

یەکەم بەرهەمی شیعرێکە بەناوی (هەڵبەستێکی هەتیو کەوتوو) کە لە ژمارە (١٧٠) ڕۆژنامەی هاوکاری لە ١٩٧٢/٦/٨ بڵاوبووەتەوە.

لە ساڵی ١٩٧٥ەوە بە بەردەوامی نووسین و بەرهەمی ئەدەبی بڵاو دەکاتەوە.

ڕنووسەر یان بەڕێوەبەری نووسین یان سکرتێری نووسین یان ئەندامی دەستەی نووسەرانی ئەم گۆڤار و بڵاوکراوانە بووە: گۆڤاری گزنگی نووسەرانی کەرکووك، نووسەری کوردستان، کەلتوور،نووسەری کورد، گوڵانی عەرەبی، ئاڵای ئازادی تا ژمارە ٢٢٢، گۆڤاری ئەوشەفەق.

* جگە لە ناوی خۆی، بە تایبەتی لە گۆڤاری گزنگی نووسەرانی کەرکووك،نووسەری کوردستان، کەلتوور، ڕۆژنامەی ئاڵای ئازادی تا ژ: ٢٢٢ بەناوی گۆڤەند، زنار، سیپان، پاکزاد، محەمەدی حاجی، سیروان عەلی، دیدار هەمەوەندی، هێژا، ح. ع ،هامون زێباری، با زەوان عەبدولکەریم بەرهەمی بڵاو کردووەتەوە.

*لە ساڵی ١٩٧٤ – ١٩٧٥دا پێشمەرگەی شۆڕشی ئەیلول بووە، لە هەشتاکاندا بۆ ماوەی نۆ ساڵ، بێ وابەستەگی حیزبی پێشمەرگە بووە و وەکو بەشداریەکی مەیدانی و ویژدانی لە خەباتی ڕەوای نەتەوەی کوردا شانازی پێوە دەکات و منەت بەسەر کەسدا ناکات، چونکە باوەڕی وایە کە ڕۆڵەی میللەتی مەزڵوم مەحکومە بە پێشمەرگایەتی.

لە هەشتاکانەوە تا ٢٠١٠/٨/٢٠ڕاستەوخۆ سەرپەرشتی و سەرۆکایەتی لقی کەرکووکی یەکێتیی نووسەرانی کوردی کردووە.

زۆر بەرهەم و کتێبی چاپ و بڵاو کردووەتەوە، لێ زۆربەی هەرە زۆریان، بە تایبەتی ئەوانەی لە چیادا چاپ بوون بە نوسخەی هێندە کەم بڵاوبوونەتەوە،لە نرخی نەبوو دان و هەر ئەوەندەیە کە لە فەوتان ڕزگار بوون. هەندێك لە وانە:

١- تیرۆژ، کۆ چیرۆك، چاپی یەکەم ١٩٧٩

٢- کۆچی سوور، ڕۆمان، چاپی یەکەم،١٩٨٨،چاپی سێیەم ٢٠٠٧

٣- بەیداغ، چیرۆك، چاپی یەکەم ١٩٨٨

٤- داوەتی کۆچەرییان، کۆ چیرۆك ،چاپی دووەم ٢٠٠٥

٥- لە خۆ بێگانە بوون، کۆمەڵە چیرۆك،چاپی یەکەم (١٩٩٩) دەزگای گوڵان

٦- کوچ سرخ، کۆ چیرۆك، بە فارسی، وەرگێران چاپی یەکەم ١٩٨٧ شاخ

٧- نینا، ڕۆمان، سابت ڕەحمان، چاپی یەکەم،شاخ،١٩٨٥ چاپی سێیەم ٢٠٠٥

٨- ئامۆ، رۆمان، ئەلبێر کامۆ، چاپی یەکەم، شاخ١٩٨٧چاپی چوارەم ٢٠٠٩ وەشانخانەی سایە،سلێمانی

٩- رێبەر، رۆمان، مەهدی حسێن، چاپی یەکەم (شاخ) ١٩٨٣، چاپی دووەم، ٢٠٠٧

١٠-شکست، رۆمان، ئەلکساندەر فەدلیەف، چاپی شاخ (راە کارگر)، چاپی دووەم، ٢٠٠٩ خانەی وەرگێران.

١١- هاومالەکان، رۆمان، ئەحمەد مەحمود، چاپی دووەم ٢٠٠٠ دەزگای گولان

١٢ - بێناسنامەکان، رۆمان، عەزیز نەسین، چاپی سێیەم ٢٠٠٦

١٣- قوربانی، رۆمان، هێرب میدۆ، چاپی یەکەم ٢٠٠٤ دەزگای شەفەق

١٤- دوورە ولات، رۆمان ع. قاسموف، چاپی یەکەم٢٠٠٠ دەزگای گولان

١٥- ئازادی یا مەرگ، رۆمان، کازانتزاکیس، چاپی یەکەم ٢٠٠٣ کتێبخانەی سۆران، چاپی دووەم: ٢٠٠٨.

١٦- چیرۆکەکانی سەمەدی بیهرەنگی، چاپی دووەم، ٢٠٠٤ کتێبخانەی سۆران هەولێر

١٧- ئامانجی ئەدەبیات. م. گۆرکی، چاپی شاخ ١٩٨٥.

١٨- ئەو رۆژەی کە ونبووم (کۆمەڵە چیرۆکی بیانی) چاپی یەکەم،٢٠٠٦

١٩- جێ پێ (کۆمەڵە چیرۆکی فارسی) چاپی یەکەم ٢٠٠٦،نووسەرانی کەرکوك

٢٠- زندە خەون، کۆمەڵە چیرۆك، چیخۆف،چ١،دەزگای موکریانی.

٢١- چیرۆکستان ،کۆمەڵێك دەقورەخنەی جیهانی چ١ ،٢٠٠٥،نووسەرانی کەرکوك

٢٢-دیدارو دەق و رەخنە،چ٢٠٠٥،١

٢٣-دیداری چیرۆکانی، چ٢٠٠٥،١

٢٤-ئەو بەرخەی کە بوو بە گورگ ،چ٢٠٠٨،١نووسەرانی کەرکوك

٢٥- میوان، چیرۆك،ئەلبێر کامۆ

---

٢٦- مەسەلەی کورد لە عێراقدا،عەزیز شەریف،چاپی دووەم ٢٠٠٥

٢٧- مێژووی رەگ و رەچەڵەکی کورد، ئیحسان نوری پاشا،چ١٩٩٨١،١

٢٨- کورد گەلی لە خشتەبراوی غەدر لێکراو، د. کوینتەر دیشنەر، چاپی سێیەم ٢٠٠٤

٢٩- لە مەهابادی خوێناوییەوە بۆ کەنارێن ئاراس، نەجەف قولی پسیان، چاپی یەکەم ٢٠٠٦

٣٠- کورد لە سەدەی نۆزدەوبیستەمدا،کریس کۆچرا،چاپی چوارەم ٢٠٠٧

٣١ -کورد لە ئینسکلۆپیدیای ئیسلامدا،چاپی یەکەم ١٩٩٨

٣٢- چینی کۆن، چ١(     )دەزگای موکریانی

---

٣٣- دلێریی خۆراگرتن، ئەشرەفی دەهقانی

٣٤- خەباتی چەکداری هەم تاکتیکە هەم ستراتیژ، مەسعودی ئەحمەد زادە

---

٣٥- ڤنسنت ڤان گوگ، شانۆنامە، پاول ئایزلەر
٣٦- بە دوی شاعیرەکان، شانۆنامە، جەلیل قەیسی (گزنگ ژ:١٢)
٣٧- جولەکەکـــــەی مالتـــــا، شانۆنامە،کریستۆفەر مالرۆ.
٣٨- دادپەروەران، شانۆنامە، ئەلبیر کامۆ
٣٩- بەد حالی بوون، شانۆنامە، ئەلبیر کامۆ.
٤٠- چاو بە چاو، شانۆنامە، گەوهەر مراد (غولام حسەینی ساعیدی)
٤١- ریچـــاردی ســـێیەم، شـــانۆنامە، شەکسپیر.چاپی یەکەم ٢٠٠٩، بلاوەخانەی سایە، سلێمانی
٤٢- گەمەی پاشا و وەزیر، شانۆنامە، عەبدوللائەلبوسێری..

٤٣- منداڵە دلرینـە، چیرۆکی درێژ بۆ منداڵان.
٤٤- فاشیزم چییە؟ کۆمەڵە چیرۆك بۆ منداڵان، یەلماز گونای
٤٥- شوانە بچکۆلەکە، چیرۆکێکی درێژی چینی یە بۆ منداڵان
٤٦- زارۆکستان (چـوار شـانۆنامە بـۆ منالان)
٤٧- چەند چیرۆکێك لە ئەفسانەی یونانی کۆنەوە (٢٣ئەفسانە)

٤٨- لــــە گەنجینــــەی حیکایــــەتی تورکمانییــــەوە. (ئەفسـانەی ئەسـپی ئاشق)چاپی یەکەم٢٠٠٨

٤٩- ئەفسانەێن گریکی و رۆمانی، چاپی یەکەم (٢٠٠٤) کتێبخانەی سۆران، هەولێر
٥٠- ئیلیـادە، هـۆمیرۆس، چ١،دەزگـای سەردەم ٢٠٠٩

٥١- کۆڵەند و زنار (فەرهـەنگی فارسـی - کوردی) حەمـە کـەریم عارف، چ١(٢٠٠٦-٢٠٠٨)دەزگای موکریانی
٥٢-چـۆنیەتی فێربـوونی زمـانی فارسـی، چ١، ٢٠٠١

٥٣- چرنیشفسـکی، فەیلەسـوف و زانـای گەورەی میللەتی روس
٥٤- چایکۆ فسکی، ژیان و بەرهەمی.
٥٥- ئیدگار ئالین پۆ، ژیان و بەرهەمی.
٥٦- جاك لەندەن، ژیان و بەرهەمی
٥٧- گوگول، نووسەری ریالیست
٥٨- یەلماز گونای، ژیان و بەرهەمی
٥٩- سادقی هیدایەت، ژیان و بەرهەمی
٦٠- خـافروغ لـە شـیعر دەدوێ؛ ژیـان و بەرهەمی

٦١- راگەیاندن لە پەروەردەی دەسەڵاتدا (بە شـەریکی) چـاپی یەکـەم (٢٠٠١) دەزگـای گولان
٦٢-راگەیاندن لە نێوان حەقیقەت بێژی و عــەوام خەڵـــەتێنی دا، حەمـــە کـــەریم عارف،چ(١)،٢٠٠٥

٦٣- مێـژووی ئـەدەبیاتی جیهـان (لـە کۆنـەوە تـا سـەدەکانی نـاڤین).چـاپی یەکەم٢٠٠٨

٦٤- مێــژووی ئــەدەبیاتی جیهــان (لــە سەردەمی رینیسانسەوە تا ئێستا).چاپی یەکەم٢٠٠٨

٦٥- مێـــژووی ئـــەدەبیاتی جیهـــان (ئـەدەبیاتی ئینگلیـزی زمـان- ئـەمریکاو ئینگلیستان لە سەرەتاوە تا ئێستا).چاپی یەکەم٢٠٠٨

٦٦- ریـــالیزمودژە ریـــالیزم لـــە ئەدەبیاتدا،ســـــــــــــــیروس پرهام،چ١،٢٠٠٤،دەزگای سپیریز

٦٧- قوتابخانـە ئەدەبییـەکان،رەزا سـەید حسەینی، چ١،٢٠٠٦دەزگای موکریانی

٦٨- مێژووی ئەدەبیاتی روسی، سەعیدی نەفیسی

٦٩- لێکدانەوەیـەك لەمـەڕ نـامۆ ، لـویس ریی ،چ٢، ٢٠٠٦

٧٠- هونەروژیانی کۆمەڵایەتی، بلیخانۆف، چ١(٢٠٠٥)دەزگای موکریانی

٧١- گوزارشـتی مۆسـیقا،د. فـواد زکریـا، چ١،یانەی قەڵەم ٢٠٠٦

٧٢- رێبازە هونەرییەکانی جیهان

٧٣- پێکهاتــەی بــەدەنی و چارەنووســی ئافرەت،(چ١) ٢٠٠٦

٧٤- دەربــارەی شیعروشــاعیری، حەمــە کەریم عارف، چ١،٢٠٠٧

٧٥- دەربـــــارەی رۆمـــــانو چـــــیرۆك، حەمەکەریم عارف،چ١، ٢٠٠٨

٧٦- مــەرگی نووســەرو چــەند باســێکی دیکــەی ئــەدەبی-رۆشــنبیری،حەمەکەریم عارف،چ١، ٢٠٠٥نووسەرانی کەرکوك

٧٧- نــاودارانی ئــەدەب، حەمــە کــەریم عارف، (چ١) دەزگای موکریانی،٢٠٠٩

٧٨- پەیڤســتانی مــن، حەمــە کــەریم عارف،چاپی یەکەم()

٧٩- پەلکــە رەنگینــە، حەمــە کــەریم عارف،چ١، ٢٠٠٤

٨٠- خیانەتی حەلاڵ، حەمە کەریم عارف

٨١-بووکی هەزار زاوا، کۆچیرۆك، بزورگی عەلەوی

٨٢-ئەبوزەر، د.عەلی شەریعەتی

٨٣-ریوایەت، رۆمان، بزورگی عەلەوی

٨٤-وقفـات ل رحـاب الثقافـە الکوردیـە، حەمە کەریم عارف

٨٥-هەژاران، رۆمان، دوستوفسکی

٨٦-دەیڤد کۆپەرفیلد، (رۆمانی کورتکراوە بۆ نەوجەوانان) چارلس دیکنز

٨٧-ئۆدیسە، داستان، هۆمیرۆس

* لە راپەڕینەوە تا ئێستا نهوو چالاکانە بەشداری بزاڤی ئەدەبی و رۆشنبیریی کوردی دەکات وبەرهەمی هەمـە جـۆر (نووسـین و ئامـادە کردن و وەرگێڕان) بلاودەکاتەوە..

* ئەو بەرهەمانە و زۆری دیکـەی ئامـادەن بـۆ چـاپ و چـاپکردنەوە و هـەر کـەس و گـروپ و لایـەن و دەزگایـەك تـەماحی بـلاو کردنەوەی هەبن، دەبێ پـرس بـە نووسـەر بکات...